ڕۆمان

# ئەو
# خۆشەویستەی
# لە هەڵەبجەوە
# دێت



سۆزان سامانجی

و: ئەردەڵان گۆران





وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان بەڕێوەبەرایەتی
گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

## • ئەو خۆشەویستەی لە هەڵەبجەوە دێت


• نووسینی: سۆزان سامانجی

• وەرگێڕانی لە تورکییەوە: ئەردەڵان گۆران

• نەخشەسازی ناوەوە: ڕێدار جەعفەر

• بەرگ: وریا بوداغی

• نرخ: (٣٠٠٠) دینار

• چاپی یەکەم: ٢٠١١

• تیراژ: ١٠٠٠ دانە

• چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان

• لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٦٧٦) ساڵی(٢٠١١)ی پێ دراوە.

زنجیرەی کتێب (٥٢٠)

ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی
رۆشنبیری لەسەر ئەم ماڵپەڕە بخوێنەوە
www .Kurdchap.com

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ئەو خۆشەویستەی لە هەڵەبجەوە دێت

سۆزان سامانجی لە ڕێکەوتی ٢٠ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦٢ لە شاری دیاربەکر لە دایک بووە. ڕۆمانی (شەو دەتاوێتەوە و دەڕوات) لە ساڵی ١٩٩١ لە ڕێگای وەشانخانەی ڕۆژنامەی ئەدەبیاتەوە بڵاوکردووەتەوە. ڕۆمانی (هێلین بۆنی ڕەچینە (سنۆبەر) دەدات) لە ساڵی ١٩٩٣ لە ڕێگای وەشانخانەی جانەوە و ڕۆمانی (چیاکانی قراچ بەرفیان گرت) لە ساڵی ١٩٩٦ لە لایەن وەشانخانەی جانەوە بڵاوکردووەتەوە. ئەم ڕۆمانە خەڵاتی دووەمینی چیرۆکی ئۆرهان کەمالی پێ بەخشراوە. ڕۆمانی (لە سێبەری بێدەنگیدا) لە ڕێگای وەشانخەی ئیلەتیشمەوە لە ساڵی ٢٠٠١ بڵاو کردووەتەوە و لە دوای ئەم چەند ڕۆمانە، ڕۆمانی (لە ڕووباری ترسدا)لە ساڵی ٢٠٠٤ لە ڕێگای وەشانخانەی مەتیسەوە بڵاوکردووتەوە.

ڕۆمانی هێلین بۆنی ڕەچینە (سنەوبەر) ی دەدات وەرگێڕی زمانەکانی ئەڵمانی، فلامانجی، ئەسپانیوڵی، ئیتالی و سوئیسی کراوە، و ڕۆمانی چیاکانی قراچ بەرفیان گرت وەرگێڕی زمانی ئەڵمانی کراوە. ڕۆمانی (شاری پەرییە)کانیشی لەو پێشبڕکێیەی، کە لە لایەن ڕادیۆی دەنگەوە سازدرابوو لە نێوان ٨٣١ بەرهەمدا لە نێو یەکەمین ٢٥ بەرهەمی یەکەمدا شوێنی خۆی کردووەتەوە و بۆیە لە نێو ئانتۆلۆژی ئەڵمانی و تورکیشدا جێگایەکی پڕ بایەخی بە دەستەوە هێناوە.

دواتر ڕۆمانی هێلێن بۆنی ڕەچینەی دەدات و شاری مردن بە زمانی کرمانجی سەرەوە لە لایەن وەشانخانەی ئەڤێستاوە بڵاودەکرێتەوە و ڕۆمانی لە سێبەری

بێدەنگیدا لە لایەن وەشانخانەی ئارامەوە بە کرمانجی بڵاوکراوەتەوە. چەندین بەرهەمی سۆزان سامانجی وەرگێڕی زمانی ئینگلیزی، ئەسپانیوڵی، فرەنسی، ئەڵمانی، عەرەبی و سۆرانی کراونەتەوە. لە ساڵی ١٩٩٥ بە دواوە تا ئێستا لە رۆژنامەکانی دیموکراسی، گۆندەم و ئۆزگوور پۆلیتیکادا کاری نووسینی بەردەوام کردووە و ئێستایش یەکێکە لە نووسەرە بە تواناکانی رۆژنامەی تەرەف.

ssamanci@superonline.com

# لە وەرگێڕەوە

ئەم بەرهەمە چیرۆکی ژیانی کچێکی هەڵەبجەی شەهید بە ناوی دەلیلایە، نووسەر هەر چەندە، کە خۆی کوردی باکووری کوردستانە، زۆر بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش چیرۆکی ژیانی دەلیلای لە کاتی کیمیابارانی هەڵەبجە لە لایەن رژێمی گۆڕبەگۆڕ کراوی بەعسەوە تا رووخاندنی ئەو رژێمە دەڕەندەیە و ئازاد کردنی عێراق زۆر بە وردبینییەوە و هاوکات لەگەڵ هەڵسەنگاندن و رادەربڕینی ئێش و ئازارەکانی گەلی کورد و بە تێکەڵ کردنی ئێش و ئازارەکانی تاك و کۆمەڵگەی کوردەواری، هەوڵی داوە کە گۆشەیەکی گچکەی ئەو زوڵم و زۆرداریانەی، کە لە سەر کورددا بە گشتی پەیڕەو کراون بخاتە روو.

باس کردنی ئێش و ئازارەکانی کورد لە باشووری کوردستان و هاوکات خستنە رووی هەمان کێشە و ئێش و ئازارانە لە باکووری کوردستانیشدا گرنگییەکی زۆر تایبەتی بەم بەرهەمە بەخشیوە. ئەوەی کە جێی سەرنجە ئەوەیە کاتێك کورد لە باشووری کوردستاندا لە لایەن شۆڤینە رەگەز پەرەستەکانەوە رووبەڕووی دڕەندانەترین و ناشیاوترین و سەختترین رەشەکوژی و ئەشکەنجە دەبێتەوە، بە هەمان شێوەش کورد لە باکووری کوردستاندا رووبەڕووی هەمان ئەشکەنجە و رەشە کوژی دەبێتەوە ونووسەریش لەم رۆمانەدا زۆر بە شێوەیەکی لێهاتوو و شارەزایانە ئەو ئێش و ئازارانەی تێکەڵی یەکتر کردووە و ئەوەی سەلماندووە کە کورد لە هەر کوێ بێت خاوەن یەك چارەنووسی هاوبەش و خاوەن یەك دەرد و ئازاری هاوبەشە.

لە نێو ئەم بەرهەمەدا دەلیلا یەکێکە لە هاووڵاتییانی هەڵەبجەی شەهید، کە لە کاتی کیمیاباراندا، دایك و باوك و براکەی لە دەست دەدات و دواتر لەگەڵ جەماوەر و خزمەکانیدا روودەکەنە سەر سنوورەکان و لەوێش کاتێك کە بە ئاستەنگی و پاڵەپەستۆی سەربازانی وڵاتانی

دەراوسێ ڕووبەڕوو دەبنەوە، ژنێکی کوردی باکووری کوردستان بە ناوی زەینەب دێت و دەلیلا لەگەڵ خۆیدا دەبات و دەلیلا گەورە دەکات. دواتر دەلیلا هەر لە کاتی خوێندنی قوتابخانەدا، دەستی بە چالاکی سیاسی و پاراستنی مافی ژنان کردووە. دوای کۆتایی هاتنی قۆناخی خوێندن لە ئەستەنبووڵەوە بەرەو ئەورووپا کۆچ دەکات و لە وێش وەکو مامۆستای زانکۆ بۆ ماوەیەك سەرقاڵی وانە وتنەوە دەبێت و لەگەڵ کوردێکی دەرسیمی باکووری کوردستان ژیانی هاوسەری پێك دەهێنێت و ماوەیەك لە دوای گیان لە دەستدانی زەینەب، دەلیلاش دەگەڕێتەوە بۆ هەڵەبجە و لەوێ دەست بە خزمەت کردنی هاووڵاتییان و نیشتمان دەکات.

هەر چەندە ئەم بەرهەمە لە لایەکەوە دەبێتە هۆی زیندووکردنەوەی زۆر لە بیرەوەرییە تەڵخەکانی ئەو سەردەمانە لە نێو مێشکی مرۆڤ دا، بەڵام بە ڕاستیش کە خوێندنەوەی ئەم بەرهەمە ئارامکەرەوەی ئەو ڕووحانەیە، کە هێشتاکە بە دەست ئەو هەموو ناحەقی و نایەکسانی و نامرۆڤایەتیدا زامدارن و بە دوای سارێژکردنی زامەکانیاندا دەگەڕێن. هیوادارم ئەم بەرهەمە و وەرگێڕانی ئەم بەرهەمە ببێتە مەرهەمێك بۆ زامی ئەو ڕووحانە و هاوکات وەکو لاپەڕەیەکی ڕەشیش لە مێژووی داگیرکەرانی کوردستاندا بمێنێتەوە تا ئەو کەسانەی کە وەکو سەدامی گۆڕبەگۆڕ زوڵمیان لە کورد و کوردستان کردووە بگەنە سزای خۆیان، بۆیە ئەم بەرهەمە پێشکێشە بە هەڵەبجەی شەهید، هەر هەمووی شەهیدانی ڕێگای ئازادی کورد و کوردستان، ئەو دایك و باوکانە کە منداڵانی خۆیانیان لە پێناو ئازادی کورد و کوردستان قوربانی کردووە، ئەو منداڵانەی کە باوك و داکیان بۆ مافی ڕەوای گەلەکەیان گیانی خۆیان بەخت کردووە، ئەنفال کراوەکانی بارزان، گەرمیان، دەرسیم، زیلان، مەهاباد و عامووودێ و هەر هەمووی ئەو کوردانەی کە بە هۆی کوردبوونیانەوە ڕووبەڕووی ئەشکەنجە و ئازار بوونەتەوە لە لایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە.

ئەردەڵان گۆران

بۆ ئەیلوول و سیسەم

"چی دیکە سەیری هیچ نەخشەیەك ناکەم. ناوی شارەکان بۆنی گۆشتی سووتاو دەدەن"

ئەلیاس جەنەتی

ئەو کاتە هەتاویش راستییەکانی قووت دابوو. باڵەفڕەکان خوداوەندێکی بێ رەحم بوون. سەرەتا دوومانێك هەڵسا، کاتێك کە هاڕە کەهرییارەکان بەرفراوان بوون چاوەکانمان دەستیان بە سووتان کرد و جەستەمان ئاگری تێبەر بوو. هەرهەمووی شوێنەکان تلفەیان دەبری. لە ژێر بارانی خەردەڵدا وەکو جەڵەبێك ئاژەڵی سەربەرەڵابوون. کەوتینە نێو خەوێکی قووڵەوە. هاوارە پچڕاوەکان، نەعرە نەعر و بێدەنگی.....

برسی و تینوو پێمان لە سەر مردووەکاندا ناو بەرەو سنوور بەرێ کەوتین.....ماڵەکانی بناری چیاکان هەر وەکو لکە بێ کۆتاییەکانی ئێش و ئازار لە نێو تاریکیدا بوون. لە باوەشماندا ئەو ترسەی کە پێمانەوە چەسپابوو لەگەڵ خۆماندا دەبرد. چیاکان بێدەنگ بوون، بەردەکان بە هەزاران راز و نهێنییان لە نێو خۆیاندا هەڵگرتبوو، گیاکانیش هەر بەجۆرە بوون. ئاپوورا و کۆم بوونی باڵندە مردووەکان لە کەراخی رووباری دیجلە و فورات...... ئەو شتانە کە روویان دابوو وەحشەت بوون و هیچ کەس نەیدەویست بیان بیستێت.....

شریتێك (مەبەست تەنافە. وە) گۆشت بوون لە نێو رێگا قۆڕییەکاندا، برینەکانمان هەر دەچووقووڵتردەبوون لەگەڵ پەتای سەفرای فرمێسکەکانمان، قژەکانمان دەرژانە نێو پەنجەکانمانەوە، ئایا ئەو شتەی کە دەیانگوت جەهەنەم ئەمە بوو؟

لەو بەری سنوورە ئاسنینەکانەوە رووناکی فلاشەکان دەهات. کەوتینە نێو هەیەجانی دوور پێچ بوونمان لە لایەن خۆشەویستییەکی باشییەوە، بێدەنگی شار نێو گیزە گیزی چادرەکاندا بوو. ئەو حەسانەوە بێ کۆتاییەکانی شەو و دڵۆپەکانی باران..... ئەو بەستە زمانانە بوون کە لە نێو کەش و هەوایەکی نادیاردا هاتبوون. روخسارەکان و دەنگەکان هەر هەموویان بیانی بوون. کە سەیرم کرد لە دریاربەکر بوون کە لە کاتی منداڵیدا بۆ خۆم خەیاڵ و ئاواتم دادەنا. ئەو کۆڕەوە کە ببووە بابەتی گۆرانییەکان زۆر گەورە و محتەشەم بوو گەورەکانمان دەیانگوت. "ئەو شارانەی کە قەلایان هەیە هەم ئاگایان لە ئەسارەتە هەم ئاگایان لە جەسارەتە" فرتە فرتی دووربینەکانی وێنەگرتن ببوون وەکو پانتۆمی وستاکان. وەفدەکان لە نێو چاوانماندا دەیانزانی داوای هاوکاری دەکەین، بۆنی تێکەڵ کراوی شۆکلات و ڤانیلیا بەرەو روومانەوە دەهات. کاتێك کە جستە شین بووەکان و قڕگە کراوەکان لە نێو رووی چرچ بووی رووبارەکەدا هەڵدەسووڕان، شەپۆلە خرۆشانە بێ پایانەکانی رووبار تێکەڵی رژە خەشمینەکەی سەربازەکان دەبوو.

کاتێك کە وشەی " کیمیاباران"م بیست لە ماڵی پوورمدا بووم، ٥ رۆژی مابوو بۆ نەورۆز، هەتاو کە خەرەیکی یاری دزینی گۆشەکان لەگەڵ رەشەبادا بوو، رەشەباش بە هۆی لەگەڵ خۆی

بردنی سڕ و نهێنییەکان ماندوو ببوو. هاوارە بەرز بووەکانی پشیلەکانی کەرناڤ دەیانەوەیست لە جیاتی بۆنی نەرکز مەشامان پڕ بکەن و ئێمەیش بێدەنگ دەبووین.......

باوکم زۆر حەساس بوو و لە بەرانبەر زۆربەی شتەکان حەساسییەتی هەبوو، ئەوەندە جوان و کەڵەگەت بوو کە کچەکان لە دەر دەوری دەسووڕانەوە. زۆر بە هێز بوو. دایکم دەیگوت رەگی کاوە لە نێو لەشیدا هەیە. باوکم لە نێو ژێرزەوییە تەمگرتووەکەدا کە مشکەکان هاتووچۆیان دەکرد بە غروور و تەکەبورەوە سەیری باخچەکەی دەکرد. کاتێك کە بە ترس و لەرز و دەست لە نێو دەست و دەست بە قاچ کاتژمێرەکانمان تێپەڕ دەکردن و دەچووینە نێو زەمانەوە، چەندە بیرمان لە مەرگ دەکردەوە. دەمانەوەیست باوەڕ بکەین کە لە نێو خەودان.

لە هەر شوێنێك زەردە زەعفەران هەڵدەڕژایەوە. تۆکەکان لە نێو ئەندامە دەروونییەکانی جەستەمدا هار ببوون. دەمەویست هاوار و ناڵەکانم بخەمە نێو دەستمەوە. لە نێو ژێرزەوییە تەم گرتووەکەدا لە سەر خۆم چووم. کاتێك کە بە هۆش هاتمەوە خۆم لە نێو ئاپۆڕایەکی مەحشەریدا دیت. ناوی دایك، باوك و برا گەورەکەی خۆم ژمارد. داخۆ ئەوانیش لەو کەسانە بوون کە لە دواوە مابوون؟ نەگریام، مردنیش ئاسان نەبوو، وام دەزانی هاوار و ئۆفە ئۆفمە وکو ئەوەی کە بە خەودا بچی..... سەیری شەپۆلە خرۆشانەکانی رووبارم دەکرد و دەمەویست هەر شت لە بیر بەرم، بە هەستی ئەوەی کە مردوونە، بەڵام خۆڕاگری دەکەین کەوتینە رێ، رێگا ماندوو کەر و بێ رەحم بوو. تروسکاییەکان دەکەوتنە نێو چاوی ئەوانەی کە لە دواوە بوون. زۆر بیرم لەو بەری کەراخەکانی رووبارەکم دەکرد. سووڕانەوە لە نێو شار بۆمان قەدەغە کرابوو. سەرۆکی گرووپەکان تەنیا لە چەند کاتژمێری دیاریکراودا دەیانتوانی برۆنە دەرەوەی کەمپەکان. بێ خانەوادەیی و بێ ماڵبەتی چەندە بێکارییەکی زۆر گەورە بوو. کاتێك کە چادرە تەم گرتووەکان و بۆنی خاك راستییەکانیان لە نێو مێشکمدا دەکوڵاند ئەو رووناکییە لەرزناکانە کە چاوی منیان دەئێشاند تەنیا و تەنیا بێکەسی من بوون. بە شەوان نەدەنووستم و گوێبیستی شەڕی رەشە باو چادرەکانم دەکرد. ئەو رەشەبا کە دەبوو بە فووت بۆ ئەوانە کە لە دواوە بوون.....
مێشکم سەرمای دەبوو و وەکو وردە کریستاڵەکان دابەشی چەندین ژمارە دەبوو. چاوەکانم هەر سەیری تەپەی سەرەوەی چادرەکانیان دەکرد. دەستم بە هەر هەمووی ئەو دوعایانە دەکرد کە دەمزانین. لە خوای گەورە دەپاڕامەوە کە خوایا من بکە قوربانی دایك، باوك و کاکم.

لە ناکاوەوە وام زانی چادرەکان روون بوونە، دایك و باوکم هاتن، یەکێکیان لە لای چەپ و ئەوی دیکەیشیان لە لای راستمەوە دانیشتن، دایکم بۆنی سابوون و باوکیشم بۆنی توتنی دەدات،

کاکەیشم لە نێو گلێنەی چاوانمدا بوو، رووە ئارەق کردووەکەی دوای یاری کردنی.... ئەو بارودۆخ و حاڵەی کە لە ژێر دارە قەیسییەکاندا تەمبووری لێدەدا... دەمەویست لەکە رووناکەکانی نێو چاوانی کۆ بکەمەوە. بێگانە بوونی چادرو باوەر کردنی من بەوەی کە قووڵایی رووبار دەتوانێ نێش و ئازارەکانم کەم بکاتەوە منی خستبوو نێو بیر کردنەوەیەکی زۆر قووڵەوە. کاتێك کە رەشەبا لە چادرەکەی دەدا دەنگی هەر وەکو شەرە پەنجە بوو. دەمەویست بخەوم و جارێکی دیکە هۆشیار نەبمەوە. بۆنی عیلاج و ئەم و ئەو دڵەی من کە وەکو باڵندەی لێهاتبوو، دەستەکانم مشت کردبوو و چۆکەکانیشم لە ژێر زکمدا کۆ کرابوونەوە و بۆ ماوەی چەندین کاتژمێر سەیری شوێنێکم دەکرد و بیرم دەکردەوە. ئەو دەنگ و رەنگانەی کە دەمەویست لە بیریان ببەم لە کاتی ئاوابوونی هەتاودا فراوانتر دەبوون. وردە وردە تاریکی شەو دەکەوتە نێو دڵمەوە و رێگای خۆمم بزر دەکرد. هەر هەموو رێگاکان بۆ لای دایك و باوك و کاکم دەرۆشتن. لە نێوان خەو و هۆشیار بووندا پەپووڵەکان باڵیان دەگرت و لە سەر قژی دایکم دادەنیشتن و لە ژێر باوەشی کاکمدا تێپەر دەبوون و خۆڵ و تۆزی ژێر لووتی باوکمیان خاوێن دەکردەوە. بۆ ماوەیەکی کورت گرتنی پەپوولەکان لە بیر دەکەم، کاتێك کە چاوە نیو خەوەکانی خۆمم دەسرِی، راستی ئەو رووداوانە کە روویان دابوو لە نێو دڵمدا دادەنیشت. بە دەنگی باڵەفرِ و بینینی باڵەفرِ لە سەر جێگای خۆم هەڵدەستام و سەیرم کرد کەهرەبارە زەردەکە دەبارێ. (مەبەست خەردەڵە. وە).

ئەو رۆژانەی کە لە نێو چادردا خۆڵەکان ببوون بە کاتژمێر، من بیری لەسەر خۆچوون و شانە کردنی قژەکانی دایکم دەکردەوە. دواتر کاکم سواری ئەسپەکەی دەبوو و هەر وەکو هەورە تریشقە تێپەرِ دەبوو و کراسە شینەکەیشی لە دواوە پرِ دەبوو لە با، باڵندەکانیش لەگەڵ ئەودا دەژیان. کاتێك کە دایکم دەستی دەخستە ژێر چەناکەی خۆیەوە و سەیری کاکمی دەکرد، باوکیشم لە ژێر سێبەری دارەکاندا تووتنی دەپێچاند و حەیرانی دەگوت. دیمەنەکانی ئەو کۆترانەی کە لە نێو باڵکۆنەکەدا تۆزی نێوان سیرەکانیان پاك دەکردەوە و سوورِە سوورِی ئەسپەکان کە دەنگی باڵندە گچکەکانی لە ناو دەبرد.... بیرم لەوە دەکردەوە کە هیچ کەس بە ئەوەندەی کاکم نا توانێ بە باشی ئەسپ لێ بخوڕێت. کاتێك کە شەپەیەکی لە لا ملی ئەسپ دەدا و ناوچاوانی ئەسپەکەی ماچ دەکرد، لە لۆتی ئەسپدا عەرەق دەهاتە خوارەوە و بە قاچی راستی خۆی زەوی دەکۆڵاند، زۆر بە هۆی حەز کردنی لە ئەسپەکە بەخێلیم لە کاکم دەبرد. وابزانم زانیبوو کە دەمەوەێ کلکی ئەسپەکەی ببرِم بۆیە دەکەنیا و دەیگوت " وەرە با پێکەوە کلکی ئەسپەکەم شانە بکەین سەیری ئەو قژانە بکە چەندە جوانن".

چادر سەرد بوو، هەر شت کاتێك کە لە بۆشایەتییەکی دووردا گەورە دەبینرا سات لە دوای سات گەورەتر دەبوو. دەنگەکان، روخسارەکان و تێڕوانینەکان هەر وەکو یەك بوون... ئێمەش زۆر وەکو یەك بووین. برینەکانم هیچ سارێژ نەدەبوون، بۆ داپۆشینی خەیاڵ و خەونەکانم شەپۆلەکانیش بەرفراوانتر دەبوون. لە بۆنی بێ بۆنیدا خەریك بوو بخنکێم و لە هیچ شتێك تام و چێژم وەرنەدەگرت. چاوە رەنگ کراوەکانی ئەو سەربازانەی کە لەگەڵ کاروانەکاندا خواردنیان بۆ ئێمە دەهێنا سەیری منیان دەکرد و دەکەنیان، هەر وەکو ساچمە دەدرەخشانەوە. کاتێك کە کەپچەکە تەپەی خاکی دەستکردی دروست دەکرد عەقڵم تێك دەچوو. کاتێك کە سەربازە بێ حەیاکانی سەدام دەکەنیان.... هەتاو لە سەرەوەی رووبار دەدرەخشایەوە. جارجار ئەو ماسییانە کە چەماوەی نۆقرەیان بە بیرم دەهێنایەوە دەردەکەوتن و منیش لە سەر خاکی نەمداردا وێنەی ماسییەکانم دەکێشا. دەمەویست کەفی سەر دەم و چاوە شین بووەکەی منداڵەکان بسڕێمەوە. کاتێك کە وەرزی گەرما دەستی پێ کرد ئاستی ئاوی رووبار زۆر دابەزی. بەردە وردەکانی کەراخی رووبار وەکو ددانی ئەو گورگانەی کە لە نیوە شەواندا دەسووڕانەوە دەدرەخشانەوە. جارێکیان بە هۆی نەخۆشی زك چوونەوە لە نێو توالێتدا شەوم رۆژ کردەوە. بەشە چادرە دڕاوەکانی خۆیان دەخستە نێو تاریکی شارەوە. کاتێك کە لە تاریکی شەودا سەیری ئەو سەربازانەم دەکرد کە نۆبەتیان دەگرت، لە نێو رووناکی مانگە شەودا سەیری ئەو شەپقانەم دەکرد کە وەکو حەڵقەی هەڵپەڕگێ دەدرەخشانەوە.

پێستم پارچە پارچە بوو، دەستەکانم هەر وەکو ئەو مارە بوون کە پێستی خۆی لە خۆ جیا دەکردەوە، قاچ و نینۆکەکانی قاچەکانم پڕ بوون لە قارچێك. (جۆرەکی ڤایرۆسێکی تایبەت بە قاچە کە دەبێتە هۆکاری عەرەق کردن و بۆن کردنی قاچەکان. وە)

ئەو دەنگە دەنگەی لە پشت چادرەکانەوە کە بە ئینگلیزی و تورکی دەکەوتە گوێم وردە وردە گەورەتر دەبوو و هاوکات لەگەڵ دەنگی دوورین و فلاشی دووربینەکان هەستم بەوە کرد کە برێك لە جەستەم لە دەروەیە. دەستە هەڵترەکاوەکانم و برینەکانم کەناڵەکانی ئاویان بە بیرم دەهێنایەوە. شتێکم خستە نێو گۆی خۆمەوە لە هاتنە ژوورەوەی ئاپۆڕا قەرەباڵغەکە دەترسام. دەمەویست باڵم هەبێت و بفڕم. رووناکی ئازاری چاوەکانی منی دەدا و منیش خۆم لە سەر جێگادا درێژ کرد. بە سەدان دەم و چاوم بینی و وتم" خوایا کینە ئەوانە؟" ژنێکی باڵابەرز و چاو قاوەیی خۆی لە لای سەرمەوە چەماندەوە. کاتێك کە من هیچ شتێك لە وتەکانیان تێنەگەیشتم ئەو کاتە ژنەکە بە ئیشارەت دووربینەکانی نیشانی مندا. فرمێسك لە چاوەکانییەوە هاتە خوارەوە و دەستی بە سەر قژمدا کێشا و پرسی" ناوت چییە؟" منیش لە وەڵامیدا وتم" دەلیلا" ئەو ژنە کە ناوی زەینەب

بوو چەند جار ناوی منی دووبارە کردەوە. دەلیلا، دەلیلا. بە هۆی ئەو هەستانەیەوە کە لە بەرانبەر من نیشانی دەدان لە رووی بێچارەگییەوە وام دەزانی کە بە ساڵانە دەیناسم. دەمەوەیست پەنا بۆ ئەو روخسارە جوانەی ببەم کە لەویەری خۆڵ و تۆزەکەی نێو چادرەکەدا کە لە کۆنەکەی چادرەکەدا لەگەڵ تیشکی هەتاودا هاتبوو ژوورەوە بەرم. هاوارم کرد و وتم" دایە". دەستەکانی خۆمم کردە مشت و تا هەناسەم هات هاوارم کرد" دەمەوەێ بمرم، دەمەوەێ بمرم". لە پاش نیوەڕوانێکی دەروون ئازاردا لە باکووری چادەرکەوە دانیشتبووم و بەو شتانەی دەستمەوە لە سەر خاك رەسم و وێنەم دەکێشا و لە سەر خۆ نەبووم، کاتێك کە هەستم بە جیابوونەوە لەگەڵ زەینەب کە لە سەر سەرم راوەستا بوو کرد، هەمووی گیانم تەڕ بوو. باوەشم بە زەینەبەوە کرد زۆر نەرم بوو. سەیری برینەکانی دەستەکان و نینۆکە کەوتووەکانی منی کرد. پاکەتێك شوکولاتی دا بە دەستمەوە. کاتێك کە تێگەیشت شەرم دەکەم پاکەتەکەی کردەوە و شوکولاتەکانی خستە نێو دەممەوە. کاتێك کە زەینەب پێ وتم" دەیەوێ ببێتە دایکی پارێزەری من" کەمی مابوو کە وەکو ئەسپەکەی کاکم دەست بە خاردان بکەم. کاتێك کە تامی خۆشی شوکولاتەکان کەوتە نێو دەممەوە بۆ چەند خولەیەك سەرم دەسووڕاندەوە. زەینەب دەستی بە سەر دەستە ترەکاوەکانی مندا دەکێشا و سەیری چاوەکانی منی دەکرد و پێی وتم" ئێمە زۆر پێویستیمان بە یەکتر هەیە". ئەو شەوە نەم توانی بخەوم. هەستێکی باش دڵی منی داگیر کردبوو. وا بیرم دەکردەوە کە نە باوك و نە دایك و نە کاکم نە مردوونە. هیوایەکی زۆر جیاواز لە نێو دڵمدا گەش دەبوو، جارجاریش تووشی دڵەڕاوکێ دەبووم و بیرم لە سەر دووبارە نەهاتنەوەی زەینەب دەکردەوە و ئێش و ئازارم دەکێشا. کاتێك کە ئەو ماشینانە کە لەو بەری رووبارەکەوە دەسووڕانەوە دەمژماردن سەرم دەسووڕایەوە، شەپۆلەکانی تەم و بارانی زەرد... و دەنگە نەرمەکانی زەینەب.... لە نێوەڕوانێکی شارەی ئاواتی منداڵیمدا کاتێك کە زەینەب وەکو رووناکییەك کەوتە نێو ئەشکەوتی تاریکی دڵمەوە و پەنجە مۆری لێ گرتم و وێنەی لێ کێشام، دەمەوەیست کە لە جیاتی دەستە ترەکاوەکانی من ئەو دەستە نەرمانەی زەینە هی من بن. کاتێك کە لە نێو کریدۆرەکانی نەخۆشخانەدا بە دوای ئەنجامدانی کارە برۆکراتیکەکاندا دەسووڕاینەوە وا هەستم دەکرد کە ئەکتەری بەناو و دەنگی فیلمێکم. بە زمانی نیوە کوردی و نیوە تورکییەکەی خۆیەوە پێی وتم" لەمەو بەدواوە لە نێو ماڵی خۆماندا دەحەسینەوە." کاتێك کە رۆیشتین بۆ ئەو شیرینی فرۆشەی کە لە نێو حەوزەکەیدا ماسییەکان یارییان دەکرد ئارەقەیەکی زۆرم کردبوو. کاتێك کە من شیرینییە سپییەکانی بەرفم دەخوارد زەینەبیش قۆرتی لە قەهوەکەی دەدا. کات لە دوای کات قژەکانی من کە دەکەوتنە سەر دەم و چاومەوە بەرەو دواوە هەڵی دەدانەوە. کە گەیشتینە بەر دەرگای ماڵەوە بە توندی دەستی

منی گرت و وتی" دەڕۆینە قاتی هەشتەم". یەکەمین جار بوو کە سواری ئاسانسۆر دەبووم، کاتێك کە خۆم بە زەینەبەوە چەسپاند وتی " مەترسە".

لە دوای ساڵانێکی دوور لە نێو ژووری نووسەرەکان ئەو ژوورە کە سەیری دۆڵی دیجلەی دەکرد ئەم نووسینانەم دەخوێندەوە و خۆم لە نێو ژوورە ڕێکوپێکەکەی خۆمدا بینی، کاتێك کە مرۆڤ پیر دەبێت، ڕابردوویش دەجووڵێتەوە، لە خۆم دەپرسی ئایا ئەو شتانە کە ڕوویان داوە تەنیا خەیاڵێك بوون؟ کاتێك کە زەمان و کات تێپەڕ دەبێت وا دەزانین کە بیرەوەرییەکانمان لە بیرچوونەتەوە. کاتێك کە دەکەوینە نێو وردەکارییەکانەوە، ئەو دەنگ و ڕەنگ و ئەو کاتو ساتانە بە بیری مرۆڤ دێنەوە. دەردی تەنیایی ئێشێکی بێ حەیایە....

کاتژمێر ٥ وچل و پێنج خوڵەکە، لە نێو ژوورەی هۆتێلەکەدا کاتێك کە دەکۆخام لە خەو هۆشیار بووم و هەستم بەوە کرد کە بەو دەنگە بەربڵاوانە ڕووداوەکانی تەمەنی منداڵیم جارێکی دیکە بە سەرمدا دێنەوە، ئەگەر نەمەوێ کە بیر لە هیچ شتێك نەکەمەوە ناتوانم. لە شوێنی خۆمدا ڕادەوەستم و گوێ دەدەمە هەر دەنگێکی گچکەیشی. کاتێك کە دەستە سڕ بووەکان و قڕگە وشك بووەکەم تێکەڵی خەونەکانم دەبوون، بیرم لەوە دەکردەوە کە پیر بوون چیرۆکێکە کە ناتوانی بە زمان دەریببڕی و ئەو پەشیمان بوونەوانەیش کە ناتوانی ئاماژەیان پێ بکەی هەر هەموویان ترسن. بە شەو قاچم بە سۆندەی ماتۆڕی ئاو کەوت، تەلەفۆنم بۆ ڕەسەپسیۆنی (پرسگە) هۆتێل کرد. وا هەستم کرد کە دەنگ لە من دوور دەکەوێتەوە بەڵام بە گشتی نەپچڕا. بیرم لە خەو دەکردەوە. جار جار دەم گوت چی دەبێت با بێت. ئێشەکان وەکو مشتێك بوون کە دەکەوتنە نێو چاوی منەوە، هیچ لە چۆنە تێپەڕ بوونی کات و زەمان تێ نەدەگەیشتم.

کاتێك کە بە خەیاڵاوی بوون و لە نیوە خەوەیدا دەمدیت کە سەوز و شین لە نێو ئاسماندا تێکەڵ دەبن و کاتێك کە بیرم دەکردەوە کە تیشکەکانی خۆر کاریگەرییان لە سەر هەستە باشەکانی من دەکرد، جەستەم وەکو دڵۆپە درەخشاوەکانی ئاو زیندوو دەبووەوە. دەمڵە (قەترە) زەردەکان بۆنی خەردەڵ و سێوی گەنییان دەدا. کاتێك کە بە هەزاران سەگی ڕەش و هەزاران چاوی دیکە سەیری منیان دەکرد، فریشتەکان باڵیان دەگرت و فرمێسکەکانیش دەبوونە ڕووبارێکی گچکە. دەنگێك کە بۆ هەتا هەتایە دەکەوتە گوێم هەر جار دەیگوت " ئەوانەی کە غەدریان لێ کراوە فرشتەکانن". بە دوای نەعلەکانمدا گەڕیام، چوومە بالکۆنەکەوە، دەنگی باڵندەکان دەهات. دۆڵی دیجلە لە ژێر شەپۆلێکی باریکی تەمدا دەمی دەکێشا (دەکولا). ماڵی ئێمە لە نێو ئەو کۆمەڵگایەدا بوو کە لە نێو بنارەکانی فیسدا دامەزرابوو. لە لای سەرەوەیش تەندووری ماڵە هەژارەکان پێ کرابوون. (هەڵگیرسابوون.وە). مانگاکان هاوار هاواریان بوو و

بۆنی پەینی ئاژەڵەکان بەرز دەبووەوە. لە پەنجەرەکەدا چاوم بە رووبار کەوت. کاتێك کە شەپۆلە شینەکان بە تەنیایی هەستەکانی منیان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد، راستییەکانی ئەو بەری رووبارەکە ئازاری دڵی منیان دەدا.

نێو ماڵ پڕ بوو لە کتێب، رەنگە لەق لەقەکەی ژوورەکەم و ئەو رووبارەی کە وەکو خەنجەر دەدرەخشایەوە، قدیفە کۆکراوەکانیش پەرۆشی باخچەکان بوون. سنوورەکانی زانکۆیش هەر وەکو کەشتییەکی گەورە و زەبەلاح بوون. هیچ شتێك لە نێو ژوورەکەمدا کەم نەبوو، پەردەکە، ئاباژوور، فەرشەکان و بگرە قەرەوێڵەکەیشم رەنگی لەق لەقی بوو.

نەفسیاتی من لە رۆژانی پشوو کە بەرف دەباری دەبوو وەکو نەفسیاتی تاوانباران. بە شێوەیەکی ئسوولی پەنجەرەکەم دەکردەوە و سەیرم دەکرد و دەمکوت " باشە لە نێو چادرەکاندا بارمان کرد هاتینە نێو ئەو خانووانەی کە بۆ ئافەت بەرکەوتووەکان ساز کرابوون. لە وەرزی بەهاراندا قەراخی رووبار ماڵی دووەمی من بوو. کاتێك کە بیرم دەکردەوە بە سەیر کردنی رووبار دەگەمەوە ماڵی خۆمان، نەجۆرە خەیاڵ و بیر کردنەوانە منیان لە سەر هۆش دەبرد. بەم هەستە خۆشانەوە لەگەڵ زەینەب و هەنگاوە نەرمەکانی دەرۆشتین و بەردمان فڕێ نێو رووبار دەدا. کاتێك کە بۆ ساڵیادی هەڵبجە خەڵك رژانە سەر شەقامەکان قاچەکانم سڕ بوون، پەردەکەم وەلاوە دا. کاکم لە سەرەوە سەیری منی دەکرد. لا ملی ئەسپەکی کاکم ماساژ کرد و شەکەرم پێدا. باڵندەکان دەستیان بە ئاواز خوێندن کرد. لە سالۆنەکەدا سەیری دایکم دەکرد کە سەرقاڵی سوورکردنەوەی ئەو کەنگەرانە بوو کە لە دامێنەکانی چیاکانی دالآمبۆدا هێنابوومان. لەگەڵ باوکمدا جارجار دەستمان بۆ کەنگەرەکان دەبرد و دایکم دەیگوت" هەی دزینە". کاتێك کە بۆنی نێرگز تێکەڵی دەنگە گەورەکەی سەیبەلی شوان دەبوو، چاوەکانی کاکم دەیانەویست هەڵبێن (برەون.وە).

کاتێك کە زەینەب بۆ لای من خۆی خوار دەکردەوە منیش زۆربەی جاران وام دەکرد کە نووستبوومە. رێکوپێك کردنی دۆشەك و نوینگەکەم و کۆنترۆڵ کردنی ئاگری جەستەی من ببوو داب و نەریتەك لە لای زەینەبەوە. کاتێك کە بە سەر پەنجەکانی قاچییەوە لە نێو ژوورەکەمدا دەردەچوو خەوی منیش دەچوو. من فێری تەقە رەقی داکتیلۆ (یەکێك لە ئالآوە سەرەتاییەکانی نووسین. وە) و گفتوگۆ تەلەفوونییەکانی زەینەب ببووم. کاتێك کە بە شەوان لە خەودا رادەچڵەکییام، بە زەینەبم دەگوت کە خەونم بینیوە. بە هۆی کراوە بوونی پەنجەرەکان، بۆنە پیسەکەی زلکاوەکە دەهاتە ژوورەوە. دواتر ئەو دەنگە گەورانەی کە لە نێو دڵی تاریکی شەودا رادەبوون و ئەو کۆیتەرانەی کە شاریان کۆنترۆڵ دەکرد و دەنگی چەکەکان، هێمنی شەویان لە ناو

دەبرد و منیش هەناسەی خۆمم هەڵدەگرت و چاوەڕوانی ڕووداوەکان دەبووم. کاتێك کە نوقمی بیرەوەرییەکان دەبووم، لە نێو تاریکیدا ڕووناکیم دەدیت. کاکم وەکو هەورە تریشقە دەهات و سواری ئەسپەکەی دەبوو و سەری منیشی دەخستە نێو باوەشە گەورەکەیەوە، جار جار لە بیر هێنانەوەی دەموچاوی ئاستەنگیم دەکێشا. دەستەکانم بەسترابوون و پەنجەکانم دەژمارد، هەر شەو بەر لە نووستن مەرهەمی بادەمی تاڵم لێدەدان. برینی سەر دەستەکانم ئەو ڕێگایە بوو کە دەچوویەوە بۆ ماڵی خۆمان. ئەو شتەی کە ئازارەکانی لە بیری من دەبردەوە لێدانی مشکی من لە لایەن ڕووبارەکەوە بوو. ئەو هەورە تەمانەی کە دادەکەوتن، بارانە زەردەکان، ئەو شارانەی کە لە نێو خەودا بوون، گوندەکان و .... ئەو دایکانەی کە باوەشیان بە منداڵەکانیانەوە کردووە و ئەو منداڵانەی کە دەموچاویان شین ببۆوە و ئەو چاوانەی کە دەورووبەریان ڕەش ببووتەوە و ئەو ئاژەڵانەی کە لە چیای سەهۆڵدا جیا ببوونەوە و ئارامی چیمەنەکان....

هەر شەو باڵکۆنەکەمان دەشۆرد و منیش هاوکاریم دەکرد. لە گۆشەی سەوزاییەکاندا پیازو ڕێحان و نەعنامان چاند بوو. کاتێك کە مانگە شەو دەیدا لە گوڵە سیرەکان، گۆرانییەکانی دایکم دەهاتنەوە بیرم و لە نێو شەوە بێ کۆتاییەکاندا چاوەڕوانی بەرەبەیانانم دەکرد.

زەینەبیش یەکێك لەوانە بوو کە کەتبوو بەر ستەمی دەوڵەت و بۆیە ناچار بوو ئەو کارە کە بە ناچاری بە سەریدا فەرز کرابوو جێبەجێ بکات. لە کاتی جێبەجێ کردنی ئەرکی زۆریدا حەزی لە حوسێن کردووە و سەرەڕای دژایەتی کردنی خانەوادەکەی لەگەڵ حوسێندا ژیانی هاوسەری پێك هێنابوو و دوای دووساڵ بە هۆی ڕووداوەکانی نێو زیندان، حوسێن گیانی لە دەست دابوو و پەیوەندییەکانی زەینەب لەگەڵ خانەوادەکەیدا هیچ باش نەبوون. ئەو زەیتوونانەی کە بۆیان ناردبوو، دوور بوون و ساردبوونی پەیوەندییەکانی پێوە دیار بوو. بە کوردییە سەقەتەکەی خۆیەوە بۆ فێرکردنی من بە تیپە لاتینییەکان قۆڵەکانی هەڵدایەوە. لەسەر ئەو تەختەیە کە لە گۆشە گەورەکەی هۆڵەکەدا دایनابوو، سەرقاڵی فێر کردنی من بوو، ئەو حەرفانەی کە من دەبوایا فێریان ببم زۆر جیاوزتر بوون لە تیپە عەرەبییەکان. لە سەر ئەو گۆی زەوییە کە دەدرەخشایەوە سەرقاڵی شرۆڤە کردنی چۆنیەتی پێکهاتنی جیهان و گەردوون، بەحرەکان و چیاکان بوو و منی لەم بارەیەوە فێر دەکرد. کاتێك کە باسی مرۆڤە سەرەتاییەکانی مزیۆپۆتامیای دەکرد، برژاندنی ئەو ماسییانە کە باوکم لە نێو ڕووباردا ڕاوی دەکردن بە خۆشییەکی یەکجار زۆرەوە دەهاتە بەرچاوم.

دەستم بە ڕۆیشتن بۆ قوتابخانە کردبوو، هەموو شتێك بۆ من بێیانی و ئازاردەر بوو. کاتێك کە دەهاتمەوە ماڵەوە هەستم بە ئارامی و تەناهی دەکرد. ورد کردنی پەتاتە و خیارەکان و سوورانەوە لە دوای زەینەبدا هەستێکی زۆر هیوابەخش و خۆشی دەدا بە من. کاتێك کە سەرقاڵی لێکۆڵینەوە لە

نێو ڕەفی کتێبەکانیدا دەبوو منیش وەکو پشیلە دەچوومە لای و دەستی بە سەرمدا دەکێشا و بەو هەناسانەی کە بۆنی قەهوەیان لێوە دەهات منی ماچ دەکرد. ڕۆمانێکی بە ناوی " قەرەباڵغییە گچکەکە" کە سەبارەت بە ژیانی سەمەد بەهرەنگی بوو دەخوێندەوە. وتم ئەگەر" دوای ئەوەی کە بە زمانی تورکی ئەو چیرۆکە بخوێنمەوە بە زمانی زگماکی خۆمیش بیخوێنمەوە" ئەو کاتە پەردەکانی نێودڵم نامێنن." بۆ زەینەب کات زۆر بە نرخ بوو، بۆیە هیچ کاتێ خۆی بە فیڕۆ نەدەدا. نا گوتنەکانی زینەب هێمای زانا بوونی زەینەب بوون. لە سەر مێزەکەی پڕ بوو لە کتێب و ئەوانەی کە دەیخوێندنەوە لە ژێر بابەتەکانیاندا خەتی دەکێشا و چەند تێبینی بۆ خۆی دەینووسی، لەم کات و ساتانەدا منیش بێزار دەبووم و بە سەر پەنجەکانی قاچم بەرەو دەرگا نیوە کراوەکە دەڕۆشتم کاتێك کە دەگەیشتمە بەر دەرگا، یا دەکۆخام یا دەپژمام ئەو کاتە زەینەب قەڵەمەکەی دەستی دادەنا و دیگوت" دەمرم بۆت و منی بە باوەش دەگرت". دەیگوت زۆر حەزم لە چاوەکانی تۆیە چونکە وەکو چاوەکانی حوسێنن.

کاتێك کە وتی پێویستیم بە فێر بوونی زمانی کۆن هەیە تا بتوانم بگەمە چەندین بەڵگە، ئەمجارە من بووم بە مامۆستای زەینەب. کاتێك کە من ئەلف و بێی عەرەبیم فێر دەکرد، ئەویش بە شێوەیەکی تایبەتی بە خۆی لە دوای من حەرفەکانی دووبارە دەکردەوە و باسی لە گرنگی زمان و فۆنەتیکی زمانەکانی دەکرد. هێنانی زمانی وشە دەنگدارەکانی تورکی بۆ من برێك ئەستەم بوو. کاتێك کە کانی هەتاو لە نێو ژووره ئەفلاتوونییەکەمدا یارییان دەکرد چاوەکانی خۆم لە سەقفەکە دەگەڕاند. کاتێك کە حەرفەکانم دووبارە دەکردەوە بێ کاتی لە نێو نایندەکەدا (مەبەست جامە.وە) وەکو کەڵەشێرێکی بێ وەقت لە پشت پەردەکانەوە خۆی دەخستە ئەستۆی من. دەکەوتمە نێو لافاوی وشەکانەوە. دەنگ و ڕەنگ و بێ هێزی زمانی خۆم گاز دەکرد و لێوەکانیشم چرچ دەکرد.چاوەکانم بێگانە بوون و دەمی منیش وەکو چاڵەیەك بوو کە دەکرایەوە و دادەخرا.

زۆر حەزمان لە دەنگی قاچی یەکتر بوو، لە دووری بێدەنگیدا بە کۆخانە ئەنقەستییەکان دەمانەویست هەبوونی خۆمان بسەلمێنین. لە نێو شەپۆلە تۆزەکان کە لەگەڵ تیشکی خۆردا لە نێو ژوورەکەمدا دیمەنێکی بێ کۆتاییان پێك دەهێنا، لووتی زەینەبم دەدیت کاتێك کە خۆی بۆ لای سەری من خوار دەکردەوە و لە گوێ مندا هەمیشە بە هەر هەمووی ئەو زمانانەی کە دەیزانین وشەی خۆشەویستی دەخواند و دیگوت" ئەمە ئەسپانیاییە، ئەمە ئیتالیایی و ئەمە ئینگلیزی و ئەمە عەرەبی و ئەمە سۆریانی و سۆرانی و عیبرانییە". کاتێك کە سەیری هەواڵەکانمان دەکرد چاوەکانی پڕ دەبوون و دەیگوت" ڕۆژە خۆشەکان نزیکن حەتما ڕۆژە خۆشەکان دێن". بۆ یەکەمین

جار وشەی مەنوپوزم لە زەینەب بیست، منیش ئەم وشەیەم دابەشی هەجەکان دەکرد و واتام بۆ دەدۆزییەوە. بە دوای دۆزینەوەی پەیوەندی لە نێوان مەن و پوزدا بووم. دەیگوت " ئەو ژنانەی کە مێردەکانیان کوژراون زوو مەنوپوز دەبن". ژنێکی جوان و رێك و پێك بوو، کاتێك کە لە نێو ماڵدا هاتووچۆی دەکرد وا بیرم دەکردەوە کە پشتی زۆر رێك و پێکە. کاتێك کە سەیری وتووێژەکانی لەگەڵ پیاوەکاندا دەم کرد تێدەگەیشتم کە زۆر سەری خۆی بە مەسەلەی جنسییەتەوە سەرقاڵ دەکات. هیچ لەو جۆرە ژنانە نەبوو کە ژن بوونی خۆی بەکار بهێنێ و هیچ تەقلیدی هەڵسوکەوتی پیاوانیشی نەدەکردەوە. ژوورەکەی بەو ئاستەی کە مرۆڤ پێ تووڕە ببێت رێك و پێك بوو. بە سەلیقە و زەوقێکی زۆر جوانەوە رەفی کتێبەکانی دامەزراندبوو و کتێبەکانی بە پێێی ناوەرۆکیان لە یەکتر جیای کردبوونەوە.

زەینەب هەمیشە دەیگوت" کتێبەکانم لە کتێبە پیرۆزەکانیش بۆم پیرۆزترن و جەنەتیش لە نێو ناخی ئێمە بۆ خۆماندایە."

کاتێك کە لە نێو ئانتۆلیەیەکی ژنانەدا بۆ یەکەمینجار دەستم بەکار کرد سەرەتا زۆر دەترسام. لە نێو ماڵەوە دەسووڕامەوە و لە سەر قەنافەکاندا لاسایی زەینەبم دەکردەوە و کاتێك کە دەنگی باڵەفڕەکانم دەبیست یا خۆم دەخستە ژێر مێزەکانەوە یا لە نێو قەرەوێڵەکەمدا خۆم حەشار دەدایەوە. ئەو هاوڕێیانە کە هێشتا پەیوەندییان لەگەڵ گونددا هەبوو بۆ ئێمە گیا و سەوزەواتی جۆراوجۆریان دەهێنا. هاوکات لەگەڵ هاتنی بۆنی چای، دەم و چاوی (روخساری) زەینەب دەبوو وەکو دەم و چاوی دایکم. کاتێك کە کاکم لە تەنبووری (مەبەست سازە، وە) دەدا دایکم لە سەر هۆشی خۆی دەچوو و چاوەکانی مۆر دەبوونەوە. دەم زانی کە دایکم لە من زۆرتر حەزی لە کاکم دەکرد، منیش زۆر ئەوم خۆش دەویست. کاتێك کە بە دەنگی شەپۆلەکانی با کە لە نێو لوولە سۆبەکاندا دەهات و دەنگی کەوچێکی چایی لە خەو هەڵدەستام، بۆنی ئەو شیرینەمەنیانە کە لە سەر سۆبە تەنەکەییەکەدا سۆر دەکرانەوە وەکو بۆنی توتوون بوو. کاتێك کە دەیگوت هیواکانم زۆتر دەبوون ئەو کاتە وشەکانی سەر زمان زۆرتر دەبوون و ببوون وەکو رووبار. ئەو شەوانەی کە ترسم زۆربوو ئێستا زۆر بە باشی لە لام روون ببوونەوە (مەبەست تێگەیشتن لەو شەوانەیە کە ترسی زۆر بووە. وە). هەستەکانی ژیانی نادیار و ئەو دڵە بێدەنگانە کە کۆ ببوونەوە و سەیر کردنە ترسنۆکەکان...... ئەو ددانە گەورانە کە لە نێودەمی سەربازە عەرەبەکاندا جێیان نەدەبووەوە و ئەو چاوانە کە لە یەکتر نزیکتر بوون........

کاتێك کە سەربازەکان نێو ماڵیان تەفتیش دەکرد باوکم دوعای دەخوێند و دایکیشم دەستی دەبرد بۆ قۆرئان و ناوچاوانی کاکم چرچ دەبوو و دەلەرزیا. کۆچ کردنی ئەو هەستانە کە نەدەهاتنە سەرزمان و قفڵ بوون لە سەر داهاتوو.... لە نێو ئەو رۆحە منداڵانەمدا چەندە شتم

هەڵگرتبوو. شەپۆلەکانی رزگار نەبوون و هەستە تێکەڵ کراوە بێ کۆتاییەکان و بیرو باوەڕەکان.... هەڵکۆتانە سەر ماڵان بە شەو و ئەوانەی کە دەڕۆیشتن و نەدەهاتنەوە.....

دایکم سەیری ئەو رێگایەی دەکرد کە باوکم تییادا دەچوو بۆ ناوشار بۆ شت کڕین. کاتێك کە لە نێو تەنووردا نانی دەکرد تووشی شیوەنێکی دەروونی دەبوو و سەیری دووره دەستەکانی دەکرد. کاتێك کە تووڕە دەبوو لە دەم و چاوە تەڕ بووەکەیدا بە هەزاران دەرد و نێش، لە سەر جلّ و بەرگە گۆڵدارەکەیدا خەمەکانم کۆ دەکردەوە. سەیری ئەستێرەکانم دەکرد و باوکم لە شار دەگەڕایەوە. لە نێو کاتژمێرە فسفۆرییەکەی کاکمدا حەسابم بۆ رۆژە خۆشەکان دەکرد و لە نێو دەتا و وردەکارییە نەخوازراوەکاندا نۆقم دەبووم. ئەسپەکەی، ئەو سازەی کە بە دیوارەوە هەڵواسرا بوو، ئەو گەڵانەی کە لە لایەن باوکمەوە هەڵواسرابوون، خۆڵی جگەرەکەی. بۆ رزگار بوون لە نێو کۆڵانە بەستراوەکاندا دەمەویست هاوار بکەم بەڵام نەمدەتوانی.

زەینەب لە بەرانبەر زمانەکانی دیکە خاوەن شیان بوو. لە نێو چەپەری خۆشی دوو زمانیدا بووین. وردە وردە کوردییەکەی زەینەب و تورکییەکەی منیش باش دەبوو. سەرەتا کاتێك کە لە نێو دۆڵی وشە بیانییەکاندا تەنگاو دەبووم، دواتر وەکو بولبول کە بۆ گوڵە جۆراوجۆرەکانی دەخوێنێ دەستم بە گاڵتە کردن کرد. حەرفەکانی ö.üو K لە لای من هەجەیەکی (دەنگێکی . وە) تایبەتیان هەبوو. بۆ زەینەبیش حەرفەکانی w,q,x زۆر کۆمەدی بوون. ئاهەنگی تۆنی دەنگی زەینەبم دەرك کردبوو، دەنگی زەینەب لە بەرانبەر خانەوادەکەی شکستی و لە بەرانبەر مێردەکەی بە هەست بوو. عەقڵی من کە وردە وردە دەوڵەمەند دەبوو و زەینەب... کاتێك کە قسەی دەکرد وەکو ئەکتەرێکی لێهاتوو دەستەکانی بە بێ کەم و کورتی و بەبێ زیادەڕەوی دەجووڵاندەوە. کاتێك کە سەبارەت بە خانەوادەی قسەی دەکرد چاوەکانی کلیلی شوێنێك دەکرد و هەر چەند درێژەی بە قسەکانی دەدا هەر ئەوەندەیش چاوەکانی پڕ دەبوون.

باپیری لە دوای شەڕی جیهانی یەکەم لە نێو کۆشکی عوسمانییەکاندا وەکو کاتژمێر فرۆش کاری کردبوو. دەیگوت "لە بەرانبەر پەروەردە کردنێکی سەختی ئایینیدا ئاسۆکانی عەقڵی باوکم کراوەتر بوونە و دایکیشم کچی یەکێك لە گوندییە خاوەن زەوییە زۆرەکان بووە" دایکی بە هیچ شێوەیەك قەبووڵی نەکردووە کە باوکی لە هەر ناوچە و قەزایەکدا چەندین دۆستی هەبووە. دایکی بە هەر دوو دەستییەوە شێواز و رێبازی ژیانی کۆنی گرتووە و هەر وەکو ئەو شێرانەی کە پەنجەی خۆیان دەرهێناوە ئەویش هەمیشە هەوڵی بۆ پاراستنی ئاغایەتی ژنانەی خۆی داوە. باوکی ئەوەندە کە حەزی لە خاك و مرۆڤ بووە حەزی لە ئینجیل و تەورات و قورئان نەکردووە و هەمیشە وتوویەتی " شتی هەرە گرنگ مرۆڤ و مرۆڤایەتییە" لە کاتی ئەم

قسانەدا ناوی فەیلەسووفەکانی سەردەمە سەرەتاییەکانیشی هێناوەتە زمان و کاتێك کە وتوویەتی" کێ دەزانێ لێرەکانە چەندە قسە و باسی بەهێز کراون و چەندین خۆشەویستی بە هێز ژیاون". دایکیشی لە بەرانبەریدا وەکو ژنە توندڕەوەکەی سوقرات باوکی بە بێ غیرەت تاوانبار کردووە. کاتێك کە ویستوویەتی لە ژێر کاریگەری کەسایەتی باوکی دەربچێت و بۆ خۆی ببێتە کەسایەت و کەسایەتی خۆی بکاتە کەسایەتێکی بێ کۆتایی، کچێکی جوان و تێگەیشتی بوو. زەینەب دەیگوت" لە نێوان مرۆڤ و جیهاندا ئەوەندە پەیوەندییەکی خۆش و بەهێز هەیە کە جیهان بۆ ئەو کەسەی کە لە نێو دڵی خۆیدا بە خۆشەویستی بە دوای جیهاندا دەگەڕێت بە خۆشەویستی وەڵامی دەداتەوە."

ئێوارەیەك کاتێك کە لە نێو باڵکۆنەکەدا چای و شیرینییە کشمیشییەکەمان دەخوارد باسی خاڵی خۆی کرد. جەمیلی خاڵی کابرایەکی بەهێز و کەڵەگەت و شەیدای جوانترین کچی ناوچەکە بووە و لەگەڵیدا ژیانی هاوسەری پێك هێناوە. دواتر لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا لە لایەن سیخوڕەکانەوە شکستی خواردووە و هێزی خۆی لە دەست داوە، بۆیە ژنەکەی نازلی و منداڵەکانیشی وەکو رابردوو نەماون و گۆڕاون. هیچ کۆتایی بە شەڕ و ناکۆکییەکان نەهاتووە و دواتر بارودۆخەکە وەکو ئەوەی لێ هاتووە کە نێوانیان خۆش بووە و لە وەرزەکانی هاویندا زوو زوو بە مەبەستی سەیران کردن سەردانی بنارەکانی چیای قازیان کردووە. رۆژێك لە رۆژان هەواڵێکی دڵتەزێنیان بۆ دێت." شوێنی سەیران کردن یا سەیرانگاکە بووەتە لافاوی خوێن". نازلی شادەماری جەمیلی خاڵی زەینەبی بڕیوە. لە گرتووخانەدا زۆر نەخۆشی کێشاوە. جار جار پرسی منداڵەکانیشی لە نازلی کردووە. جارێك لەگەڵ باوکیدا چوونەتە سەردانی. زەینەب لەکاتی ئەم سەردانەدا بۆ یەکەمجار چاوی بە گرتووخانە کەوتووە. دیوارە نەمگرتووەکان و ئاسنە گەورەکان و ئەو تەنبوورانەی کە لە پشت ئاسنەکانەوە بە دیوارەکانەوە هەڵواسرابوون بە رۆژان لە نێو مێشکی زەینەبدا مابوونەوە. نازلی لە جێگای خۆیدا جووڵاوەتەوە و هەر سەیری زەوی کردووە و وتوویەتی" ئیتر چۆنن باشن زەیتوونەکانتان کۆ کردووەتەوە؟" لە جەژنەکان و لە جەژنەکانی سەری ساڵدا هیچ نازلێیان لە بیر نەکردووەتەوە.

کاتێك کە باسمان لە گوڵ کردنی داری بادام و کۆکردنەوەی زەیتوونەکان و باخە ترێ کانمان دەکرد و شەو وەکو نوقرە دەکەوتە نێو دارە زەیتوونەکانەوە دەمەویست دەستم بۆ خوا درێژ بکەم. کاتێك کە ئەم شتانەی بۆ من دەگێڕایەوە دەستی بە گریان دەکرد و دەیگوت" باوکم هەمیشە دەیگوت گریان هێمای باش بوونە". باوکی بەر لەوەی بمرێت ئەو پارانەی کە لە ئەنجامی بەرهەمەکانی دەستی خۆیدا کۆ کردبوونەوە هەر هەمووی بەخشیوە بە شوێنی بەخێو کردنی منداڵە بێ کەس و کارەکان.

کاتژمێر ۷ و ٤٠ خۆلەکی بەیانی لەو بالکۆنە کە سەیری دۆڵەکەی دەکرد نانی بەیانیم خوارد و تا پردی دە پیاسەم دەکرد. ئەو کەسانەش کە عەرەبانەی گەڕاندنی سەیرانکەرەکانیان هەبوو سەحەرخێز بوون و لە شوێنەکانی دانیشتنی ژێر دارچنارەکاندا نانی بەیانییان دەخوارد و منیش سلاوم لێ کردن، یەکێکی جوانیان لە نزیکی مندا بوو و پرسیاری لێ کردم" مامۆستا بتگەڕێنم؟" منیش نەم گوت نا. کاتێك کە هەوا خاوێن و نەسیمە دڵ رەوێنەکانی بەرەبەیانم هەڵدەکێشایە نێو ناخمەوە بیرم لەوە دەکردەوە کە ئایا ئەمە ئەو شارە بریندارەی خۆمانە کە سالانێك ئێدا ئێش و ئازارمان کێشا بوو. ئەو شاخانە کە وەکو لەکەیەکی زبر لە نێو چالاوەکەدا بەدەردەکەوتن و ئەو باڵندانە کە هاواریان دەکرد و باڵیان دەگرت... بۆڵە بۆڵی ئەو خێلانەم دەبیست کە هەم نەسارەتیان دەزانی و هەم جەسارەت. کەسکایەتییەکەی بنارەکە نە تەنیا بە وێنەکێشەکان و پەیکەرتراشەکانی خۆی بەلکو بەو مووزانەیەوە مەغروور بوو کە فرە کولتووری ئەو شوێنەیان دەنواند. لە نێو ئەو قەلایانە کە روخابوون خاوەنەکانی مەرگ پیاسەیان دەکرد و جوانەکانیش ئاگریان لە جەستەی خۆیان بەردەدا بەلام ئێستا هەبوونی چەندین رستۆرانت، کافە تریا و کتێبخانە لە نێو ئەم قەلایانەدا دلخۆشکەر بوو.

جادەکان رازاوە بوون و کاتێك کە بۆنی خاکی تەڕ تێکەڵی بۆنی بەرەبەیانیان دەبوو دەنگی قامچەکان کە لە نێو هەوادا دەسووڕایەوە دەکەوتە عەقڵمەوە. تابەلاکانی ناوەندەکانی چاکسازی کۆمەلایەتی دڵی منیان ئازار دەدا. خاوەن عەرەبانەکە سۆتێك لێ دەدات و دەڵێت" هیچ شوێنێك نابێتە وەکو ولاتی مرۆڤ". دەنگی ئەو جوانانە دەهات کە لە نێو چیمەنەکاندا خۆیان خوار کردبوو، جیقە جیقی منداڵەکان کاتێك کە دەیانەوەیست لە سەر عاموودی کارەبادا بەسەر بکەون و شۆتییە زۆرەکان... و هەر هەمووی ولاتەکانی جیهان. ماندبوومە، سەرم وردە وردە گران دەبوو لێم پرسی " بگەڕێنەوە".

ماڵی نووسەرەکان بینایەتێکە کە لە بەردی بازالت (جۆرە بەردێکی دەستکاری کراوە. وە) ساز کراوە، لە نێو ژوورەکەی خۆمدا دەرمانەکانم وەرگرتوو و چوومە نێو باخچەکەوە. لەگۆشەیەکدا کە خۆری لێ دەکەوت دانیشتم. چاوم بە چەند کەسایەتی میدیاتیك (مەبەست ئەوکەسانەیە کە کاری راگەیاند و میدیا دەکەن.وە) کەوت. بەو سیمایانەی کە لە نێو خۆیاندا خەفە کرابوو دیار بوو کە چاوەڕوانی شتێك دەکەن. بە مەبەستی لە بیر بردنەوەی ئێشەکانی جەستەم لە نێو دارەکاندا سەیری دۆڵەکەم کرد. ئەو هەڵمە گچکە کە لە چالاوەکەدا هەڵ دەستا وردە وردە دەبوو بە تەم. ئەوانەی کە لەو لای منەوە دانیشتبوون دەیانگوت " نە مووزەخانەکان، نە شوێنە هونەرییەکان و نە شوێنەکانی دیکەی گەشتوگوزاری هێشتا نەکراونەتەوە". لەسەر هێماکەی ئاشتی کۆترەکان رادەبوون و دادەنیشتنەوە.

مێژوو شتێك نییە بێجگە لە شەڕی نێوان گۆڕانكاری و بەردەوام بوون. مرۆڤ بە مەبەستی ئەوەی کە بە مانای راستەقینە هەبوونی هەبێت پێویستی بە هەبوونی خۆی هەیە. ریتمەکانی (ئاهەنگ) رۆح لە نێو قەزاکاندا چەندە ئارام، هێمن و خاوەن سیستەمن، بەڵام کاتێك کە تێکەڵاو بوونی شارە گەورەکان لە بەرانبەر شارە گچکەکاندا هەڵدەسەنگێنین ئەو کاتە راستییەکان ئاشکرا دەبن. ئەو روحانەی کە لە نێو شارە گچەکاندا محافیزەکارن تا لە نێو لەرزانەوە و ئاڵوگۆڕێکی زۆر سەرەکەدا تێنەپەڕن ناتوانن لەگەڵ ریتمی شارە گەورەکان رابێن (خۆیان فێری شارەگەورەکان بکەن. وە). باوکی زەینەب زمانی چیکی و یۆنانیشی زانیوە. هەر بەیانی کاتێك کە بە بۆنی ئەنجیر، توویترِ و گوڵە بیانییەکان هۆشیار بووە، لە نێو سڵاو کردنە دووراودوورەکان و دەنگی مەکینەکاندا خۆی گەیاندووە قەراخی دەریا. هەمیشە لەو کاتژمێرەدا لەگەڵ ئەو پیرە پیاوەی کە خەریکی کۆکردنەوەی ترۆزییەکان بووە قسەی کردووە. کاتێك کە وتوویەتی" ئەی برازام ئێمە چ رۆژگارێکمان بینیوە". چاوەکانی نەماوی بوونە (مەبەست دەست بە گریان و فرمێسك رژاندنە. وە). هاوکات لەگەڵ تێپەڕ بوونی کاتدا دایکی تۆزێك گۆڕاوە. هەبوون و نەبوونی خۆم بۆ ئێوە سەرف کردووە، بە مەبەستی سووپرگە کردنی قژەکانی (شانە کردن)، سەری خۆی شۆردووە. لەبەرانبەری هەڵسووکەوتە ناشیرینەکانی دایکیدا روخساری باوکی بە هۆی پێکەنینە درەوشاوەکانی ساڵانی رابردوو بێدەنگ بووە. کاتێك کە لە گەڵ باوکیدا لە نێو بێستان و باخەکاندا پیاسەیان کردووە هیچ نەیویستووە کە ئەو چیرۆکانەی کە باوکی بۆی دەگێڕایەوە کۆتاییان پێ بێت.

لە سەر دەرەجەی ماڵە گچکەکەی نێو باخی دار زەیتوونەکاندا سەیری باوکم دەکرد کە نوقمی قسە کردن دەبوو. لە هەر هەموویان زیاتر حلمی سەرەنجی منی رادەکێشا. بە چاوە شینەکان و هەیکەلە پەمبۆیەکەی خۆیەوە هەمیشە هەیکەلە کۆن و عەنتیقەکانی دەخستە بیرمەوە. کاتێك کە چاوی خۆی دەگرت و قومی لە شەرابەکەی دەدا و منیش بە باشی سەیرم دەکرد، باوکم منی ئاگادار دەکردەوە. بەو مانایە کە من مێوانەکەم ناڕاحەت کردووە و کەنیامە.

زەینەب دەیگوت" کاتێك کە سەیری دایکی حلمیت بکردایا دەت گوت هیچ مێری نەکردووە". جارێکیان سەردانی دوورگەی رودوسیان کردووە، و باوکیشی ئەوی لە لای ژنێك بە ناوی کاتینا داینا و وتوویەتی ئێوارە دێنەوە. کاتینا کە لە سەردەمی جوانی خۆیدا لە ئەزمیر لە نێو بار و کافەکاندا گۆرانی وتووە بەبێ هیچ راوەستانێك قسەی کردووە. کاتێك کە باسی مەیخانە، گەشتوگۆزار و خۆشەویستەکانی خۆی کردووە، دەنگی گڕ بووە و راوەستاوە. جەستەی پیر و رۆحی جوانی و لە نێو زۆربەی روخسارەکاندا بینیوە. کاتینا کاتێك کە لە پشتی

داره ژاڵەکەی نێو باخچەکەیدا زمانی خۆی دەدا بە لێوەکانییەوە، باسی لە خۆشەویستە نوێیەکەی کاپتان یورگو دەکرد. تامی ئەو ماسیانە کە یورگو هێنای بوون و ئەو مەزەیە کە شەرابی ئانادۆڵ لە سەر زمانیەوە هێشتبووی، هەر چەندەی دەخواردەوە پێ سەرخۆش دەبوو. دواتر وەکو جوانەکانی دیکە هەستی پێ کردووە کە باوکی شەیدای کاتینایە. کاتێك کە کاتینا وتوویەتی "ئەوانەی کە تامی عەشقی راستەقینەیان نە چێژاوە ئەوانەن کە بە مردوویی ژیان دەکەن" ئەو کاتە چاوی باوکی زەینەب پڕ بووە لە فرمێسك. خۆشەویستی و حەز کردن شتی زۆر بوو، حەز کردن نوێ دەکرایەوە......

ئەو بەڵگەنامانەی کە سەیرم دەکردن دەبوون بە هۆکاری دابڕانی قاچی من لە سەر زەوی و تێك دەچووم. دەستم بە رۆیشتن لە نێو ئەو کەش و هەواییەدا دەکرد کە هیچ جۆرە زانیارییەکم لە سەریدا نەبوو. کاتێك کە لە نێو چۆڕاندنە بێ کۆتاییەکانی خراپەکان، باشەکان، شەڕەکان، هەبوون و نەبوونی حرسەکان (هەناسەی سەرد و ئێش و ئازار. وە)، هاتووچۆم دەکرد لە چوارچێوەی هەزار چاو، عەقڵ و کارەکتەردا باڵم دەگرت. لە سووڕاندنی خەریتە نوورانییەکەی گۆی زەوی ماندوو دەبووم، لە نێو چەند خۆلەیەکدا ناوی وڵاتەکان، شارەکان، رووبارەکان و چیاکانم دەژمارد. بە مەبەستی بەهێز کردنی ئاستی خوێندنی خۆم، بە پێی وەرزەکان ئەو کتێبانەی کە دەبوایا لە رۆژانی پێشوودا بمخوێندبایانەوە دەستنیشانم دەکردن. زەینەب زۆر حەزی لە شارەستانییەتی مزیۆپۆتامیا و ئانادۆڵ دەکرد. دەیگوت هێشتا ئێمە گرنگی شۆڕشی سەردەمی دایك سالاری (نئۆلوتیك) و گوندەکان نازانین و ئێستاش هۆکاری ئەمە لە نەزانینی بیروباوەرەکانە بەڵکو بڕوا کردن بەو بیروباوەڕیانەیە. دەیگوت بە هۆی ئەوەیەوە کە ئێمە زۆر بە باشی ئاگاداری رۆڵ و کاریگەری مێژوویی خۆمان نین ناتوانین بیروباوەڕی جەوهەری و رۆحی خۆمان بە پێش بەرین.

کاتژمێر دە و بیست خولەیەك لە ژوورەکەمدا دەرکەوتم. هەمووی شوێنەکان خاوێن کرابوونەوە و بۆنی کۆلێریان لێوە دەهات. لەشم ببوو وەکو بێستانێك کە تێنووی ئاو بێت. قووڵایی پەنجەی دەستم دەخۆراند. کاتێك کە ئاوی نێو شووشە گەورەکەم دەخواردەوە بە شێوەیەکی ئسوولی ئەو شتانەی کە نووسیم بوون شرۆڤەم دەکردن. کاتێك کە ئەو تێبینی و ئەو شتانەی کە لە نێو ئەو کتێبانەیدا کە پێشتر خوێندمبوونەوە دەمنووسییەوە و کاتێك کە بیرەوەرییەکانی ئەو کاتەی کە هەستم بە ئازادی دەکرد دەنووسییەوە، مرکەبەکە لە سەر لاپەڕەکان بەڵاو دەبووەوە، گوڵە وشك بووەکان و مێژوو سڕاوەکانیش ئەوەیان پێدەگوتم کە حەز لە هەستی حەز کردن و لە ژیانی پڕ داهات بکەم. قژە گڕ بووەکان و دەم و چاوە تێك چووەکەم رووداوەکانی چەندین ساڵ لەمەوبەری بە بیرم دەهێنایەوە. لە نێو کافەتریایەکدا دانیشتبووم،

سەیری ئەوانم دەکرد کە دەهات و دەچوون. لە نێو ئەو گرووپە سەیرانکەرەیدا کە لە لای پشتەوە تێپەڕ بوون ئەو دوو ژنە کە بارودۆخیان وەکو من بوو بە زەردەخەنەوە سەیری منیان کردو وتیان" ئاە ئاە جوانی". منیش هیچ پۆزسیۆنی خۆم تێك نەدا و بێدەنگ بووم. ئەو رووداوە رۆژ لە دوای رۆژ بۆم گەورەتر دەبوو. من نەمدەتوانی دان بە پیر بوونی خۆمدا بنێم چونکە پیر بوون هۆکاری ئێش و ئازار بوو.

کاتێك کە بۆنی کۆلێرەکە هێشتا لە نێو لوتمدا بوو هەستم بەوە کرد کە ئەو جلانەی کە دەبوایا بۆ ئاهەنگەکەی شەو بەرم کردبانا ئوتوو نەکراون راستەوخۆ تەلەفوونی پرسگەی هۆتێلم کرد. دەم و چاو و قاچەکانی خۆم شۆرد و خۆم درێژ کرد. وا هەستم دەکرد کە لەو لاوەی خۆمدام، مکانیزمای خۆ پاراستنم ببوو وەکو ئەو ژوورە شەفافانەی کە میعادگای خۆیان پڕ کردبووەوە. پێنووسەکەشم وەکو خەنجەرێکی تیژ بوو کە لە نێو هەست و بیرەوەریەکانی مندا هاتووچۆی دەکرد، بۆ باشی من و بۆ باشی خەلکانی دیکەش. کەسە تایبەتییەکان تا بلێی هەستیارن و لە بەرانبەر ئێش و ئازار کێشاندندا نائارامییەکی زۆر جیاواز نیشان دەدەن. ئەگەر ئێش و ئازاریش بکێشم عەیبی نییە چونکە باش ژیانم کرد و ساڵەکانی تەمەنم بە پڕوپووچی تێ نەپەڕاند. ئەو کتێبانەی کە لە نێو خەوە و هۆشیاریدا وەکو خۆشەویستێکی گەورە سەیری منیان دەکرد... کاتێك کە سەیری ئەو دیمەنانەم دەکرد کە بە شێوەیەکی قاچاخ خۆیان لە سەر سەقفەکە نیشاندەدا ، دیمانەکانی دەرەوە زۆرتر دەبوون. و بۆنی قەهوە و دەنگی ئەو قاچانە کە لە نێو هۆڵەکەدا هاتوچۆیان دەکرد هیچ دەردەسەرییەکیان نەبوو.....

کاتێك کە دۆڵە قووڵەکان و ئەو رووبارانەی کە وەکو درەفش دەدرەخشانەوە و دەشتە بێ گۆشەکانی ولاتی خۆم دەهاتنەوە بیرم.... خەیاڵی بەهەشت، چیرۆکی ئادەم و حەوا، شەڕی نێوان قابیل و هابیل، جەوهەر و ناوەرۆکی خودا و خوداوەندەکان لە نێو مىتۆلۆژیاکاندا هەر هەموویان ئەو کێشە و ناکۆکییانە بوون کە بە هۆی ناکۆکییە کۆمەلایەتییەکانەوە سەریان هەلدا بوو، هاوکات ناسکردنی رابردوو بە مانای ناسکردنی خۆمان بوو.

کاتێك کە دەهاتمە سەر خۆ و بیرم دەکردەوە تێدەگەیشتم کە فەلسەفەی سەردەمی وەبەر هێنانی یەکەمین گەنم، دۆزینەوەی نووسینی مێخی، سیستەمی ژمارەکان، پێوانەکانی قورسی و درێژایی.... فەلسەفە و ڕێبازی تالێس کە لە سەیبەردا بەرزایی پرامیتەکانی پیوایە و ئاناکسی مەندەرس کە درێژایی وەرزەکانی پیوایە، دەمۆکراتێس کە ئەتۆمی بە شێوەیەك نزیکی شێوەی ئەمڕۆ بەکار هێناوە و ئەو پیساگۆرە کە وتوویەتی دنیا خڕە، فرعەونی مێسر نیچا، فەلسەفە و ئایدئۆلۆژیای زەردەشت کە دەشت و چیاکانی ئێرانی پیوابوو، فەلسەفەی

بوودا لە هەندووستان و هاوکات کنفسیوس لە چین و ژەنۆ و چەکوارا و لە چۆنیەتی ژیانی ئەوانیش تێگەیشت بووم. دواتر چۆنیەتی پێشکەوتنی عوسمانییەکان و پادشاە شێتەکان لە ناوچەکانی بالکانیش بۆم روون ببووەوە.

سولتان سولەیمانی قانوونی کاتێك کە دەچێتە سەر تەخت تاریکی سەردەمی ناوینی روون کردووەتەوە و هاوکات لەگەڵ سەردەمی رونەسانسدا روناکییە ئالتوونییەکانیش دەستیان بە دەرەخشانەوە کردووە.

من لە کۆنفرانسێکدا کە زەینەبیش تێدا بەشدار بوو تێگەیشتم کە رونەسانس نە لە نێو وڵاتە گەورە و دسپۆتەکانی ئەو کاتە وەکو فەرەنسا، ئەڵمانیا و سیستەمی چارلیزی رووسیا و وڵاتی عوسمانییەکاندا دەستی پێکردووە بەڵکو لە نێو شارە گچکەکانی وەکو فلورانس و ڤەنەدیکدا دەستی پێکردووە، هەر بۆیە زۆر مەراقی کوچە و کۆڵانەکان و ئەو پەیکەرە گەورانەی کە لە نێو عەقڵی مرۆڤدا جێیان نەدەبووەوە دەمکرد.

هەمیشە زەینەب پێدەگوتم ئەگەر بێت و بخوێنم و لە نێو زانکۆدا سەرکەوتوو ببم ئەو کاتە شانسی گەڕان لە ڤەنەدیك، رۆما، پاریس و چەندین شوێنی دیکە بە دەستەوە دەهێنم. کاتێك کە بیرم لە رۆژە سەختەکانی سەرەتای ژیانم دەکردەوە هەستی ئەوە کە پێویستە مرۆڤایەتی چۆن بێت لە نێو مێشکمدا دروست بوو. کاتێك کە لە بەر ئەو پەنجەرانەی کە سێبەریان لێ کەوتبوو و پڕ بوون لە تۆز تێپەڕ دەبووم بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەو دارە لەڕ و لاوازانە بە هۆی ئێش و ئازارەوە گەورە نەبوونە. کاتێك کە شەو بە شێوەیەکی بە بێ عەیب و شوورەیی لە نێو گەڵا سەوزەکانی ئەو دارانەدا درێژ دەبوو و سمسارە دڵە ڤاندەلەکانیش بە ددانە جەلادەکانی خۆیانەوە بۆ مەرگ زاریان دەهاوێت دەمەویست ئەو شەوەزەنگە کە پێمانەوە چەسپابوو بە شەربەتی هیواو و ئاوات بشۆرمەوە.

وردەکارییەك بووم کە لە نێو تاریکی شەودا بزر ببووم. کاتێك کە لە بێ کاری سەیری رازە نهێنییەکانی پردەکەم دەکرد وا هەستم دەکرد کە خەیاڵەکان هەر هەموویان لە یەك خاڵدا دەبنە واقیع و هەر شەو دەگەڕێمەوە بۆ ئەو ماڵەی کە نەمبوو......

کاتژمێر ١٢ و ١٥ خولەك بوو، تۆزێك نووستن خۆش بوو بۆ من. هاوکات لەگەڵ دەنگی باڵندەکاندا بیرم لە پیاسەکانی بەرەبەیانم دەکردەوە. ئەو شارانەی کە خاوەن ئەو کەسایەتییانە بوون کە بە ئێش و ئازار گەورە ببوون، وەکو ئینسانە زاناکان مەعسووم نەبوون. ئایا ئەگەر نەزانین و جەهالەت مەعسوومیەتە ئەو کاتە زانابوون تاوان بوو؟ خۆبایی لە زانینی فەلسەفەی چۆنیەتی هەبوون، چە جۆرە خۆباییەك بوو؟ کاتێك کە بە دوای نەعلەکانمدا دەگەڕام لە دوورەوە

دەنگی عەرەبانە دەهات. سەیری ئاوێنەم کرد، مانا و واتەی سەیر کردن و روخساری من، ئەگەر روخساری من بە هەزاران تاوانیش لە نێو خۆیدا حەشار بدابایەوە جارێکی دیکە راست و دروست بوونی منی بە من بەخشی بوو و هیچ شتێکیش بە ئەوەندەی کەسایەتییەکی دروست و راستەقین نەبوو.

چوومە بالکۆن و گۆ بیستی دەنگە خۆشەکەی سروشتم کرد. کاتێك کە ئاوە گەرمەکەی نێو شووشەکەم دەکردە سەر قاچەکانی خۆمەوە، ماچی سەر کوڵمای مندالە شیرینەکەی نێو زکی خۆمم دەکرد. تەکستی نووسراوەکەی وتەکانم جارێکی دیکە کۆنترۆڵ کرد، هەر هەمووی وشەکان خاوەندارییەتییان لە من دەکرد. واتەی هەر وشەیەك لە نێوان مەرگ و زیندوو بووندا دەهات و دەچوو. واتەی وشەکان دەسوورڕایەوە و جارێکی دیکە دەهاتەوە و جارێکی دیکە سەری دەگرتەوە" واتە و مانای مێژوو" و تێگەیشتن. مانای مێژوو نە ئەوەیە کە رۆح هەست بە زانا بوونی خۆی بکات، ئەگەر بێت و ئەم واتەیە لە نێو دیالکتیکی شێوازی وەبەرهێنانیشدا شاراوە بێت جارێکی دیکە بە هیچ شێوەیەك نەیدەتوانی کە واتە و مانایەکی سەربەخۆ بێت.

تێدەگەم، تێدەگەی و تێدەگات.... ئەمانە ئەو وشانە بوون کە منیان شێت دەکرد....

کتێبەکان ئەو ترسەی کە لە نێو ماڵی چاوەکانمدا کۆ ببووەوە کەم دەکردەوە. رووبارە بێ زەمانەکانی نێو دەشتی مێشکم، دارە گێلاسەکان، ئەو گومبەدانەی (منارە. وە) کە بە رەنگی ددانی فیل بوون و باخچەکانی ئادانۆس کە بە گەنم داپۆشرابوون، ئەو ئەفریدووتانەی (خوداوەندی خۆشی و جوان بوون. وە) کە لەگەڵ کەفی بەحرەکاندا یەکتریان بە باوەش دەگرت، ئاغنی قژ ئاگری و قرگ ئالتوونی و ئەو دەمونانەی کە رۆح یان پر بوو لە فتنە و فەسادی، گلگامێش کە بە دوای بێ کۆتایی بوون و مەرگدا دەگەڕا، ئەنلیلی قارەمانی وتەکان و خوداوەندی سۆمەر، ئەو فریشتانەی کە لە سەر چیاکانی هیلکوندا هەڵپەڕکێیان دەکرد، چۆنیەتی زیندانی کردنی بوس لە لایەن تەئودوریکەوە و کاتێك کە چیرۆکەکانی برۆنو، شێخ بەدرەددین و حەلاجی مەنسوورم دەخوێندەوە، سەبارەت بەو مێژوویەی کە حەشار دراوەتەوە و حەشار دانەوەی توندوتیژی ئایینەکان و سەبارەت بەوەی کە ئایا هەر شت یارییەکی هەڵگەڕانەوەیە یا نا؟ لە خۆم پرسیارم دەکرد. زانینی ئەم شتانە تەنیا گەورەترین شت بوو کە بۆ من دەمایەوە. بۆیە تەنیا شتە نووسراوەکان پەیوەندییان بە ئێمەوە نەبوو. هەستمان بە کەم بوونی زۆر شتی پێویست دەکرد. چەندین دۆست و هاوڕێمان هەبوو، گەڤەزە (گەواد و پیاو خراپ) پلاتونییەکان باشتر ئاگایان لە شەیتانییەتەکانی سوقرات بوو، ئێمەیش بە هەر دوو دەستی واقعییەت و راستی خۆمانمان دەگرت.

ئەو وڵاتانەی کە خیاڵمان دەکرد و ئەو سەیر و سەفەرانەی کە دەمانکردن جار جار زۆر بوون بۆ دڵی ئێمە. جار جار تووشی ترس و دڵەڕاوکێ دبووین و لە تاریکی و زەنگی شەو و بێدەنگی شەودا بە ترسەوە سەیری ئاسمان و ئاسۆکانمان دەکرد و بێدەنگ دەبووین. زەینەب منی لەگەڵ خۆیدا بۆ سەفەرێکی دوور و درێژ بردبوو. ئەگەر وەکو ئەو کەسانەی بن کە لە ژێر کەسایەتییە گەورەکانی مێژوویشدا بپرووکیابانا بەڵام ئەوەمان دەزانی کە پێویستە جار جاریش بە چاوی ئەوانەوە سەیری جیهان بکەین. وا هەستم دەکرد کە هیچ دەنگ و رەنگێك بزر نەبووە و وا هەستم دەکرد کە لە ئاهەنگێکی کرۆنۆلۆژیکدا هەر هەمووی ئەو شتانەی کە فێریان بوومە لە بیریان دەکەمەوە. کاتێك کە لە نێو ئەو باخچەیەدا کە تێدا خەیاڵ و راستییەکان شاراوە بوون دەسووڕامەوە، لە راستیدا لەگەڵ دایك وباوك و کاکمدا دەژیام و لە نێو ژوورەکەی خۆمدا لەگەڵ کاکمدا بە سەرین و بالیف پێکەوە شەڕمان دەکرد و لە باوەشی دایکمدا دادەنیشتم و بۆ باوکیشم چایی دەم دەکردو دەمپرسی بۆچی شەکرەکان هەر هەموویان لە نێو یەك شوێنی گچکەی شووشەییدان و بۆ چی هەر هەموویان بەو جۆرە شکاون و چۆنە ئەو شەکرانەیان شکاندووە.

کاتژمێر ١٤ و ٣٠ خۆلەکی دوانیوەڕۆ بوو، کاتێك کە بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ چوومە تراسەکەوە لە دەرەوە شەپۆلێکی هاوسەنگی تەم بەرز دەبووەوە. وا سەیرم کرد کە ناسراوێك بانگم دەکات و چوومەتە ژووری ژوورەوەی ماڵەکەوە. ئەو مێزەی کە بەیانی جوانەکان لە سەریدا دانیشتبوون زۆر قەرەباڵغ بوو. دوو جوان بە شێوەیەکی محتەرەمانە سڵاویان لێم کرد. داوای فاسۆلیا بە رۆنی زەیتوون و نانی ساج و ماستم کرد. جوانەکانیش باسی ئەو فیلمەیان دەکرد کە دەیانەوەیست ئامادەی بکەن. ئەو فیلمە تۆزێك بە پێچەوانەی داب و نەریتی کۆمەڵایەتی بوو. پێکەوە دەیان گوت " نابێ لە بیرمان بچێت".

کاتێك کە بیرم بە فیلم کردنی ئەو شتانە کە نووسیبوون دەکردەوە روونی پەیوەندی پێوە کردم" ئەگەر نەمتوانی بگەمە ئاهەنگەکە بمبوورە". نەمتوانی شتێك بڵێم، بۆیە بە دەنگێکی نزم بانگی گارسونم کرد و داوام کرد چاییەکم بۆ بێنێت. بێ هیوا بوون و بێ خەیاڵ بوون هەر وەکو نەمانە. ئەی منداڵی ! یا هەستی هەست پێکردن و لەیەك دانەوەی مرۆڤ، حەز کردن و خۆشەویستی کە هەستی بە باوەش کردنی دونیای دەرەوەی خۆمانی بە ئێمە بەخشیوە... هێز و خەیاڵ و ئاوات، هەر وەکو بەشێك لە مرۆڤ، کاتێك کە باس لە قۆناخەکانی رابردوو دەکەین دەبن بە هۆکاری ئەوەی کە بە بێ کەمووکوڕتی رووبەڕووی زۆربەی راستییەکان و رووداوەکان ببینەوە. ئایا ئایینی هاوبەشمان کە مەتۆلۆژیایە یەکەمین پایەی هاوبەشی هونەر و فەلسەفەیش نییە؟... ئەلیاذا کە لە بەر رەق و کینی ئاخیلۆس دەستی پێکردووە و خۆشەویستییە لە

رادەبدەرەکەی پاریس و هەلەن، پاریس کە هەلەنی لە رێ دەرکردووە و رەفاندوویەتی، ئایا ئاختیلۆس کە سەمبۆلی ئەم ناکۆکییەیە یا هەکتۆر بە هۆی رەق و کینی خۆیەوە شکەستی بە دانیشتوانی ترویا نە هێنا؟ بۆ چی مرۆڤ ئەوانی دیکە دەکوژێت؟ مرۆڤ بۆ چی دەیەوەێ شکست بە ئەوانی دیکە بهێنێت؟ مرۆڤ بۆ چی هەست بە داواکردن دەکات؟

کاتێك کە زەینەب ئەو وتووێژانەی منی لەگەڵ خانەوادەکەمدا کە تا ئێستا هیچ کەس نەیبیستبوون دەیبیست تووشی دڵەڕاوکێ و ترس دەبوو، منیش دەمگوت هەستی لەگەڵ ئەوان بوون رۆحی من دەخوات. ئەو نهێنییانە کە لە نێو بێدەنگی ماڵەکاندا خۆیان حەشار دابوو هەر یەکیان خاوەن گۆرانییەکی خەم و پەژارە بوون، کاتێك کە ئێمەش ئەم گۆرانییانەمان دەگوت یەکترمان بە باوەش دەکرد. دایکم لە بەر مانگەشەو هەر شەو قژەکانی منی شانە دەکرد و باوکیشم تووتنی دەپێچاو دوعای دەکرد و هاوکات کاکیشم بە ئەسپە نەجیبەکەی خۆی دڵی تاریکی شەوی کون دەکرد و دەڕۆشت. دواتر هەر وەکو جاران هەڵدەستام و بەرەو پەنجەرەکە دەچووم. دیوارە بە هەیبەتەکانی شار کە نێش و ئازار و خۆڕاگری چەندین ساڵەیان لە نێو خۆیاندا کۆکردبوویەوە دەبوون بە قەرەباڵغیەکی مەحشەری. ئەو قەرەڵەباڵغیەی کە خودا نەیدیتبوو و حەزی لێ نەدەکرد. سەرم دابوو سەر جامەکەوە و بۆ یەکەم جار ئەو شەوە بیرم لەوە کردەوە کە خوداوەندەکانیش زۆربەی جاران نادادپەروەرانە هەڵسوکەوت دەکەن. کاتێك کە هەستم بە هێزی دامەزراندنی وڵات لە لایەن مرۆڤەکانەوە کرد، ئەو کاتە لە ژێر هەر هەموو راستییەکان خەتێکی باشم کێشا، چونکە راستییەکان دەبوون بە هۆکاری ئازاد کردنی مرۆڤ. هەر رۆژ دەمەویست هەنگاوێکی دیکە بڕۆم بەرەو ئەوانی دیکە کە دووری من بوون. لە راستیدا ئەو شتەی کە نەیدەتوانی فەلسەفە و دیالکتیك و رووی راستەقینەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ئاشکرا بکات، شەڕە بێ زەمانەکانی ترویا بوون.....

لە ئەزمی سەرەوە بوونی ماڵەکەمان دەبوو بە هۆکاری هەستی جۆراوجۆر. لەو شوێنە باریکەدا کە شین و سەوز تێکەڵی یەکتر دەبوون، باڵندەیەك هەبوو، لە نێو خەمۆکییەکی زۆر قووڵدا بێ کەسی خۆمم بە هەر دوو دەست دەگرت. بارانی زەرد هەستەکانی منی تەڕ دەکرد لە کۆچبەری و پەنابەریدا. وا بیرم دەکردەوە کە کاتژمێرەکەی سەر دیواریش هەر وەکو راهێبە فێڵبازەکانی سوومەر دەبێتە کات و تێپەڕ دەبێت. کاتیش وەکو سۆندەیەك، وەکو بێ کۆتایی بوو.

سەوزەمەنی و پێداویستییە زەروورییەکانی خۆمان لە نێو گوندا دەهێنا، هەم ئەرزان بوو هەم تازە بوو. ماست و هێلکەکانمان لە سەوێ و مێوەکانیشمان لە سلحو و سەوزەکانیشمان لە گولێ ددان زێڕین دەکڕی. کاتێك کە وتووێژە سەرپێیەکانمان درێژ دەبوون چایەکی باشمان دەخواردەوە.

سەویٚ پادشای چرچ و لووچەکان بوو، دەیانگوت لە بەر نەخۆشییە، سەرەڕای چرچ و لووچەکانی، زۆر حەیرانی دەنگە جوانەکەی بووم. کاتێك کە هەر جار هێلکەی هەرە باشی بۆ ئێمە هەڵدەبژارد گۆشتی قەراخی چاوەکانی منی دەترساند. پاك و خاوێن بوونی دەسکدارەکانی سەرنجی هەر کەسی بۆ خۆیان رادەکێشا. گولیٚ و سلحۆیش هەمیشە پێکەوە شەڕیان بوو و هەر وەکو گوللەی شێت بوون. گولیٚ لەگەڵ پیاوێك کە لە تەمەنی باوکیدا بوو ژیانی هاوسەری پێك هێنابوو و سلحویش لە دوای مردنی برا گەورەکەی لەگەڵ براژنەکەی خۆیدا هەر لە تەمەنی منداڵی ژیانی هاوسەری پێك هێنابوو. گولیٚ مەمە گەورەکانی خۆی دەردەهێنا و شیری دەدا بە منداڵەکەی و بە مەبەستی تۆڵە کردنەوە لە مێردەکەی زۆر قسەی خراپی پیٚ دەگوت. لە نێو هەم تەمەنەکانی خۆیدا هەر وەکو ماینێك هاوارو ناڵەی دەکرد. سلحو کە باشترین مێوەکانی بە مێردەکەی گولیٚ دابوو، سەربەسەری گولیٚ دەنا و دیگوت" ئەمڕۆ کەم جوێنت داوە". هەر کەس دەیزانی کە بۆنی بیٚ غیرەت دەستی نەداوە ژنە جوانەکەی. کاتێك کە دەیزانی لە پشتی جوێن و قسە خراپەکانی گولێیەوە حەزکردن و خۆشەویستییەك هەیە بە ئەنقەست لەگەڵ گولێدا دەستی بە دەمقاڵە دەکرد.

ئێمەیش زۆر بە شتە وردەکانەوە خۆمان سەرقاڵ دەکرد. بێگومان ئەمە دەبوو بە هۆی چالاك بوون و زیندووبوونەوەی ئێمە. چۆنیەتی بەکار هێنانی تۆنی دەنگ و ئەو وشانەی کە هەڵدەبژێردران، وتە نا مەعلوومە ژێر لێوەکان، پیاسە کردنەکان و لە هەر هەمووشیان گرنگتر سەیر کردنەکان بوون. ئەمانە بۆ ئێمە زۆر گرنگ بوون. ئەو شتە کە دەبوو بە هۆکاری باوەڕ کردنی ئێمە بە هێزی زانابوون و زانیارییەکان تەنیا و تەنیا ترس بوو.

کاتژمێر ۱۵ و ۲۰ خولەك چوومە نێو باخچکەوە، بڕێك بۆنی خۆشی گوڵەکانم بۆ ناخم هەڵکێشا. شەوبۆکان، گوڵە سوورەکان و مەنەکشە و وەنەوشەکان هەر وەکو ئەوەی کە ناسراون سەیری منیان دەکرد. ئەو دووربینە کە بە دارەکەوە هەڵواسرابوو چاودێری دەڤەرەکەی دەکرد. کاتێك کە ئەو بێژەرە کە ناویٚ تێکەڵی گەندەڵییە گەورەکان ببوو و لە دونیادا دەناسرا بەو روخسارەی خۆیەوە هەر وەکو باران پرسیاری ئاراستەی هونەرمەندی ناسراوی عەرەبی دەکرد، ژنە هونەرمەندەکە بە شێوەیەکی ئازادانە دەکەنیا و بۆ ئەو پیاوانە کە بە لێشێواوی سەیری ئەویان دەکرد بە دەست ماچی بەرێدەکرد. هەستکردن بە غرووری سوودمەند بوون لە نیعمەتەکانی گەردوون بەبیٚ ئەوەی کە برۆیتە لووتکەی چیاکانی پیاوەتی و پیاگەری شتێکی زۆر گرنگ بوو.

من بڕێك بیرم لە ژنەکانی دەڤەرەکەی خۆمانم کردەوە، ئەو ژنانەی ئێمە کە حەزیان لە هەستکردن و ئاواتکردن و هەڵبژارتن دەکرد بەڵام لووتیان بڕابوو و بە بێدەنگی دەکوژران یا رووبەڕووی سزای رەجم دەبوونەوە ،یا لە نێو بێدەنگی ئێش و ئازارەکاندا نوقم دەبوون...

کاتێك کە من پرسیم " ئەگەر مردن نەبووبایا چ دەبوو؟" زەینەب چاوەکانی خۆی هەڵدایەوە و وتی" ئەو کاتە خوداوەندەکانیش نەدەبوون و لە راستیدا ئێمە بۆ خۆمان دەبوون بە خوداوەند". زەینەب وتی" خوداوەند بە ئافراندنی ئێمە هەبوونی خۆی سەلماندووە و هەبوونی مەرگیش شتێکی زۆر باشە. "

مرۆڤ پێکهاتەی هەبوون و نەبوون و بێ کۆتایی بوونی هەبوونە. رابردوو بە ئەوەندەی بۆشاییە شینەکە بێ کۆتاییە. کاتێك تێگەیشتم کە یەکێك لەو کەسانە کە زۆر بیری لەو ئەستێرانە کردووە کە بە ئەوەندەی ئەوەی کە لە پەنجەرەکەوە بسووڕێنەوە و بێنە نێو ماڵەوە، تالس بوویە، ئەو کاتە تێگەیشتم کە لە سەر تابەلاکان و پاپیرۆسەکاندا کێ چی نووساندووە؟ چەندەی ئەو نووسینانە گەیشتنە رۆژی ئەمرۆمان؟ میسرییەکان هەیەروگلیف و چینییەکانیش ئیدەئۆگرافی و مایەکانیش نووسینی مێخییان خۆلقاندووە. ئەو هەڵبەستانەی کە لە نێو کونی ئاسنی ئاسنکارەکان لە کاتی لەحیم کردندا دەهاتنە دیتن نیشانەیەکی هەمیشەیی راستی و واقیعیەتی هونەر بوون لە کاتی دەرکەوتنی زانستی رووناکی و حەیاتدا...

ئەو هێلکە ئەزەلیەی کە رووناکی دەخستە سەر نووسینەکانی شارە ئەنتیکەکانی نێو قووڵایی زەوییەوە، نیشانەیەك بوو بۆ سەداقەتی هەبوونی ئوسیریس و ژنە بەوەفاکەی ئیسیس. ئیسیس کە لە ئوسیریس دوو گیان بوو کاتێك کە جەنازە چواردە پارچە کراوەکەی مێردەکەی خۆی کە لە لایەن سیسەوە خرابووە نێو سەندووقەوە دەدۆزێتەوە، سێزدە پارچەی لەیەك دەداتەوە. بە پێی ئەو نووسراوانەی کە لە سەردەمی فرالیەتدا بەجێ ماون ئیسیس وتوویەتی" ئوسیریسم من بۆ تۆ دەرۆم و لە نێو ئەو ژوورەدا چاوەڕوانی میانجیگەرییەکی تۆ دەکەم.... خوداوەندەکان لە گەڵ مندا دەژین، چونکە ئەو گەنمەی کە ئەوان پشتیان پێ بەستووە من لە سەر سەریانەوە گەورەی دەکەم". بە راستی ژیان کردن و مرۆڤ چ شتێکی سەرنج راکێشن !

دەنگە ریتماوییەکەی باران خۆشییەکی تایبەتی دەدا بە دڵی من، بەڵام ئەم خۆشییە دەم درێژ نەدەبوو. بە هۆی ئەوەیەوە کە مەبادا ئەجندەیەکی ئەترس من بترسێنیت من لە تاریکی شەو زۆر دەترسام، کاتێك کە زەینەب بە درێژ کراوەیی نوقمی خوێندنەوەی کتێبەکانی دەبوو منیش بە ئەنقەست دەستم بە هاوار و قەرەباڵغی دەکرد و لە نێو ماڵدا دەسووڕامەوە. زەینەب لە تەمەنی جوانی خۆیدا کچێکی رێکوپێك و جوان بووە و بەو قژە درێژە مۆرەکانییەوە کاتێك کە دەرکەوتووە، هەر هەمووی ئەو کەسانە کە لە نێو دووکانەکاندا خەویان پێکەوتووە بە شوور و هەیەجانەوە خۆیان داوە بەر دەرگای دووکانەکان و سەیری زەینەبیان کردووە. هەر چەندە زەینەب بە مەبەستی پەسەند کردنیشی رۆیشتبێت، بەڵام هەمیشە لە بەرانبەر ئاوێنەکەدا

سەری خۆی جووڵاندووەتەوە و وتوویەتی"هۆشیار بە فیز بە جوانی خۆت مەکە و عەقڵی خۆت بە کار بهێنە و ببە بە خۆت." (مەبەست خۆ ناسناندن و ڕەچاو کردنی کەسایەتی خۆیەتی. وە). کاتێك کە زینەب ئەم شتانەی بە خۆی وتووە تەمەنی ١٧ ساڵ بووە. دایکی زەینەب هەمیشە بە بیانووی ئەوەی کە زەینەب کاری نێو ماڵی نەکردووە لە زەینەب تووڕە بووە و پێ وتووە تۆیش وەکو باوکت نەخۆشی کتێب خوێندنەوەت پێیە، هەر بۆیە هەمیشە باوکی زەینەبی تاوانبار کردووە. کاتێك کە باسی لەوە دەکرد کە لە بەر مانگەشەودا کتێبی خوێندوەتەوە و دایکی دەستی بە بۆڵە بۆڵ کردووە دەکەنیا. ئەو کاتە ئێمەی ژن هەستمان بەوە کرد کە ژنەکان کاتێك کە بە عەقڵی خۆیان قسە دەکەن ئەوکاتە دەتوانن ئێش و ئازارەکانی خۆیان کەم بکەنەوە نە ئەوکاتەی کە بە جەستەی ژنانەی خۆیان قسە دەکەن.

بە مەبەستی گاڵتە کردن بە پەنابەر بوونی زەینەب مولکیەیش وتبووی " منیش پەنابەرم". هەوڵم دەدا لە سەر خۆ بم. هەر دووکمان لە سەر ئەو هێڵە باریکەی جیا بوونەوەدا بوون. هەم پێکەوە، هەم جیا، هەم بە هێز و هەم بێ هێز.... نەخۆشخانە و مەکتەبەکەم لە یەك تەپەدا بوون. ئەو باڵە فڕانەی کە بە دەنگی ناشیرینی خۆیان لە نێو بێدەنگی شەودا هاتوچۆیان دەکرد، ئێمەیش دەنگی خۆمان کز دەکرد و لە نێو دۆڵە وشك بووەکەدا شەپۆلی تۆز بەرز دەبووەوە. تەنیا هەبوونی ئێمە بوو کە خۆی بە سەر تەنیایی ئێمەدا فەز دەکرد. کاتێك کە بە لەنجە کردن هاواری دەکرد دەستمان بە باوەڕییەکان و هیواکانمانەوە دەگرت، بەم هەڵوێستەی ئێمەوە جۆرەیەك لە دەسەڵاتداری دیار بوو. قەبوولکردن و پەشیمانبوونەوە، ئەو ڕەق و کینە بە هێزەی کە لە بەرانبەر دونیا لە نێو ئێمەدا هەبوو، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گەورەتر دەبوو و جێگای خۆی دەیدا بە هەست و ویستەکانی ئازادی لە نێو دڵی ئێمەدا. لەم کات و ساتانە ئەو شتەی کە خاوەن کاریگەری بوو دونیای دەرەوەی ئێمە بوو. تێگەیشتن لەم ڕاستییە بە مانای کەشفکردنی قەراخەکانی ئازادی و پیوانەکانی ئازادی بوو. هاوکات ئەم کەشفکردنە بۆ خۆی بە مانای ڕێڕەوەیەکی دوور و درێژیش بوو.

ژووره گچکەکەی ئێمە کە سەیری باخچەکەی دەکرد، ئەو وتە جەوهەریانەی کە بە دیوارەکانییەوە هەڵواسرابوون و هەڵبەستەکان و ئەو سەندووقە گچکەیە کە لە پێستی دەریا دروست کرابوو، هەڵهاتنی نهێنییە لە بیر کراوەکان هەر هەموویان وەکو تەنیا شاهێد حاڵی بێ زمانی بازرگانی کردن بە کۆلەکان راوەستیابوون. لە نێو شەوە درێژەکانی زستاندا سۆبەکەمان پڕ دەکرد، بە هەستی دوور بوون کە لەگەڵ شەوە سپییەکاندا دەهات سەفەری دونیامان دەکرد و لەو شار و وڵاتانەی کە جێ پەنجەیان لە نێو مێژوودا دیارە هێزمان وەردەگرت بە تایبەتی

کاتێك کە لە شوێنی ئەو هونەرمەند و هزرمەندانەی کە کاریگەرییان لە سەر ئەو وڵاتانەدا کردبوو، بەردەوام دەبووین لە لێگەڕین و سەیر کردن، لە کاتە ساتێکی بەمجۆرەدا ئەو متمانەی کە لە لایەن باوەڕییە کوێرکوێرانەکانەوە درابوو پێمان دەبوو بە هۆکاری برینداری کردن و سەقەت کردنی سەداقەتی ئێمە. ئەم برینانە هەر چەند ئێش و ئازاریشیان هەبوو بەڵام ئێمەیان بۆ لایەکی دیکە رادەکێشا.

کاتێك کە ژێر دارەکانم لە نێو باخچەکەدا خاوێن دەکردەوە باسی ئەکرەمم بۆ زەینەب کرد. زەینەب لە لای شانیەوە سەیری منی کرد و دەستی بە زەردە کەنێك کرد. لە ژێر سێبەری دارەکاندا دانیشتین و پێکەوە قسەمان کرد. تەمەنمان نزیکی ٣٠ ساڵ بوو. کاتێك کە لە کۆتایی حەفتاکاندا ئەکرەم دەهات تێر پێکەوە قسەمان دەکرد. چەند ساڵێك دواتر لە کۆنگرەیەکدا چاوم بە زەینەب کەوت و ئەو کاتە ژیانی ناوچە بێکارەکەمان و شەڕ و پێکدادانەکان و ئەو کاتە کە لە ترسدا باوەشمان بەیەکترەوە دەکرد هێناوە بیری خۆمان. مولکییە وتی" لەو شەوەی ئانکارا کە پوورێکی زەینەبیش تێدا دەژیا و ئەو شیرینی و باقلەوایانەی کە سەرەتای مانگی کانوونی یەکەم لە نێو ئانکارادا دەمان خواردن...... ئەو منداڵانەی کە شیرینی و باقلەوایان دەدزی دەیان گرتن و ئەشکەنجەیان دەکردن و دەیانبردن بۆ زیندان و ئەو چەتانەی کە بە رۆژی روون دەستیان بە دزینی پارەی خەڵك دەکرد دەوڵەتیان بە رێوە دەبرد. کاتێك کە ئەمانە هەر هەموویان بە بیرمان هاتنەوە جارێکی دیکە هاتینە لای یەکتر و هەر وەکو راگەیندراوەکانی رابردوو جارێکی دیکە دەستمان بە مۆر کردنی راگەیندراوەکان کردەوە و لە نێو خۆپیشاندانەکاندا یەکترمان دەدیت."

بۆ یەکەمجار من لە رێگای وێنەوە مولکییە و ئەکرەمم ناسین. مولکییە باڵابەرز و قەد باریك و ئەکرەمیش قژ فرفڕی بوو، دوای ئەوەی کە مولکییەم ناسی ئەو کاتە تێگەیشتم کە عەلەوییەت چییە. مولکییە سەیری وێنەکانی ساڵی ٨٠کانی دەکرد و منیش بیرەوەرییەکان و نووسینەکانی مولکییەم دەخوێندەوە. گەرمای نێو وێنەکان هەر وەکو ئەوەی بوو کە بتوانی بە دەستەوە بگری. ئەو روخسارە پڕ لە متمانانە و پڕ لە پێکەنین و ئەو نێوچاوانە بە بڕیارانە کە لە نێو تاریکی شەودا قسەیان دەکرد. ئەو مشت و لەقانەی کە لە نێو هەوادا بەرز دەبوونەوە و جموجووڵی ژنەکان زۆر سەرنج راکێش بوو. لە سەر دوو خاڵ کە دەبوونە هۆکاری جیا کردنەوە ژنەکان بیرم دەکردەوە: مەمکەکان و قژەکانیان. کاتێك کە وتم" مەمکی ژنانی ئەو کاتە زۆر گچکە بوونە" زەینەبیش کە لەو لاوە سەیری ئێمەی دەکرد دەستی بە پێکەنین کرد.

یەکەمین پیشووی من بوو، ئەو کاتەی کە چەتەکانی مەرگ باڵیان بە سەر ئەستەنبوولدا کێشا بوو، ئێمەیش سەردانی ئەستەنبووڵمان کرد. ئەو ئەستەنبووڵە کە لە نێو فیلمەکاندا

دیتبووم هەر وەکو خەیاڵ بوو بۆ من. هەر وەکو ئەوەی کە بە ساڵانە ئەکرەم و مولکییە دەناسم باوەشم پێیانەوە کرد و ماچم کردن. روخسارەکانیان کە پڕ بوون لە باشی هێزیان دەدا بە من. جار جار بە دوای دانیشتوەکانی بوزکرماکدا دەگەڕیام کاتێك کە مرۆڤێکم بە شەلوار و کەفیەوە دەدیت وامدەزانی دانیشتووی بوزکرماکە بۆیە هەر زوو دەمەویست برۆم بۆ لای.

هاورێکانی زەینەب زۆر دڵ گەورە و بە وەفا بوون، لە ئەستەنبوول، ئانکارا، بودرۆم، ئالآنیا، وان و حەکاریدا ژمارەیەکی زۆر مرۆڤم دەناسی. ئەکرەم لە نێو ئەو باخچەیەدا کە سەیری خانووە تەجاوزەکانی دەکرد سەرقاڵی کۆکردنەوەی گیا بوو و مولکییەش سەوزەواتی کۆدەکردەوە. کاتێك کە زەینەبیش لە ژێر چارداغەکەدا سەرقاڵی ئامادە کردنی سەلاتە بوو، هەتاو کە بەرەو ئاوابوون دەرۆشت لە نێو دیواری باخچەکەدا دەلەرزیا. بۆنی بخورد لە نێو ئەو حەوشە گچکانەدا کە یەکتریان ماچ دەکرد بەرزدەبووەوە. بێجامە دراوە بێرەنگەکان، بەردە گچەکە تەڕەکان، دەرگا تەنەکەییەکان، ماڵە خاوەن پەردەکان و جیڕە جیڕی دەرگاکان و دەنگی کەڵەشێرەکان زۆر شتی دەهێنایەوە بیری من. جار جار دەنگە شەرکەرەکانی ولآتی خۆم دەبیست. کاتێك کە لە بەرەبەیاناندا هەڵدەستام و بەو جوێنانەی کە بە زمانی زگماکیم پێم دەدران رۆخسارم سوور دەبووەوە، ئەو کاتە تێگەیشتم کە جوێنە تورکییەکان ناتوانن کاریگەری لە سەر من بکەن.

ناوی هەر هەموو ناوچە و دەڤەرەکان دەگۆڕدرا، ئۆرفا " شانلی" مارەش " قەهرەمان"، عەنتاب " گازی" بوو، زەینەب ئەم شتانەی زووتر بە من گوتبوو. کاریگەرییەکانی شەڕ لە دەرەوەی عەنتاب بە تایبەتی لە نێو رێگاکاندا زۆر دیار بوو. خاڵەکانی پیشکنین و تابوورە سەربازییەکان و تەفتیش کردنی سەربازەکان، بە درێژایی رێگا کونترۆلکردنی ناسنامەکان و ئەو جاشانەی کە دەستیان بە سەر زاوزێ و ماڵ و ملکی ولآت پەروەرەکاندا دەگرت، هەر هەموویان بەرهەمی شەڕبوون. کێ لە بەرامبەر کێ دەیویست سکالآ تۆمار بکات... نە کەسێك دەیویست ئەمە ببینێت و نە کەسێکیش دەیویست ئەمە ببیستێت. لەکاتی سەفەر کردن بە پاسەکان زۆرتر یەکترمان بە باوەش دەگرت. کاتێك کە سەری خۆم دەخستە سەر شانی زەینەب وا هەستم دەکرد کە لە سەر قەلآیەکی زۆر بەرزدا دەژیم. لە هەر شوێنێکی دانیشتن و نان خواردندا دادەبەزیان، توالێتە پیس و قیزەونەکان و رستۆرانتەکان جار جار دڵی مرۆڤیان تێك دەدات، شرۆڤە کردنی چرچەکانی روخساری مرۆڤەکان بۆ من و زەینەب ببوو وەکو یارییەکی خۆش. کاتێك کە چرچەکانی روخساری مرۆڤەکانمان هەڵدەسەنگاند زۆربەی جارانیش بە پێ ئەو چرچانە سەبارەت بە ژیانی ئەو مرۆڤانە تەخمین و هەستەکانی خۆمانمان دەردەبڕی و دەمانگوت" ئەمە مامۆستایە، ئەمە تێکۆشەرە، ئەمە جاشە، ئەمە فێلبازە و ئەمە بازرگانە.....

جارێکیان لە بەردەرگای گەراجێکی پیس و پۆخڵدا تێپەڕ دەبووین و منیش لە سەیر کردنی پیاوەکان زۆر تووڕە ببووم هەر بۆیە زۆر بە توندی دەستی زەینەبم دەگرت. زەینەب کاتێك کە چاوەکانی کە نەخۆشی نزیك بینییان (میووب) هەبوو بۆ شوێنە دوورەکان دەگەڕاند حەسابی بۆ هیچ شتێك نەدەکرد. پۆلیسێك هاتە لامان و بە دەنگێکی سەیر و سەمەرە وتی" خاتوون پیاسە دەکەن بۆ ئێوە خۆش نییە، چونکە پیاوەکان وا هەست دەکەن ئێوە ژنی بەد فعلن." کاتێك کە پۆلیس وای گوت" روخساری زەینەب لە ناکاوەوە ترش بوو و دواتر وتی" هم هم" و وەڵامی پۆلیسەکەی نەدایەوە. بە نەفسییەتی تاوانبارێك سەیری پشتەوەی سەرم کرد و زەینەب وتی " بێدەنگیش جۆرەیەك لە وەڵام دانەوەیە".

دوای ئەوەی کە زەینەب بوو بە ئەندامی دەستەی راوێژکارانی کۆمسیۆنی نێونەتەوەیی ژنان، زوو بە زوو سەردانی شار و شارۆچکە و ناوچەکانی دیکەمان دەکرد. فەقیر و هەژار بوونی دووکانەکانی ناوچە دوورە دەستەکان کە لە نێو جادە بێ چاڵ و چۆڵەکاندا دامەزرابوون... ئەو پیاوانەی کە شەو و رۆژ لە نێو چایخانەکاندا بوون و تەسبیحیان دەکێشا جار جار رادەبوون و پیاسەیەکیان دەکرد و لە نێو ماڵەکانیشدا جارجار مرۆڤە ترساوەکان بە شێوەیەکی ترساوی سەری خۆیان دەردەهێنا. لەوەی کە بتوانین بۆیان بسەلمێنین کە ماشینەکەی ئێمە ماشینی کەسایەتییە سیاسییەکان نییە تەنگاو دەبووین، بەڵام کە متمانەیان پێ دەکردین لە دڵەوە پێشوازی ئێمەیان دەکرد. لە ژێر چادرە رەشەکاندا کاتێك کە ماڵ یا حەوشەکانیان خاوێن دەکردەوە دامەنی کورت و مانتۆ و یا پانتۆڵیان لە بەر دەکرد.

هاوسەری کارمەندێکی ناوچەکە وتی" تەمەنم ٤٠ ساڵە و تا ئێستا پێکەوە لەگەڵ مێردەکەم نەچوومەتە بازاڕ و کاتێك کە کوتاڵ فرۆشەکان دێن ئەو کاتە جل و بەرگی خۆم دەکڕم". ئەو نەسڵە نوێیە تازە پێگەیشتووەکان عسیان دەکەن (مەبەست دەربڕینی نارازی بوونە.وە) " دەزانی ئەو مێردانەی ئێمە کە لە نێو چایخانەکاندا دادەنیشن و باوکەکانی ئێمە چۆن ئێمە دەناسن؟" " لە شێوەی بە رێوە چوونی ئێمە یا لە جۆری پێڵاوەکانی ئێمە" بەبێ چارشەف یا چادر رۆیشتن بۆ بازاڕ بە مانای مردنە". ئەو کچانەی کە قۆناخی سەرەتایی خوێندنیان تەواو کردووە بۆ خۆیان وا بیریان دەکردەوە کە زۆر خاوەن شانسن و خەیاڵی ئەوەیان دەکرد کە لەگەڵ ئەو مامۆستا یا ئەو دکتۆرانە کە دێن بۆ ناوچەکەمان ژیانی هاوسەری پێکدەهێنن. ئەوانەی کە متمانەیان بە جوان و خۆشك بوونی خۆیان هەیە بۆ ئەوەی کە بتوانن ئەو مامۆستا یا ئەو دکتۆرانە بخەنە داوی خۆیانەوە دەستیان بە هەر جۆرە کارێکی

سەرسورهێنەر دەدا، بۆ نموونە لەگەڵ ئەو مامۆستا یا ئەو دکتۆرانەدا پەیوەندی جنسییان ساز دەکرد و بەمجۆرە پەردەی کچینی خۆیانیان لەدەستدەدا هەر بۆیە دکتۆر یا مامۆستاکانیش ناچار دەمان کە لەگەڵیاندا ژیانی هاوسەری پێکبهێنن.

کاتێك کە بە مەبەستی دیتنی ئەو ژنانەی کە لە نێو ئاتۆلییەی دروستکردنی فەرش کە بە هاوکاری سندووقی نێونەتەوەیی دامەزرابوو کاریان دەکرد سەردانی ئاتۆلیەکەمان کرد، نیوەڕۆ بوو و ئەو ژنانەیش لە سێبەری دارە پڕ لە تۆزەکاندا نانیان دەخوارد. زۆربەی هەرە زۆریشیان تەمەنیان زۆر گچکە بوو. بەو پەنجە گچکانەی خۆیانەوە تاو دەرزییەکانیان زۆر بە شێوەیەکی لێهاتوانە بەکار دەهێنا. ئەو قوتابخانە کۆنە کە لە تەنیشت ئاتۆلییەکەدا بوو هیچ مەرجێکی تەندروستی تێدا بەدی نەدەکرا. کاتێك کە ئێمەیان دیت دەستیان لە کار کردن شل بوو و روخساریان سوور دەبووەوە و دەستیان بە سەیرکردنی گوماناوی دەکرد. مامۆستاکەیان خاتوو نەزاحەت کچێکی زۆر بە تەمەن بوو. چەند کورس و ناوەندێك کە متمانەی پێ بوون بە ئێمە ناساند. کاتێك کە لەو ماڵەی کە وەکو قووتی بوو خواردنی ئامادە دەکرد و پێشکەشی ئێمەی دەکرد زۆر هیوادار و گەش بین بوو. کاتێك کە سەیری ئەلبوومی وێنەکانمان کرد چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك وتی" ئاخۆ من بەمجۆرە بووم؟ هەمیشە جلی جوان و شیکم دەکردە بەر و زوو بە زوو دەڕۆیشتم بۆ شانۆ و سینەما، ئەو کاتە دەسگیران بووم، ئەو رۆژەی کە بڕیار بوو من بگوازنەوە، دەورووبەرمان زۆر قەرەباڵغ بوو، بەڵام ئەو کەسەی کە بڕیار بوو ببێتە مێردی من ئەو رۆژە هەر دوو پێ خۆی خستە نێو یەك پێڵاوەوە و وتی" پێویستە ئەو کچەی کە دەبێتە ژنی من ئیتاعەتکاری من بێت و ئەمرەکانی من یەك بە یەك جێبەجێ بکات". ئەو چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کە من دەست بە گریان دەکەم و دەپاڕێمەوە، بەڵام منیش هەر شتێکم دابوو بەرچاوی خۆم و سەرم بۆ نەنەواند. ئەمە کارێکی زۆر ئاسان نەبوو لەگەڵ خانەوادەکەی خۆمیشدا زۆر شەڕم کرد و خزم و کەس و کارەکانی منیش لە من دوور کەوتنەوە. منیش کەوتمە نێو خەم و پەژارەیەکی زۆرەوە، ئەوەندە لە نێو کۆرس و خۆلەکاندا وانەم وتەوە تا بووم بە مامۆستای خۆلەکان. لە نێو شارەکەی خۆمدا نەمام و بارم کرد هاتم بۆ ئەم ناوچە دوور دەستە. لێرەدا زۆر خۆشحاڵ و ئاسوودەم. جنسی پیاوم لە نێو ژیانی خۆمدا رەش کردوەتەوە. من داب و نەرییتەکانی ئەم ناوچەیەم پەسەند کرد و هەر وەکو ئەوان جل و بەرگم دەکردە بەر خۆم. کاتێك کە وتی" دارم بۆ دەبڕنەوە و زۆربەی کارە سەختەکانی من جێبەجێ دەکەن" لە دەنگەکەیدا دیار بوو کە زۆر ئێش و ئازاری کێشاوە.

دانیشتوانی ناوچەکە هیچ مەجالّیان نەدەدا کە ئێمە بە دەست خالّی بگەڕێینەوە، هەمیشە، پەنیر، نانی تەنوور یا گوێزیان بۆمان دەهێنا و مافی ئەوەیشیان پێ نەدەداین کە بلّێین ناتوانین ئەم شتانە لەگەڵ خۆماندا ببەین. کاتێك کە سەیری دەشتە بێ کۆتاییەکەم دەکرد هەستم بە غەریبی خۆم دەکرد و لە وشەی زەمان و کات باشتر تێدەگەیشتم. بە بیانووی نووستن سەری خۆم لە سەر کوشینی ماشینەکە دادەنا و دەگریام. بارانی زەرد بە سەر سەرمدا دەباریا و لە نێو جەستە مۆر بووەکاندا دەسووڕامەوە.

زانا بوون و زانیاری بە مانای خاوەن هێز بوونە. رووبە روو بوونەوە لەگەڵ خۆماندا بە مانای هۆشیار کردنەوەی دەوڵەتە خەوتووەکانی نێو دڵی خۆمان بوو. ئازاد بوون و سەربەست بوونی ئێمە بە بێ کاریگەرهێشتنی ئەم دەوڵەتانە دەستی پێدەکرد.

ئەو گوندیانە کە لە سەر رێگاکاندا چاوەڕوانیان دەکرد زۆر وەکو یەکتر بوون. کاتێك کە سەیری ئەو توانەییان دەکرد کە تازە کۆڵایان بوون و لە نێو گیرفانی پانتۆڵی خۆیاندا تووتونیان دەردەهێنا و دەیانپێچا، پێکەوە قسەیان دەکرد و ئەو کاتەیش رەشەباکان باڵەکانی ئەسپەکانیانی ئەم لا و ئەو لا پێدەکرد. لە ماڵە خاکییەکاندا بۆنی نەم و کێل دەهات. بە هۆی کاریگەری فیلمە سینەماییەکان، لە کڕینی شت و مەك چاو و هاوچاویی یەکتریان دەکرد و خەیاڵی ئەوەیان بۆ خۆیان دەکرد کە لە نێو شاردا دەژین.

کاتێك کە بە تراکتۆر لە گوند بۆ گوندێکی دیکە دەڕۆیشتین تووشی دڵەڕاوکێ دەبووین، تەفتیش کردن و کۆنترۆڵ کردنە بێ کات و ساتەکانی جاشەکان و سەربازەکان مرۆڤیان ئازار دەدا، هەر جار کە کۆنترۆڵیان دەکردین شوێنی لە دایك بوونی زەینەب بۆ ئێمە دەبوو بە هۆکاری ئاسانکاری. هەندێك جاریش چاوی سەربازەکان دەدرەخشایەوە و دەیانگوت" هەمشەهرین" (هاوشارین.وە) هەر بۆ ئەوەی کە بلّێن کۆنترۆڵ دەکەن چەند خولەیەك رایاندەگرتین. فێری بنکەکانی پۆلیس، لێپرسینەوەکان و هەڕەشەکان ببوون. کاتێك کە سەیری قووڵایی خەتەکانی نێو چاوانی زەینەبم دەکرد ئەو کاتە تێدەگەیشتم کە من کچێکی گچکە نیمە و کاتێك کە لەگەڵ زەینەبدا بەڕێوە دەچووین لە ناخی خۆمدا دەمگوت " ئەوەندە گەورە بوومە". لە کاتی نووستندا زۆر تەنگاو دەبووم، بۆ پەڕینەوە لە چاڵە گەورەکاندا ژماردنی ژمارەکانیش نەیدەتوانی کاریگەریم لە سەر بکات. بە شەوان لە بەر سێبەری دەستەکانم لە ژێر گلۆپەکاندا یاریم دەکرد و خۆم لە ناخی خۆمدا زیندانی دەکرد. کاتێك کە بیرم لە هاورێ مەدەنی و پێشکەوتووەکانی زەینەب و ئەو کتێبانەی کە لە رابردوودا خوێندم بوونەوە دەکرد

روخسارم سوور دەبوویەوە. کاتێك کە بیرم لە هەرە باشەکان دەکردەوە و شتە باشەکانم پەسەند دەکرد، هەستم بە جموجوولّی ئەو حەیوانە دڕەندەی نێو ناخی خۆم دەکرد. ئەم هەڵوێستەی من دەبوو بە هۆکاری ڕەتکردنەوەی ئەو کتێبانەی کە خوێندنەوەیان بۆ من پێشنیار دەکرا.

کاتێك کە سەیری ئەو بەری رووبارەکەم دەکرد هەستم بەوە دەکرد کە ناکۆکییەکانی دنیای دەرەوە لە نێو دڵی مندا بەردەوامن و جارجاریش ناحەقی لە زەینەب دەکەم. کاتێك کە دەنگێك لە نێو دڵمدا دەیگوت " تۆ دەتوانی مافی زەینەب بدەیت" لە نێو خۆمدا کتێبەکانم بە شێوەیەکی جوان لە نێو ڕەفەکاندا دادەنا و چایم دەم دەکرد. کاتێك کە بە شێوەیەکی ناشارەزا دەستم بە گێڕانەوەی چیرۆك دەکرد زەینەب بە پێکەنینەوە دەیگوت" شتی هەرە باش بۆ تۆ ئەوەیە کە ئەو کتێبانەی کە دەیانخوێنیتەوە ناوەرۆکەکەیان بۆ خۆت کۆ بکەیتەوە ".

کاتێك کە شەپۆلی زەرداو لە رووبارەکەدا بەرزدەبووەوە ئەو گەرماییەی کە لە نێو بێدەنەگیدا بوو مۆری خۆی لە هەر شتێك دەدا. ترس دەیەویست هەر هەموو بەرە بەیانییە رووناکەکانی من بخوات. کاتێك کە سەیری بۆشایەتیم دەکرد بیرم لەو مرۆڤ و شارانە دەکردەوە کە هیچ ئێش و ئازارێکیان نەکێشاوە. هەستی من لە بەرانبەر ئەو شارانەدا لایەنێکی دیکەی خەمباری من بوو. ئێش و ئازارەکانیش... لە ڕوویەکەوە وەکو هەڵهاتن بوون. چونکە هەبوونیش شتێکی زۆر کراوەی نێوان رابردوو و داهاتوودا بوو، مەگەر بەجۆرە نەبوو؟

کاتژمێر ١٦ و پێنج خولەیەك لە نێو ڕێگای پڕ لە دار و گوڵدا دەستم بە پیاسە کرد. شارستانییەت و مەدەنییەت چی بوو؟ ئایا بەرهەمی ناکۆکی و پێکدادانەکان تەنیا ڕەنگ دانەوەیەکی گەورە بوو؟ ئاسمانی شین و هەتاوی درەخشان دەبوون بە هۆکاری سوورانەوەی هەبوونی من لە دەوری یەك خاڵدا. بەبێ ئەوەی هەست بە ئێشی قاچم بکەم بەرەو پێشەوە دەڕۆیشتم و سڵاوێکم لەو کەسانە کرد کە وێنەگیرییان دەکرد. کاتێك کە یەکێکی بە تەمەن و قژ درێژیان هەستی بە هەڵکێشانی قاچی منی کرد شەپۆلێکی ئێش و ئازار بە روخسارییەوە دیار بوو. هەستی زانا بوونی من کە هەمیشە لە ئامادەکاری بۆ پاراستندا بوو نەجارەیان دەستی بە هێرش کرد و وتی" یاری دەسەڵات کە بێزێزی و کەم زانینی ئەوانی دیکەی کردووە بە پیشەی خۆی هیچ شتێك بێجگە لە جەهالەت کە ماسکەی خۆی گۆڕابێت نییە". هەنگاوەکانی خۆمم بە هێزتر دەکرد و بە ئەوانم دەگوت" بەزەیتان بە خۆتانەوە بێت" و دەکەنیام. دواتریش بە خۆم دەمگوت" هەستی گوناهکار بوون و لە سەر ماشەدا راوەستانت هیچ کۆتایی پێ نایێت". برێك دوور کەوتمەوە. کاتێك کە دەنگی سەگەکانی نێو هۆتێلەکان تێکەڵی دەنگی تراکتۆرەکان دەبوو، جەستەی جوتیارەکانیش لە نێو بێستانەکاندا جموجوولّی دەکرد.

راوەستام، گەیشتبوومە ناوچەیەکی گەشتیاری، دوو جوان پێکەوە گاڵتەیان دەکرد و یەکتریان ماچ دەکرد، گەڕامەوە. کاتێك کە گەیشتمە ژوورەکەی خۆم لە نێو شەکەت و ماندوو بوونێکی شیریندا بووم.

کاتێك کە مرۆڤ لە رووی جستە و نەفسییەوە دەگۆڕدرێت و نەفسیەت و رووحاڵێکی دیکە بە دەستەوە دەهێنێت ئەو کاتە تەنیا لە رێگای چالاکییەکانەوە تێر دەبێت. دەست بە چالاکی کردن بە مانای سووڕانەوە بۆ لای راستییەکان بوو. بە هێز بوون بە مانای فێربوون و فێر کردن و زیاتر کردنی ئاستی زانیارییەکانمان بوو بە هۆی کار و پیشەکەمەوە سەردانی هەندێکی زۆر لە وڵاتانی جیهانم دەکرد و ئەم سەردانانەش سوودێکی یەکجار زۆریان بۆ من هەبوو. ئەو دۆست و هاوڕێیانەی کە بۆ خۆم سازم کردبوون، پاریس، رۆما، ئەمستەردام، ژنێڤ، ستوکهوڵم، کولن... کاتێك کە لە شانزەلیزە و لوۆڤردا دەگەڕام هونەر بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر مۆری خۆی لە هەر شتێك دابوو. ژیانە هەرمۆنییەکەی نێو جادەکان هەستی منی حەزکردن و خۆشەویستی بەهێزتر دەکرد، بۆنێك، رەنگێك و دەنگێك و رۆخسارێك کاتێك کە تێپەڕ دەبوون رابردووی منیان بە بیرم دەهێنایەوە.

ئەو ماڵە بەردیانەی کە بۆنی تووتون و هەنگوینیان لێوە دەهات، دووکانە نزمە گچکەکان، بەهارات فرۆشەکان و ئەو کاتژمێرانەی کە وەکو با دەڕۆشتن، قۆماشە ئەوریشمییەکان...

کاتێك کە لە نێو بازاری گامبو دا دەگەڕام بێجگە لە زمانی زگماکی زمانەکانی تورکی، عەرەبی و کەلدانیش جارجار لە نێو مێشکمدا دەستیان بە جموجووڵ دەکرد.

ئەو منارانەی کە بە تاشە رەنگ کراوەکان رازابوونەوە، لۆشی منارەکان، فێنکییە نەمدارەکە، گالەرییە هونەرییەکانی ئەورووپا کە بۆنی ڤانیلیایان لێوە دەهات، ئەو مێژووەی مزیوپۆتامیا کە تا ئێستا نەخرابووە سەر زمان، ئەوەیان بۆ من دەسەلماند کە هیچ شارەستانییەتێك تەنیا بە سەری خۆی نەیتوانیوە ژیان بکات. کاتێك کە فێری ئەوە بووم کە شارەستانییەتەکان بە سازکردنی پەیوەندی بە یەکتر و دانوستاندن و بازرگانی کردن دەوڵەمەند بوونە هەستی من هیچ شتێك نازانم زۆرتر باڵی بە سەر مێشکمدا دەکێشا. کاتێك کە بیرم لە رابردوو دەکردەوە هەستم بەوە دەکرد کە لە نێو ئەتۆموسفەری ئەوانەدام کە رووبەڕووی هەڵەکانی رابردوو بوونەتەوە. کاتێك کە لە نێو نۆسچوویتز، بەرگەر، بەلسەن و داکساودا دەگەڕام هەستم بەوە دەکرد کە هیچ شتێك نەگۆڕاوە. بەڵام ئێستا گۆڕانکارییەکان زۆر بە نهێنی و فێلبازییەوە دەکرێن. بۆ هەر شتێك قلیفێکی (پێست. وە) تایبەتیان ساز دەکرد.

شارستانییەت نەیدەتوانی هاوسەنگییەك ساز بكات، تاوانبار بوو، ! كێ ئەو هەموو بەرهەمە هونەرییەی بەرهەم هێنابوو، ئەو كلێسانەی كە وەكو دەنتاڵ كاریان دەكرد، سەرا و كۆشكەكان بەرهەمی دەسترەنج، خوێن و عەرەقەی كێ بوون؟ یا مزگەفت، شێخ و حاجییەكان و مامۆستا ئایینییەكان.... یا ئەوانەی كە لە نێو قوربانگاكاندا قوربانیان سەردەبڕی، ئەوانەی كە باوەڕیان بە نوشتەكان هەبوو، ئەو كەسانەی كە شەربەتی دەدا بە نەبزی دەروێشەكانی.... ئەی وڵاتی هەست برینداری من.... گەلەكەم و گەلەكانم... كاتێك كە هەتاو لە بەرەبەیانە نەمدار و تەرەكانی ئەورووپادا لە نێو دارەكاندا جار بزر دەبوو وجاریش دیار دەبوو، منیش لە نێوان ئەو كەسانەدا كە لە هەر چوارلای جیهانەوە هاتبوون، لە بیرم دەكردەوە كە خەڵكی كوێم و لە كامە وەڵاتەوە هاتووم.

بە مەبەستی ئەوەی كە ئەو شتانەی كە لە لایەن رابەرە فەرەنسییەكەوە بە زمانی فەرەنسی بۆمان دەگوتران باشتر و زووتر وەربگرم و فێریان ببم خۆم زۆر تەنگاو دەكرد و گوشارم دەخستە سەر خۆم.

كاتێك كە بیرم لە پێوانەی سەرەكەی زانیاری كە كرپار و كردەوەیە و دیالكیتیكی نێوان كرپارو كردەوە دەكردەوە ئەو كاتە تێدەگەیشتم كە ئەو شتەی حوكم دەكاتە سەر ئەم دیالكتیكە كرپار یا نیهادە، هاوكات لە دەنگی میكرۆفۆنەكەی رابەرەكەیشمان نرخێكی هاوبەشی مرۆڤایەتی بڵاو دەكرایەوە. رابەرەكەمان شتی زۆری پێ دەگوتین و ئەو شتانەی كە دەیگوت من لە لای خۆم دەمنووساندن. ئەو گوناكارانەی جەهەنم و قارەمانانە كە لە لای چەپی عیسایەوە بە زەنجیر كێشرا بوون، ئەو قارەمانانەیش كە لە لای راستی عیساوە بوون و سەیری پەیكەری عیسایان دەكرد نوێنەری ئەوانە بوون كە لە جەنەت دان. (مەبەست بە هەشتە.وە). یەكێك لەو هۆكارانە كە بۆ پێكهاتنی رێنسانس رۆڵێكی یەكجار زۆری بینیوە هاتنە مەیدان و پێشكەوتنی تاكەكەسی بوو. هۆشیار بوونەوەی هەستی راست و دروست بوون، حەز كردن لە جیهانی بوونی هەستی ژیان هەر هەموویان هێمای دەسەڵاتدار بوونی عەقڵ لە سەر جیهاندا بوون. هاوسەنگی لە سەر بنەمای درێژی و بەرزایی هۆكارەكانەكانی رونسانس بابەتی گفتوگۆ و مشتومڕ بوو. فۆرمی سەركەوتوو و دەسەڵاتداری ئەو كاتە كۆمەڵگە كە فۆرمی برۆكراتیكەكان بوو جێگای خۆی وردە وردە داوەتە فۆرمی بە رەحم بوون، رابەرەكەمان دەیگوت "ئەو فۆرمە بە هەستەی دینامێك كە لە لایەن باروكەوە باسی لێوە دەكرا لە روكوكودا دەگاتە ئاستی هەرە بەرزی خۆی".

مزگەفتەکان و منارەکانیان، شەریفی سمێلوو، حەجەرولئەسوەد (بەردی رەش) و ئەو قوماشانەی کە لەگەڵ بادا هاتوچۆیان دەکرد.... کوپەرنیکۆس و تێوەرییەکانی ئیزافییەت... برۆنو، مەنسووری حەلاج، عومەری خەیام..... بیگ بانگ، ئەستروکۆتلە، بیوکۆتلە، لوگوکۆتلە، سوسیوکۆتلە..... هەر هەموویان هێما و نیشانەی جۆرەیەك لە فەلسەفە و ژیان بوون.

کاتێك کە لە ژێر گەرمای هاویندا ئینن و جنین یارییان دەکرد و ئەو رۆژانەی کە مردنەکانیش چەتەکانی خۆیانیان دۆزیبوویەوە بەرەو ماڵی مولکییە دەرۆشتین. وا هەستم دەکرد کە کۆڵانەکانی ئێمە بۆنی باروت و خوێنیان نەدەدا. دەمانەویست وا هەست بکەین کە هەر شت ئاساییە، بەڵام نەماندەتوانی خۆمان هەڵبخەڵەتێنین. ئەو رۆژە سەر خۆشانەی ئاق دەنیز بە بیرمان دەهاتنەوە. مردنەکان، ئەشکەنجەکان و ئەوانەی کە لە نێو زیندانەکاندا بوون هیچ کەس بیری لێیان نەدەکردەوە و هەرکەس لەم رووەوە کەم تەرەخەم بوو. ویسکی و پوپی سووتا و ئەو شەهوەتانەی کە شەویان دەخوارد و تەواویان دەکرد و ئەو بۆشایەتی و روخسارانەی کە مەعیدەی مرۆڤیان تێك دەدات.... زەینەب هەر چەندە فێری بەحر و دەریا بوو، بەڵام نەیدەویست بکەوێتە نێو ئاو. بۆ ئەوەی کە من باشتر فێری مەلەوانی ببم بە منی دەگوت" هادەی بزانم خۆت فڕێبدە". شەپقەکەم دەفڕی و لە سەر لمەکەی قەراخی ئاوەکەدا دەمهێنایەوە. کاتێك کە لە شەوەکانی تەباخدا دەنگی ئەو باڵندانە کە باڵیان دەگرت تێکەڵی دەنگی کەمان دەبوو، مولکییە دەستی بە خوێندنەوەی ئەو هەڵبەستەی دەکرد کە بەم دوایانە نووسیبوو. ئەکرەمیش بە مەبەستی تووڕە کردنی مولکییە دەیگوت هەڵبەستەکانی باش نین. لە نێو هەڵبەستەکانی مولکییەدا سەبارەت بە دوارۆژ هیوا و ئاواتێکی زۆر گەش هەبوو. سەیری باڵندەکانی شەومان دەکرد و دەنگی خش خشی گیاکانیش گوێی ئێمەی کەڕ دەکرد. کاتێك کە ئەوان سەرگەرمی شەترەنج بوون هەیەجانی من بۆ حەماقەت و شوور بەرەو ئەستێرەکان باڵی دەگرت و منیش هەوڵی ئەوەم دەدا کە ئەو مانگە شەو کە لە نێو دارەکاندا خۆی بە دەر دەخست بە باوەش بگرم. پێکەنینە بەرزەکان و ئەو دەنگانەی کە لە ئێش و ئازار دوور بوون ئەو دەمڵە تۆزاوییانەی کە دەکەوتنە نێو قرگمەوە هەر هەموویان تایبەتمەندییەکی دیکەیان بەو شەوانە دەدا. کاتێك کە رەشەباکان لە ژێر پەنجەرەکەی قاتە نزمەکەی سەرەوە دەهاتنە ژوورەوە من سەرقاڵی لەبەر کردنی ئەو جلانەی شەو بووم کە مولکییە بۆمی دووری بوون. دەمەویست دەستەکانم لە نێو گیرفانمدا دەربهێنم. بە هۆی ئەوەیەوە کە مەمکە بەندم نە

بەستبوو زەینەب لێم تووڕە بوو. ڕۆژی دواتر مەمکە بەندێکی باشی پەمبەیی بۆ من هێنا و بیرەوەرییەکی خۆیشی بۆ مولکییە گێڕایەوە. " زۆر کەس هاتووچۆی ماڵی ئێمەیان دەکرد، سۆبە خەڵووزییەکەی ئێمەش گڕی تێ بەردەبوو، هەوڵمان دەدا کە جلەکانی خۆمان لە سەر ئەو تەنافەی کە بە لوولە سۆبەکەوە بەستبوومان وشك بکەینەوە. ئێمەی دڵ سافی گوندی، جارێکیان پیاوێك میوانمان بووە و چاوی بە مەمکەبەندە گەورەکەی دایکم کەوتبوو و وتبووی" ئەوانە تاقمی دوانەیە" دایکی منیش بەبێ ئەوەی خۆی تووڕە بکات وتبووی" یەکە یەکە".
کاتێك کە تاقمی دووانەم بەست دەستم برد بۆ مەمکەکانم و دەخۆریان، مولکییە زانیبوو لە کامە دووکاندا کڕیانبوو. متمانەی بەو هێزە هەبوو کە بە هۆی زایەند بوونییەوە لەگەڵ هێزی ژن بووندا پێ بوو. ئاسان نییە کە وەکو ژن لە ڕووناکی هێزی ژن بوونی خۆتدا بەڕێوە بڕۆی یا خۆت بەڕێوە ببەی. هیچ هەڵسوکەوتێکی نائاسایی ئەو ژن و مێردە بێ منداڵانە لە مولکییە و ئەکرەم بە دی نەدەکرا، بێجگە لەمەیش یەکیەتییەکی زۆر باشتریان لە بەرانبەر دنیا و جیهاندا هەبوو و زۆر یەکتریان خۆش دەویست. کاتێك کە دەیانگوت" ئەو ژنانەی کە خۆیان وا بەراورد دەکەن کە خاوەن نەزاکەتێکی یەکجا زۆرن لە ڕاستیدا خاوەن ترس و لاواز بوونن" زەینەبیش دەیگوت" تا ئێش و ئازار نەبینی و فێرە ڕاو کردنی نەبی نابێت". هەمیشە لە نێو ڕووبارە خرۆشانەکانی ڕۆحمدا لەگەڵ ئەو ژنانەدا بووم کە بە خۆشەویستییەکی باش و دروست گەورە دەبوون و منیش وا هەستم دەکرد کە بەجۆرە گەورە دەبم. کاتێك کە لەگەڵ ئەکرەمدا لە سەر بنکۆتی دارەکان لە نێو باخچەکەدا دادەنیشتین تێگەیشتم کە ئەکرەم یەکێکە لەو ڕۆشنبیرانە کە ژنە بەهێزەکانی خۆش دەوێ و لەگەڵیاندا پەیوەندییەکی برادەرانە ساز دەکات.

بۆ یەکەمین جار کاتێك کە لەگەڵ ئەکرەمدا چووینە ڕاوە ماسی من بە زۆر خۆم بە ماتۆڕەکەوە دەگرت. بە ترسی بزر بوون لەو شینایەتییە بێ کۆتاییەدا دەلەرزیام، مارتییەکان زۆر بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر خۆیان بەرز دەکردەوە و خۆیان دەخستەوە نێو بەحرەکەوە. کاتێك کە هەر ساڵ شتی دیکەی نوێ فێر دەبووم وەکو ئاوی ڕەش ئاگام لەوە نەبوو کە بیرو بۆچوونەکانی من هەر یەکیان بۆ لایەك دەڕوات. کاتێك کە تێگەیشتم کە هەر جیا بوونەوەیەك دەرئەنجامی ناکۆکی و پێکەوە بوونێکی سروشتییە دیتم کە ئەکرەم چرچەکانی نێوچاوانی خۆی کۆ کردەوە و چاوەکانی داخست و کەنیا و وتی" تۆ ڕێگای خۆتت دۆزیوەتەوە". کاتێك کە لە سەر گوڵە سوورە ڕەنگە شەربەتییەکاندا دادەنیشتین ئەکرەم دەستی بە ئاگر کردنەوە لە نێو مەنقەڵەکەدا دەکرد و مولکییەش دەیگوت" لە دەریاوە با و ڕەشەبا دێت". بۆ یەکەم جار

کاتێك کە ئەم وشەم بیست بە هۆی هەستی فێر بوونی شتی نوێیەوە دەستم بە پێکەنین کرد. مولکییە وتبووی" بەحر وەکو چادرە". ناوی ماسییەکان، تامی ماسییەکان و لەگەڵ کامە ماسیدا کامە جۆری شەراب باشە هەر هەموویانم لە ئەکرەم و مولکییە وەردەگرت و فێریان دەبووم. کاتێك کە ماسییەکان لە نێو مەنقەڵە لنگدارەکەدا دەبرژران راو کردنی ماسی بە دینامیێت لە لایەن کاکمەوە دەهاتە بیرم. کاتێك کە دایکم بە تۆڕێك ئەو ماسییانەی کە دەکەوتنە سەر ئاوەوە کۆ دەکردەوە تا بن باڵی تەڕ دەبوو. جلە تەڕەکانی خۆی زوو بە زوو هەڵدەکێشا و قاچە سپییە پڕ لە گۆشتەکانیشی دەکەوتنە نێو هەڕەکەوە. بە هۆی ئەوەیەوە کە دەترسیام ئێسقانەکانیان لە نێو قووڕگمدا گیر بکەن من ئەو کاتە ماسیم نەدەخوارد. لە تێگەیشتنی ناوەڕۆکی ئەو قسانەی کە تا درەنگانی شەو بەردەوام بوون تەنگاو دەبووم. کاتێك کە گۆ بیستی بیرەوەرییەکانی زەینەب، مولکییە و ئەکرەمم دەکرد خەوم دەهات. کاتێك کە بە بۆنی خۆشی شووتی و ئسلوویە نەرمەکانی زەینەب هاتمە سەرخۆ، لە زانینی ئەوەی کە لە کوێمە زەحمەتی و ناستەنگیم دەکێشا. کاتێك کە شەڕ و پێکدادانەکان گەرموگوڕتر دەبوونەوە ئێمەش لە نێو بێ ئاواتی و بێ هیواییدا نوقم دەبووین. ئەوانەی کە شتە خراب و پیسەکانیان دەئافراند لە نێو دامودەزگاکانی دەوڵەتدا بە سەربەستی دەسووڕانەوە، زەرەرێکی یەکجار گەورەیان دەدا بە متمانەی کۆمەڵگە و ئاستی پێوانە ستانداردەکانی ژیانی کۆمەڵگە، چونکە رۆحێك کە بێ ریزی پێکرابێت و بە چاوێکی سووك سەیر کرابێت ناتوانێت بە هیچ شێوەیەك ببێتە خاوەن ئەو هێزە کە لە دژی دەسەڵاتی دەوڵەت رابوەستێت. بەڕێوەبردنی ئەو کۆمەڵگەیە کە لاواز کرابوو و هیچ جۆرە زانیارییەکی نەبوو زۆر ئاسان بوو. هەر بەم هۆیەشەوە کۆمەڵگە و بەڕێوەبەرەکانی بە چاوێکی دیکە سەیری رۆشنبیرەکانیان دەکرد.

گەورە بوون لە نێو ئەو کەسایەتییانەدا کە بۆ هەر جۆرە گۆڕانکاری و بەرهەم هێنان ئامادە بوون و هیچ جۆرە سرێکی نەخۆشییان هەڵنەدەگرت شتێکی زۆر جدی و جیاواز بوو.

هەمیشە بیریان لەو وشە و رستانەی دەکردەوە کە دەیاننووساندن، ئەو وشە نوێیانە کە تازە دەم بیستن وەکو میخ لە نێو مێشکمدا بۆ خۆیان جێگایان دەکردەوە. وا بیرم دەکردەوە کە پێویستە بگەمە ئەو ئاستەی کە بتوانم ئەو شتانەی کە دەیانخوێنمەوە لێیان تێ بگەم. ئێش و ئازار هێزی بە من دەدا، کاتێك کە زەینەب بە چاوە رەنگ هەنگوینییەکانی خۆیەوە سەیری منی دەکرد من تێ دەگەیشتم کە دەیەوێ بڵێت " تۆ بۆ من زۆر گرنگی". ئێمە مانای سەیر کردنەکان و قسە بن زمانەکانی یەکتر و زەردە خەنەکانی یەکترمان باش دەزانی. کاتێك کە

شەو وەکو باڵێکی باریك ئێمەی بە باوەش دەگرت، وتووێژەکانی نێوان ئێمەش خەمبارتر دەبوون. زەینەب دەستی خۆی دەخستە ژێر سەری من و چاوەکانی خۆی دادەخست. مولکییەش بە پێی رووت خەریکی شێلانی خاك بوو. ئەکرەمیش کاتێك کە هەناسەیەکی قووڵی لە پاپیەکەی خۆی دەدا بە شێوەیەکی دوور و درێژ بیری لە قسەی سیاسەتمەدارەکان دەکردەوە. منیش وردە وردە تێگەیشتبووم کە مانای دەوڵەتی قووڵ، رەگەز پەرەستەکان، پەکەکە و گەریلا و ژیتەم چییە. هەروەها زۆر باشیش لە مانای شەڕ، مردن و برسی بوونیش تێگەیشتبووم.

کاتێك کە مرۆڤ لە نێو شەوە ئاوییەکانی قەرەدەنیزدا نۆقم دەبوو، گفتوگۆکان لە شەوی تاریکدا کەمتر و نزمتر دەبوون، لە نێوان خەوتن و هۆشیاریدا دەنگی زەینەب لە نێو گوێی مندا هاتوچۆی دەکرد. باسی ئەو سەرهەڵدانەیان دەکرد کە لە نێو گرتووخانەکاندا دەستی پێکرد بوو. بە دەنگی باڵەکانی باڵندە سەحەرخێزەکان و دەنگی مانگا و دەنگی میاومیاوی پشیلەکان هۆشیار دەبووینەوە. دواتر کاتێك کە بە دەنگی مەکینەکانی کولاَندنی چیم وئەو دەنگەی مۆتۆرەکانی ئاو کە هیچ نەماندەتوانی لەگەڵیدا رابێم دەستمان بە رۆژی نوێ دەکرد ئەو پیرە ژنەی کە لە نێو دڵمدا دەگریا لەگەڵ دیمەنەکانی دەرەوە شەڕی دەکرد. ئەو بارانەی رابردوو کە وەکو خۆر لە نێو مێشکمدا بوو هەر شوێنێکی دەکردە تۆز و دوومان. ئەو ناوچە تەنگە کە بێدەنگی ئێمەی دەخوارد و ئەو ئاپۆڕای مرۆڤانە کە وەکو چەندین خاڵی گچکە بوون لە سەر تابەلاکاندا هەر وەکو چیرۆکی نێو فیلمەکان بوون... بۆ کوێ دەڕۆیشتین؟

بۆماوەیەکی کورت دایکم لە لامان هاتووچۆی کرد و دەستەکانی خۆی بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوە و دەپاڕایەوە. باوکیشم لە گۆشەکەی خۆیدا دانیشت و کاکیشم ئەو تفەی کە لە نێو دەمیدا کۆببووەوە فڕێدا. ئەو ماسکەیە کە وەکو کتێبە پیرۆزەکان هەڵیان دەگرت بە دەموچاوی منیانەوە بەست. کاکم چوون پێشمەرگە بوو زوو رۆیشت، ئاسمان رەش بوو، دەنگە دەنگ و هاوارەکان بەرز بوونەوە و بێدەنگیش دواتر باڵی بە سەر هەر شوێنێکدا کێشا....

مامۆزاکەم کە خۆی بە لای پەنجەرەکەی ژێر زەوییەکەوە هەڵواسیبوو وتی" رابن لێرە ئەگەر بەرەو سنوور بڕۆن رزگارمان دەبێت، لە دوای کیمیابارانی دووەمدا بەرد لە سەر بەرد نامێنێت". من دەنگی ئەو مرۆڤانەم دەبیست کە نەیاندەویست بمرن و رایان دەکرد. سینگی باوکم کە وەکو تۆپ رادەبوو و دادەنیشت و دەمی پڕ لە تفی کاکم و ئەو سینگەی دایکم کە رادەوەستیا و لێ دەدا... هەر هەموویان هێمای فەلاکەت و تراژدیایەك بوون.

لە نێو شوێنە گەشتوگوزارییەکانی ئادامسەندەجیدا بێدەنگ دەبووم و بیرم لەو هەستانە دەکردەوە کە نەیاندەزانی ئێش و ئازار و مەرگ چییە. کاتێك کە جارجار لێیان تووڕە دەبووم و سووکایەتیم پێدەکردن، بیرم لەو هەبوونانە دەکردەوە کە نەمدەتوانی بە دەستیانەوە بهێنم. ئەو کاتە لووتم دە سوولیاوە و ناخم پڕ دەبوو لە ئاخ و حەسرەت و ددانەکانیشم لە رق و کین بە سەر یەکتردا دەهاتن و دەچوون. زۆر شتی سەیرم دەدیت... رۆشنبیرە سمێڵ درێژە ساختەکارەکان، فاحیشەکان، ئەو جەستانەی کە هەر هەموویان خاڵی دەستکردیان پێوە بوو، گوللە هەواییەکان، ئەو سەیر کردنانەی کە هەر یەکیان نەخۆشییەکی پێوە بوو، بۆنی عەرەق و.....

کاتێك کە لە جیهانی دەرەوە دابڕابووم و لە نێوخۆمدا دەسووڕامەوە، هەستم بە بۆنی پیسی نهۆمی ژێر زەوی دەکرد و پێکەنینەکانی خۆم و بەرفین لە نێو باخی قەسییەکاندا دەهاتەوە بیرم. بەرفین شەیدای میکائیل بوو، بە هۆی ئەوەیەوە کە هەنگی پێوە دابوو هەمیشە بیری لەوە دەکردەوە کە چۆنە بڕواتە سەردانی میکائیل، شەرمی دەکرد چونکە دەموچاوی بە هۆی پێدانی هەنگەکەوە تێك چوو بوو. ئەسپەکەی خۆی دەرازاندەوە و لە دەردەوری باخچەکەدا هاتوچۆی دەکرد و چیرۆکەکانی مەلەکی تاووس و ئادەم و حەوای بۆ من دەگێڕایەوە. " ئادەم سپرمەکانی خۆی دەخاتە نێو قووتییەکیدا و حەواش سپرمەکانی خۆی دەخاتە نێو قووتییەکی دیکەدا و بۆ ماوەی ٩ مانگ لە ژێر خاکدا حەشاریان دەدەنەوە و دوای تێپەڕ بوونی ٩ مانگ سپرمەکانیان دەردەهێنن و تێکەڵی یەکتریان دەکەن. دواتر لە نێو سپرمەکانی ئادەمدا مرۆڤێکی جوان و رێکو پێك کەوتووە و لە نێو سپرمەکانی حەواشدا ئاژەڵی زۆر سەرنجڕاکێش دەرکەوتووە. میکائیل بە مەکرو تەکەبورەوە دەیگوت من لە شەجەرەی ئادەمم. بەرفین میکائیلی بێدەنگ دەکرد و درێژەی بە چیرۆکەکانی دەدا و منیش زۆر بە باشی گوێبیستی ئەو چیرۆکانەم دەکرد. جار جاریش لەو خواردنەی کە دایکی ئامادەی دەکرد بڕێکی دەهێنا و دەمانخوارد، کاتێك کە ئەو خواردنانە کە لە خورما، تێری وشك کراو و گۆشت و ساوەر دروست کرابوون دەمانخوارد بەرفین نازی دەکرد و زۆر کەمی دەخوارد. دەیگوت" دایکم بە منی وتووە کە " پیاوەکان حەزیان لە ژنی زۆر خۆر نییە".

کاتێك کە مولکییە باسی ئەوەی کرد کە براکەی خوێندکاری زانکۆیە و ویستوویەتی لە سنوور تێبپەڕێت دەستگیر کراوە و تەقەیان لێکراوە، زۆر بە وردبینییەوە گوێبیستی چیرۆکەکانی گرتووخانەکانم دەکرد و لە ناخی خۆمدا دەمگوت" ئەمانە چینە ئەگەر بزانن من چیم کێشاوە".

کاتژمێر ٥ و ١٠ خۆلەکی پاش نیوەڕۆیە، لەو شوێنەی کە دانیشتبووم چاوێکم لە ئاوێنەکە کرد. کاتێك کە لە خۆم پرسیم" ئایا گەشبین و بە هیوای؟" بڕێك بە چاوێکی سووك سەیری خۆمم کرد و وتم" بەم تەمەنە و بەم زانستەوە هێشتاکە بەدوای ئەم جۆرە پرسیارانەدا

دەگەڕێت". کاتێك کە مرۆڤ ناتوانێت بۆ هەبوونی خۆی هەڵبژارتن بکات ئەو کاتە بێگومان پێویستە گەش بین و بە هیوا بێت. بەڵام ئامانجە دوورەکان و پەسەند کردنیان وا لە مرۆڤ دەکات کە جار جار مرۆڤ لە هەبوونی خۆیشی شکی هەبێت.

کاتێك کە مردنەکان و بزرکردنی مرۆڤەکان رووی لە زیاد بوون دەکرد، ئەو کاتە مرۆڤەکانیش زۆرتر پێکەوە و لە دەور یەکتر کۆدەبوونەوە. زانینی هۆکاری ناکۆکی و شەڕ و پێکدادانەکان دەبوو بە هۆکاری ئەوەی کە مرۆڤ بتوانێت لە بەرانبەر ناکۆکییەکاندا شەڕ بکات. ئەو کەسانەی کە نەیاندەویست بە ئیرادەیەکی سەربەخۆ لەگەڵ رووداوەکاندا هەڵسوکەوت بکەن هیچ حەزیانیش نەدەکرد کە هۆکاری ناکۆکی و شەڕ و پێکدادانەکانیش بزانن و بێدەنگ دەمان و هیچ لەم رووبەوەش ئێش و ئازاریان نەدەکێشا. ئەوانەی کە لە بەرانبەر رووداو و ناکۆکییەکان تووشی ترس و دڵەڕاوکێ دەبوون ئەوانە بوون کە هەستیان بە هەبوونی خۆیان کردبوو.

کاتێك کە لە نێو کۆڵانە تەسکەکەدا کە بۆنی ویسکی و خواردن تێکەڵی یەکتر ببوون هەنگاوم دەنا، چەپ و راستم دەبوو بەو دوکانانەی کە بەهارات، تووتون و کەلوپەلی ئەرزانی نێو ماڵیان دەفرۆشت. ئەو روخسارە ئەسمەرانە کە لە نێو عەرەقدا بوون و چاوەڕوانی مشتەرییان دەکرد، منیش ئەو بازرگانانە کە هێشتای تێکەلی یاری پیسی رەقابەت نەببوون لەگەڵ ئەو بازرگانانەی کە لە سەریاندا هەزار جۆر فیڵ و ساختەکاری هەبوو هەڵدەسەنگاندن.

جوانەکان هاوکات لەگەڵ هاتنی دەنگی مۆسیقا لە نێو ماشینەکانیاندا سەری خۆیانیان کە رەنگی وەکو رەنگی کاکتوس بوو دەردەهێنا و سووتیان دەکێشا و هاواریان دەکرد" سوپا لووس کراوەکان". بە هۆی رق و کینەوە شەرمم دەکرد، دواتر کاتێك کە لە نێو کتێبخانەکەدا کتێبێکم کڕی وا هەستم دەکرد کە بە هەزاران چاو سەیری من دەکەن. دەمەویست هاوار بکەم و بڵێم دەنگی نووسەرانی ئەم کتێبانە بەرز بکەینەوە و بڵێین " بەسە ئیتر". بەڵام کاتێك کە ژمارەی رۆشنبیرە گیراوەکان لە نێو گرتووخانەکاندا رووی لە زیاد بوون دەکرد منیش بێ هیوا دەبووم.

کاتێك کە دەنگی ئەحمەد کە لەهجە یا شێوەزاری پێوە دیار بوو و لە نێو کتێبخانەکەدا کاری دەکرد دەمبیست تووشی شوورێکی یەکجار زۆر دەبوومەوە، ئەو جوانە کە هیچ نەمدیتبوو و نەمدەناسی کاتێك کە رووبەڕووی یەکتر دەبوونەوە من زۆر شەرمم دەکرد. هەر ئێوارەیەك ئەگەر نەچووبامە کتێبخانەکە ئۆقرەم نەدەگرت. ئەحمەد خەلکی ئاغری بوو. (شارێکی باکووری کوردستانە لە بەشی باکووری قەراخی گولی واندایە .وە) بە مەبەستی دەرهێنانی مەسورفاتی خوێندنی خۆی هاوینان کاری دەکرد. هۆکاری کتێب خوێندنەوەشی بۆ

چیرۆکە سەرنجڕاکێشەکەی خۆی دەگەڕایەوە. ئەو رستۆرانتەی کە ئەحمەد تیایدا وەکو گارسۆن کاری دەکرد هی پیاوێکی کوور بوو. خاوەنی رستۆرانتەکە بە ئەحمەدی وتووە" هیچ حەزم لە ماڵ و مڵك و ئەو میراتەی کە لە لایەن باوکمەوە بۆم جێماوە نییە، چونکە ماڵ و مڵك نابێتە هۆکاری خۆشبەخت بوونی مرۆڤ، خۆشبەختی راستەقینە تەنیا لە زانست و فێربووندایە. بەشێکی زۆر لە کاتی رۆژانەی خۆی بۆ ئەو کەسانە تەرخان دەکات کە بۆ خوێندنەوەی کتێب روو لە کتێبخانە دەکەن. لە بالکۆنەکەدا کاتێك کە نەرگیلەی دەکێشا گوێبیستی خوێنەرەکانیشی دەکرد. ئەحمەدیش یەکێك بوو لەو کەسانەی کە هەر رۆژ سەردانی کتێبخانەی دەکرد. ئەحمەد وتی" خاوەن کتێبخانەکە پێ وتوومە" زمانت بڕێك لەهجەی پێوە دیارە بەڵام دەنگت زەلالە، بێجگە لەمەش بیستنی چیرۆکەکانی ناوچەکانی ئێوە بە زمانی ئێوە خۆتان بۆ من زۆر گرنگ و خاوەن بایەخە". لەگەڵ ئەحمەددا خاوەن چەند خاڵی هاوبەش بووین. ئەحمەد باسی جەنابی رەحمی دەکرد و منیش باسی زەینەبم دەکرد. کاتێك کە من چیرۆکی خۆم بۆ خاوەن کارەکەی ئەحمەد کە فەرهەنگ زمانییەکی وەکو دیاری پێشکەشی من کرد گێڕایەوە دەنگی پچڕا و کەمی مابوو بگریێت.

شەوان کاتێك کە عەرەق لە پشتمەوە دەهاتە خوارێ ئەو سێبەرانە کە لە سەر دیوارەکانەوە دیار بوون دەمکردن بە زۆر شتی جیاواز، باڵەفڕ، گوڕ، بەرد، سەرباز و ئەسپ و .....

گڵێمەکەی سەر زەویش کە رام خستبوو شایەد لە لایەن دایکی بەرفینەوە دوورابێت. من لە بەرانبەر دانیشتنی دایکی بەرفین لە یەك ژووردا لە بەیانییەوە تا درەنگانی ئێوارە زۆر سەرم سوڕ دەما، دایکی بەرفین بەو تەمەنەی خۆیەوە بەرەبەیانی زوو تا درەنگانی شەو لە نێو یەك ژووردا دادەنیشت وگڵێمی دەدوورا. کاتێك کە پرسیارم لێ کرد" بێزار نابی پوورە پورشەڤ؟ لە وەڵامدا وتی" مرۆڤ کاتێك کە بێکار بێت بێزار دەبێت و دەست بە کاری خراب دەکات". نینۆکی پەنجە گەورەکەی دەستی رزا بوو و دەستەکانیشی جێ کار و رەنجیان پێوە دیار بوو. جار جار چاوی خۆی دادەخست یا چیرۆکێکی بۆمان دەگێڕایەوە یا حەیرانێکی دەگوت. جار جاریش زۆر فەقەرەی پڕ شوور و شەوقی بۆمان دەگێڕایەوە و دەیگوت بێدەنگ بن باسی ئەم فەقەرەیە لە لای باوکتانەوە نەکەن. دایکی من هیچ حەزی لە دایکی بەرفین نەدەکرد و دەیگوت" ئەو ژنە ژنێکە کە لەگەڵ ئەجندەکاندا قسە دەکات". لە جموجووڵ و روخسارە سوور بووەکەی دایکمدا تێدەگەیشتم کە لە نێوانیاندا کێبڕکێیەکی نهێنی بۆ بە دەستەوە هێنانی بستە زەوییەکی وشك و بێ ئاو هەیە.

دایکی من هەمیشە لە بەرانبەر ئاسوودەیی پوورە پورشەڤ، چاوەکانی و قسە خۆشەکانیدا هەستی بە کەم هێنان و کەم بوونی خۆی دەکرد.

کاتێك کە دایکم باسی کچانی حەمارات و پیاوخاسەکان و پەیوەندییە خۆشەویستییەکانی نێوان ئەوانی دەکرد، دار گوێزەکان لە بەر با دەجوولانەوە و لە نێو ئەو دۆڵەدا کە ڕەنگی ماتەمی پۆشابوو، تۆزی ئەسپ سوارەکان بەرزدەبووەوە. کاتێك پورشەڤیش وەکو داڵ دەستەکانی خۆی دەکردەوە و دەیگوت" منداڵینە بێن با چیرۆکێکتان بۆ بگێڕمەوە". ئەو کاتە منیش بیرم لەوە دەکردەوە کە دایکم وتبووی لەگەڵ ئەجنەکاندا قسە دەکات، بۆیە دەستم بە پێکەنین دەکرد. ئەو کاتە سەربازەکانی سەدامیش هێرشیان دەکردە سەر ناوچە و گوندەکان و کاتێك کە چاویان بە کچەکانیش دەکەوت تا بڵێی دەکەنیان و بە دەستێکیان چەکەکەیان دەگرت و بەو دەستەی دیکەشیان خەریکی ناوقاچی خۆیان دەبوون. ددانی هەر هەموویان پیس و چاوەکانیشیان سوور ببوونەوە. جیا کردنەوەی ئەوانە لە یەکتر کارێکی ئەستەم بوو. هەر کات بیانویستایا دەچوونە نێو ماڵێکەوە و بە زۆر بە ئەندامەکانی ئەو ماڵە دەیانگوت خواردن بۆمان ئامادە بکەن. قولاپێکیان بە زۆزانەوە کردبوو، زوان زۆر جوان بوو...

جارێکیان کاتێك کە لە لا تەنیشتی دەرگاکەوە سەیرم کرد دیتم کە هەر هەموویان وەکو مردەخۆر هێرشیان کردووە سەر برنج و گۆشتەکە و بۆ خاتری ژنەکەش پێکەوە شەڕیان دەکرد. کاتێك کە زیادەی خواردنەکان دەرژانە بن دیوارەکان ئەو کاتە قاڵە قاڵەکانی منداڵەکانی گەڕەك و زەلیّ دەستی پیّ دەکرد. کاتێك کە سەیرم کرد دیتم کە زەلیّ دەستە چەورەکانی خۆی بە سەر گیاکاندا دەکێشێت. کاتێك کە پرسیم" چی دەکەی؟" لە وەڵامدا وتی "ئەوەی تێرە ئاگای لە برسی نییە".

کاتێك کە مەمکەکانی خۆی دەردەهێنا و دەیەویست شیر بداتە ئەو منداڵەی کە هەر هەمووی گیانی لە نێو تۆز و پیسیدا بوو، بۆ مێردەکەی کە بە هۆی تەقینەوەی مائیندا گیانی لە دەست دابوو و دوعای دەکرد و دەگریا و دەیگوت" ئێمەت بە جیّ هێشتوو و چووی". بۆ زەلیّ لە نێوان بێوە ژن بوون و مردنیدا هیچ جیاوازییەك نەبوو. بە هۆی ئەوەیەوە کە منیش ژن بووم لە باروودۆخی زەلیّ کە لە لایەن هەرکەسەوە پەراوێز خرابوو تێدەگەیشتم. کاتێك کە شەو لە سەر بان دەنووستین دەنگە دەنگی پشیلەکان بێدەنگی شەویان دەشکاند. بە هۆی ئەوەیەوە کە زیاتر پەراوێز نەخرێت بە تەنیا نەدەگەڕا و لەگەڵ پیاوەکاندا قسەی نەدەکرد. ژنەکانی دیکە چییان بگوتایا قەبوولی دەکرد و دەپاڕایەوە و دیگوت" چی دەبێت منیش با لەگەڵ ئێوەدا بم". وەکو پیاوەکان هەر کارێکی دەکرد و بەو سیّ و پێنج قرووشەی کە پیّ دەدرا ڕازی دەبوو.

ترسی هەرە گەورەی ئێمە سەربازەکانی سەددام بوو. کاتێك کە چوومە دیاربەکر تێگەیشتم کە لە دیاربەکریش ئەوانەی کە بارودۆخیان وەکو بارودۆخی زەلێیە ژمارەیان یەکجار زۆرە. بێجگە لە زەلێکانی ئامازۆن پەنەلۆپەکانیش لە دیاربەکردا هەبوون. کاتێك کە لەگەڵ زەینەبدا گۆبیستی ئەوانمان دەکرد شێت دەبووین. هەمیشە لە ئێمە پرسیاریان دەکرد" ئایا تاوانی ئێمە ئەوەیە کە ژنین و لێرە لە دایك بووینە؟".

ئاڵۆزی و بەردەوام کردنی شەڕ تەنیا و تەنیا ماڵوێرانی و خراب بوونی باری گوزەران و بێ هیوا و بێ ئاسوودەیی پێشکەش دەکرد. ژیان لە سەر بەنێکی بڕاوەدا بوو. هەمیشە هەواڵی مردنی کوڕەکان، باوکەکان و مێردەکان لە نێو شاردا بڵاو دەبوویەوە. ئەو ساڵەی کە زێی دیجلە شەختەی کرد هەر شت زۆر گران بوو. نان و ئەرزاقەکانی دیکە تەنیا لە نێو بازاڕی رەشدا بە دەست دەکەوتن. چەندین رۆژ ساوەر و پەتاتەی بەبێ رونمان دەخوارد.

ئەو کەسانە کە بە هۆی کۆچی زۆرییەوە روویان لە شار کردبوو وەکو مراوی گێج بوو دەسوڕانەوە و ئاواتیان لە مردنیان دەخواست.

ئەو منداڵانەی کە لە سەر ئەو رووبارە کە قەشای کردبوو یارییان دەکرد جار دەبینران و جار جاریش لە نێو تەمدا بزر دەبوون. شەوێ لە نێو عەلاگەیەکی رەشدا بڕێك کشمیشی هێنابوو. کاتێك کە باسی ئەو خزمانەی دەکرد کە لە گوندەکەی خۆیاندا باریان کردبوو، لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی دەکرد و قووڕگە پڕ لە مووەکەی دەلەرزیا. کاتێك کە زەینەب دەیەوەیست پارە بخاتە نێو گیرافانی پاڵتۆکەیەوە ئەو کاتە بە بیرم هاتەوە کە ئەو رەنگە بڕێك بۆم ئاشنایە. پاڵتۆکەی نوێ نوێ بوو، یەکجار دەنگێکم بیست کە دەیگوت" پێویستە لە نێو جەمسەی سەربازیدا بەجێ مابێت". یەکەمجار بوو کە پاڵتۆم دەکردە بەر خۆم ،ویستم رەنگی بکەم وای لێهات." کاتێك کە کشمیشەکانم دەخوارد دەمژماردن و بە هۆی خواردنی کشمیشەکانەوە لێوی من رەنگی گۆڕا بوو. ئەو کاتە ئەو کەسانە کە لە شوێنی رژاندنی زبڵەکاندا دەگەڕان، ئەو سەربازانەی کە فستقیان دەخوارد، ئەو منداڵانەی کە چەندین کاتژمێر تووکی فستقیان لە نێو دەمی خۆیاندا دەهێشتەوە بە بیرم دەهاتنەوە.

شەوێك لە رێوڕەسمی پەرسە و تازییەدا دەگەڕاینەوە. بێدەنگی شەوی شار، هەر وەکو دڵی مرۆڤ لێدەدا، زەینەب زۆر بە توندی دەستی منی دەگرت و منیش تا رادەیەك هۆکاری را بوونی زەینەبم دەزانی. زۆر خێراتر هەنگاومان دەنا، من زۆر دەکۆخیام، لە شەوی بەمجۆرەدا من زۆر حەزم لە سێبەری خۆم دەکرد، بە مەبەستی دیتنی سێبەری خۆم چاوم لە سەر زەوی هەڵنەدەگرت. حەزم دەکرد گەورە بوونی سێبەری خۆم ببینم. کاتێك کە ئەو دەنگەمان بیست

کە تاریکی شەوی کون دەکرد هەنگاوەکانمان وردتر و هێمنتر کردەوە، قوورگم وشك بوو، دەنگێك دەهات" شیشت شیشت، بەڵام هیچ نەدەجوولایەوە. ئێمەش راوەستییان. جارێکی دیکە دەنگ هاتەوە. کاتێك کە گەڕاینەوە و سەیرمان کرد دیتمان کە سەربازێکە لە سەر شوێنی پاسەوانیدا خەریکی پاسەوانی کردنە و پیاسە دەکات. زەینەب وتی" داخۆ خەیاڵە یا راستییە". کاتێك لە نێوان تەلە ئاسنینەکاندا گۆلێکم هەلکێشا ئەو چاوانەی کە لە ژێر سێبەری دارەکاندا سەیری منیان دەکرد بۆ ماوەی چەند رۆژێك هەر لە نێو چاوی مندا بوون و بە هیچ شێوەیەك نەمدەتوانی لە بیریان بکەمەوە.

باوکی من و پوورشەڤ زۆر بە ئاسانی پێك دەهاتن. کاتێك کە بە هەست و ویستەوە گۆییستی ئەو چیرۆکانەم دەکرد کە پوورشەڤ بۆمانی دەگێڕایەوە، دایکم لە ژێر چاوەوە سەیری پوورشەڤی دەکرد و لیوی خۆی گاز دەکرد. بە شێوەیەك دەیەویست پێی بلێت سەیر بکە منیش لێرەم. پوورشەڤ هەم بە هێز بوو و هەم لە کاتی قسە کردن و چیرۆك گێڕانەوەیشدا زۆر بە فەسێحی قسەی دەکرد. کاتێك کە من هەڵسوکەوتی پوورشەڤ و دایکم پێکەوە هەڵدەسەنگاند ئەو کاتە بۆم روون دەبووەوە کە پوورشەڤ وەکو گورگە و دایکیشم وەکو مەڕە، ئەوەندە جیاوازی لە نێوانیاندا هەبوو. پوورشەڤ گۆشەگیری و پەراوێز خستنی دابوو بەر چاوی خۆی، لە زانست و سەردەم هیچ شتێك تێنەدەگەیشت، بەشێك بوو لە مەکان و داب و نەریتەکانی کۆن، رەنگە هەر بەم هۆیەشەوە شەو و رۆژ خەریکی گلێم کردن بوو.

رۆژێکی دیکە بەرەبەیان زوو بە هۆی قاڵە قاڵەوە لە خەو هەڵستاین. ماڵەکان هەر هەموویان تەفتیش دەکران و ئێمەیشیان دابەشی چەندین گرووپ کرد، دەمی خۆیانیان دەکردەوە و سوێندیان دەخوارد. پوورشەڤ هەر وەکو داڵ باڵەکانی خۆی کردەوە و بەرەو ئەو شوێنەی رۆیشت کە منداڵەکانی تێدا بوون. کاتێك کە پوورشەڤ هاواری کرد و وتی" ئەمە زوڵمە لە ئێمە دەکرێت" ئەو کاتە سەربازەکانی سەددام قژی پوورشەڤیان گرت و پوورشەڤیان لە سەر زەوییدا کێشا. چەندین رۆژ چاوەڕوانی پوورشەڤمان کرد، منداڵەکانیشی لە بەر زقم و سەرمای زستاندا بیست و چوارکاتژمێر لە سەر بانەوە چاوەڕوانی داکیانی دەکرد. مێردەکەی سەری خۆی دەخستە سەر دەزگای گلێم کردنەکەی پوورشەڤ و دەگریا. ژنەکانیش لە سەر تەنوورەکاندا دەیانگوت" زمانی پوورشەڤ زۆر درێژە پوورشەڤ بە دەست و زمانی خۆی ئەجەلی خۆی هێناوە." هەجنسەکانی پوورشەڤ خائێن بوون، ئەو مارەی کە بە ئەوانییەوە نەدابایا بە هەزاران ساڵ بەخێویان دەکرد.

لەو رۆژانی کە مردن باڵی بە سەر هەر شوێنێکدا کیشا بوو، ترسی ئێمە دەبوو بە هاوار کردنی خۆشەویستی، کەسێك کە گۆییستی ئەم هاوارەی ئێمە بکات نەبوو، نە لە نێو وێنەکاندا و نە لە نێو تەلەفزیونەکاندا نەمدەتوانی باڵەفڕەکان ببینم. لە نێو خەیاڵی مندا ئەو گیانەوەرە گەورانەی کە باڵەکانیان ئاگر بوو بۆ خۆیان ماڵیان دروست دەکرد. هیرۆشیما، ناکازاکی، وڤیەتنام.... ئەو یەهوودیانەی کە لە نێو ژوورە گازییەکاندا رزگاریان ببوو و دوعایان دەکرد و هەڵەبجە.......

کاتێك کە باڵندەکانی شەو باڵیان دەگرت، ئەو کاتە مولکییە ئەو مۆتەیەی کە بە دەستی خۆی ئامادەی کردبوو دەیهێنا. سێبەری گەڵاکان لە نێو دەستە رێکو پێکەکانی زەینەبدا بزر دەبوو. لە بەر چاوی ئەکرەمیشدا ئەیرەقوولەکان (مەبەست ئەو گیانەوەرە گچکانەیە کە شەوان دەسوورێنەوە و رووناکییەکی سوور لە پشتەوەیان دیارە. ئەم وشەیە بە زاراوەی هەوارمییە. وە) هاتووچۆیان دەکرد. کاتێك کە مولکییە وتی" ئاگاداری تۆ، ئێمە لە دەرەوەی سیاسەت باسی شتێکی دیکە دەکەین" زەینەبیش وتی" چی بکەم راستی ئێمە وایە، پێویستە مرۆڤ راستی خۆی بزانێت و لە سەر ئەم بنەمایەدا ژیان بکات، چونکە شتەکانی دیکە هەر هەموویان بێ فایدە و دوور لە راستین.... بێزار بوویی؟

منیش کاتێك کە زمانی خۆم لە نێو دەمی خۆمدا سووڕاندەوە و وتم" نۆچ" نا، هەر کەس دەستی بە پێکەنین کرد. سەرەتا من هیچ نارەحەت نەدەبووم بەڵام کاتێك کە هەستی باوەڕ بە خۆ بوونم دەکرد ئەو کاتە کەم و کورتییەکانی خۆمم دەدیت و فێری گاڵتە کردن بە خۆیشم دەبووم.

ئازادی وەك راستییەك کاتێك کە ژیانی نەکەی ناتوانی باسی لێوە بکەی. مرۆڤ بە هەر جۆرەیەکی ژیان و هەستی خۆیەوە چ ئەم راستییە لە نێو مێشکیدا هەبێت چ نەبێت، هەمیشە ئەگەر پشتیش لە سیاسەت بکات بەڵام هەر هەست بەم راستییە دەکات.

چاوەکانی زەینەب گەورەتر دەبوون، سەرەتا لە نێو کتێبەکانیدا باسی تاوان و سزا، دۆرگۆن دون و مارتین ئەدەنی دەکرد. چەند ساڵ دواتر زانیم کە داستایوڤسکی نووسەرێکی بەسیت نەبووە، کاتێك کە دەستم بە هەڵسەنگاندنی مەعنەویات و رۆحیاتی مرۆڤ دەکرد و دەمەویست لە بەرانبەر بەرهەمەکانی داستایوڤسکیدا شتێکی نوێ بنووسم هەستم بەوە کرد کە داستایوڤسکی زۆر بە شێوەیەکی پسپۆڕانە توانیویەتی سوود لە ناکۆکییەکان وەربگرێت. داستایوڤسکی کە نووسەرێکی تاریکییەکان و وستایەکی دیالکتیکە، زۆر بە ئاسانی توانیویەتی گشتییەتی مرۆڤ ئانالیز بکات، ناوبراو بێجگە لەمانەش نووسەرێکی سەر رەق و

شۆڕشگەرێکی رۆحی بووە. تێکۆشانی مارتین ئەدەن کە لە کرێکاری نانەواخانەوە بۆ نووسەری بەرز بووەتەوە زۆر سەرنجڕاکێشە. هەر چەندە تێکۆشانی خۆ بەرز کردنەوەی مارتین سەرنج راکێش بێت، بەڵام کاتێك کە هەست بە کۆتایی هاتنی من منیەتی خۆی دەکات و دەبینێت کە خەیاڵەکانیشی بە کۆتایی هاتنە ئەو کاتە بۆ مردنی خۆی ئامادەکاری کردووە و ئەم ئامادەکارییانەش کاریگەرییەکی یەکجار زۆریان لە سەر ناوبراو کردووە.

لە نێو رۆژە گەرمەکانی هاویندا ئەو کاتەی کە مرۆڤەکان خۆیان لە نێو ماڵەکانیاندا حەبس دەکرد ئێمە لە ماڵی یەکێکماندا کۆدەبووینەوە. پەنجەرەکانمان دادەخست و لە بەر دەنگی ساردکەرەوەکان و هەوا فێنکەکەیاندا ماستاوێکی پڕ لە کەفمان دەخواردەوە و دواتریش چایەکی زۆر باشمان دەخواردەوە، ئەوانەی کە لە نێو دامودەزگاکانی دەوڵەتدا کاریان دەکرد هەمیشە بێدەنگ دەبوون و دەیانگوت چاوەڕوانی شتی زیاتر لە ئێمە مەکەن. ئەو کەسانەی کە سیاسەتیان کردبوو وەکو راستییەکی ژیانی رۆژانە بە روخسارە پڕ لە هیوا و جەسارەتەکانی خۆیانەوە مەیدانیان دەخوێند. ئێمەش دەمانگوت" ئەم شەڕ و پێکدادانانە کە دەبنە هۆکاری خراپکردنی سروشت و کوشتنی مرۆڤەکان، ئەگەر بێت و لە کات و ساتی پێویستدا هەڵوێستی راست و باش نەنوێندرێت ئەو کاتە مانای ئەمە ئەوەیە کە نایانەوێ هەبوونی ئەوانی دیکە قەبووڵ بکەن". لە کاتە ساتی ئەمجۆرە گفتوگۆیانەدا دوای دەنگی پیاوەکان وتارەکانی زەینەب کە کاریگەرییەکی زۆری لە سەر هەر هەموویان دەکرد لە لایەن پیاوەکانەوە قەبووڵ دەکرا و ئەوانیش بە مەبەستی پاڵپشتی کردن و قەبوولکردنی وتەکانی زەینەب یا قووڕگی خۆیان خاوێن دەکردەوە یا بە شێوەیەکی ئاسوودەتر دادەنیشتن. جار جار بە هۆی ئەوەیەوە کە دەست بە پێکەنین نەکەم زۆر بە سەختی خۆم کۆنترۆڵ دەکرد. ئەو ژنانە کە تازە فێری شتی نوێ دەبوون بە چاوی فریشتەی رزگارکەر سەیری زەینەبیان دەکرد. زەلێ، پوورشەڤ، دایکم و زەینەب.....

گیرفانمان پڕ دەکرد لە تۆوی کوولەکە و لەگەڵ بەرفیندا پێکەوە دەچووینە سەر دارە قەیسییەکان، کاتێك کە تۆوی کوولەکەکانمان دەخوارد جارجار بۆ یەکترمان باس دەکرد کە ئەگەر وەکو بزن بڕۆینە هەر شوێنێکی سەخت و عاسێ ئەو کاتە ئەگەری لە دەستدانی پەردەی کچێنیمان لە ئارادایە. هاوکات بۆ ئەوەی کە باڵندەکان بە سەرماندا پیسی نەکەن دوعامان دەکرد. حەزمان دەکرد ئەو پیاوانەی کە لەگەڵیاندا ژیانی هاوسەری پێك دەهێنین لە ئەورووپا یا لە ئەمریکادا بن. کاتێك کە سوولاڤ مێردی کرد و چووەتە پاریس و

بێشەنگیژ دوای مێرد کردنی چوو بوو بۆ تورونتۆ زۆر گۆڕا بوون، بێجگە لەوەی کە فێری زمان ببوون و پەروەردەی خۆیانیان بەردەوام کردبوو، کاتێك کە دەهاتنەوە بۆ سەردان بۆ ئەو کەسانەی کە دەوری ئەوانیان دەورپێچ دەکرد باسی ژیانێکی باش و تەندروست و بەها و نرخی ژن بوونیان دەکرد. باوەڕمان نەدەکرد، خوێندن لە ئەورووپا و کردنە بەری جلی قۆڵ درێژ و بێ قۆڵ، بە مانای قاچ لە سەر قاچ خستن بوو. ئەو پیاوانە کە جوێنیان بە ژن و کچەکانی خۆیان دەدا، بە سوولاڤ و پێشەنگیان دەگوت خاتوون و بۆیان جگەرەیان دەپێچایەوە. جارێکیشیان دراوسێیەکمان بە ناوی عەزیٰ چاوی لە ئەوان کرد و بە بێ ئەوەی کە سەیری ئەو کراسەی بکات کە لە سەر زەویدا دەکێشا، قاچی لە سەر قاچ دانا بوو و لە نێو باخچەکەدا دانیشتبوو، کاتێك کە دایکی مێردەکەی ئەم رەفتارەی عەزیٰ بینی خوا دەزانێ چی لەو کچە داماوە کرد. کاتێك کە دەستی بە قاچە پیسەکانیدا دەکێشا بە ئێمەی دەگوت" بۆ چی دەکەنن ئەگەر ئەوان لە قوتابخانەی گاورەکاندا خوێندوویانە منیش قورئانم خوێندووە چیم لەوان کەمە". کاتێك کە ئەمانەی دەگوت پوورشەڤیش لە وەلامیدا وتی" لە بەکار هێنانی ئەو شتانەی کە لە لایەن گاورەکانەوە بەرهەم هێنراون هیچ سڵ نابیتەوە و هەتا دوا هەناسەیشت سەیری هەر هەمووی فیلمەکانیان دەکەی".

لەو کات و ساتانەدا هیچ نێوانی زەینەب و خانەوادەکەی باش نەبوو، ئەو ژنانەش دەیانگوت" مێردت نییە و بە تەنیای چ کارێکت هەیە لەوێ، قوتابخانەکان داخرابوون، گەرمایەك دەستی پێکردبوو کە هێلکەی دەکولاند. لە دوای ئەو بارانە چاوەڕوان کراوەیەدا ئەو باڵندانەمان بینی کە رەنگیان وەکو رەنگی سەموون بوو و لە سەر دارە تەڕەکاندا دادەنیشتنەوە و دەنگی ئەو منداڵانە دەهات کە شت و مەکی وردیان دەفرۆشت.

کاتێك کە رووبارە لێلەکە تێکەڵی رووبارە گەورەکە دەبوو و بۆنی گیا تەڕەکان ئێمەی سەرخۆش دەکرد، زەینەب بە پەنجەکانی خۆی قژەکانی شانە دەکرد و باسی سوقراتی دەکرد کە ژەهری خواردووە و گیانی لە دەست داوە. زەینەب دەیگوت" سوقرات بە تاوانی ئەوەی کە سەری لە جوانەکانی ئەسینا شێواندووە دەستگیر و ژەهر خوراو کراوە، هیچ بەرهەمێکی نووسراوی ناوبراو نەبووە، بەلام لایەنگرەکانی هەمیشە پشتگیرییان لە بیرو بۆچوونەکانی سوقرات کردووە و لە بەرانبەردا هاوسەرەکەی قەسانتیپی ژنێکی نەزان و جاهیل بووە. من زۆر حەزم لەم وتەیەی ژنەکەی سوقرات دەکرد کە زینەب هەمیشە باسی دەکرد" ژیانی هاوسەری پێك بهێنن ئەگەر هاوسەرەکەتان باش بێت خۆشبەختن بە پێچەوانەوە دەبنە فیلۆسەوف". دواتر

من چوون زۆر مەراقم دەکرد لە زەینەبم پرسی" ئایا تۆ بە هۆی خۆشبەخت نەبوونتەوە ئەم شتانە دەخوێنیتەوە؟"

زەینەب برێك راوەستا و لە وەلامی مندا وتی" نە جگەرم هۆکارەکان نەیك و نە دوونە هۆکار زۆرە،" ئەم وەلامەی زینەب بە شێوەیەك بە مانای قەبوولکردنی بیرو رای من بوو.

کاتێك کە گوندەکان لە رووی خەریتەوە رەش دەکرانەوە ئەو کاتە لە وەرزی هاوین لە دیاربەکردا بووین. نە رەنگە شینە بێ کۆتاییەکەی ئاسمان، نە رەنگی سەوزی دار و باخ و بێستانەکان و نە تامی شوکلاتەکان هیچ کامیان نەیاندەتوانی بۆ ساتێکیش ئێمە خۆشحاڵ بکەن. لە قوولایی زانستی مندا ئێش و ئازارێك هەبوو. کاتێك کە لە نێو ئەو کۆلانانەیدا کە بە سەرباز و ئالاوی سەربازی رازا بوونەوە تێپەڕ دەبووم تەنیا بیرم لە ئێش و ئازار دەکردەوە و بیرم لە نووستن لە نێو بالکۆنە گچکەکەی نهۆمی سەرەوە دەکردەوە. کاتێك کە فریوی پێکەنینێکم دەخوارد یا کاتێك کە لە نێو کافەیەکی لووکسدا دادەنیشتم هەستم بە تاوان و شەرم دەکرد. دواتر دەمگوت" باشە کە شەرم دەکەم چونکە شەرم کردن نیشانەی لە خۆیایی نەبوون و هەستکردن بە هەبوونی خۆم بوو."

کاتێك کە من فاوستم دەخوێندەوە لە قۆناخی ناوەندیدا بووم، شیعر و ئیلاهییەکانیشم دەخوێندەوە ئەو کاتە. لە کاتی بالغ بووندا لە زانکۆی ژنێڤ دەستم بە گێرانەوەی چیرۆکی" کاتێك کە خۆشەویستیم گوێبیستی من دەکات" دەکرد بە جۆش و هەیەجانەوە باسی فاوستم دەکرد.

شەوێك لە شەوان رۆحی فاوست لەگەڵ خۆیدا قسەی کردووە وتوویەتی" بۆ چی هەوڵ نادەی ببیتە وەك مرۆڤێکی راستەقینە؟" لە نێو قوولایی شەودا دەستی بە رۆیشتن بۆ نێو دنیای نێوخۆی خۆیدا کردووە و زۆر ناراحەت و نەگەڕان بووە. لەگەڵ خۆیدا دەست بە بازخواستی و لێکۆلینەوە و لێپرسینەوە دەکات، شووشەیەکی ژەهر دەردەهێنێ و ژوورەکەی دەجوولێتەوە، کاتێك کە دەستی بە خوێندنەوەی دوعای مەلائیکەکان بتپارێزن دەکات شووشەی ژەهرەکە لە دەستییەوە دەکەوێت. دەگەڕێتەوە بۆ ژووری کارکردنی، وەکو هەلگری ئەو کولتوورە دینامیکەی نێو کۆمەلگا وەستاوەکەیدا لە نێوان ژیانی ناوخۆ و هەندەراندا پارچە دەبێت.

فاوست لە سێ قۆناخی جیاوازدا تێپەڕ دەبێت. لە یەکەم مەرحەلەدا خەیاڵ پەرستە و لە راستییەکان زۆر دوورە. لە مەرحەلەی دووەمدا شەیتان لە رێگای مەپهیستوپهەلسەوە دەبێتە چیرۆکی تراژدیای خۆشەویستییەك. لە قۆناخی سێیەمدا کۆتایی بەم تراژدیایە دێت و بۆ بەرزترین پلەی پێشکەوتن بەرز دەبێتەوە. کاتێك کە فاوست لەگەڵ هەپهیستوی شەیتاندا کار دەکات

دەبێتە مرۆڤێکی باش و شەیتانیش خۆی دەخاتە شوێنی ویژدانی فاوستەوە و هەست و بیرو بۆچوونە مرۆڤ دۆستەکانی فاوست دەسڕێتەوە، بۆیە شەڕی فاوست و هەپهیستوی شەیتان دەست پێدەکات. هەر چەندە هەوڵی ئەوەی داوە کە ئەوی بکات بە دوژمن بەڵام، بە هیچ شێوەیەك ناتوانێ بیخاتە نێو کەمینەکەی خۆیەوە. بە ئەوەندەی ئەوەی کە لەگەڵ رۆح و جەستەی مرۆڤەکانی دیکەدا یاری نەکات جدییە، دواتر هەست بەوە دەکات کە بۆ پەیوەندی خۆشەویستی ئامادەیە. فاوست لە سەرەتایەوە تامەزرۆی پێشکەوتن و زانیارییە. باسی ئەمە بۆ مەپهیستو دەکات. فاوستەکانی رابردوو رۆحەکانی خۆیان دیلی زۆر شتی بەسیت و بێ نرخ کردووە بۆیە لە بەرانبەر پارە، شەهوەت و ناو و نیشاندا نەیانتوانیوە سەرکەوتن بە دەستەوە بهێنن.

شانسی ئامادە بوون بۆ خۆشەویستی ئەمجارە روو لە گرتچەن دەکات، ئەمە یەکەمین خۆشەویستییە. مەعسوومیەتی منداڵی گرەتچەن دواتر دەبێتە فەریبکارییەکی بەرفراوان و هاوسەنگ بوونی هەڵسووکەوتەکانی کاریگەری لە سەر دەکات. گرتچەن بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر شەیدای فاوست دەبێت و فاوستیش دەکەوێتە نێو هەیەجانێکی بێ حەدەوە، چونکە لە نێو خۆیدا هیچ ئامادە بوونێکی بۆ خۆشەویستی و حەز کردن نابینێت. بۆیە شارۆچکەکە بە جێ دەهێڵێت و روو لە سروشت دەکات. مەپهیستو بە زمانێکی گاڵتەجاری رەخنە لە هەڵسوکەوتی فاوست لە بەرانبەر سروشت دەکات و دەڵێت" ئەگەر دەتەوێ لەگەڵ سروشتدا یەك بگری پێویستە ئامادە بیت بۆ رووبەڕوو بوونەوەی ئاکامەکانیشی".

گرتچەن دوو گیانە و دواتر کۆرپەڵەکەی دەمرێت و بە تاوانی کوشتنی کۆرپەڵەکەیەوە دەکەوێتە زیندان و دادگایی دەکرێت. لەم کات و ساتانەدا فاوست خۆی دەگەیێنێتە گرتچەن و پارێزگاری لێ دەکات و هەوڵ دەدات لە گرتووخانەدا رزگاری بکات. کاتێك کە باوەشی پێوە دەکات ئەو کاتە تێدەگات کە باوەشی گرتچەن وەکو جاران نییە و زۆر ساردە. لە راستیشدا فاوست وا دەزانێت کە گرتچەن بارێکی گرانە لە سەر پشتییەوە بۆیە زۆر حەزی لێ ناکات. گرتچەن هەر لە گرتووخانە دەمێنێتەوە و گیانی خۆی لە دەست دەدات. دواتر فاوستیش دەیەوێ ببێتە وەکو مرۆڤێکی نوێ. ئانارام و سەر رەقە و هەمیشە لەگەڵ ئەو خەیاڵەتانەی کە دەکەونە بەرچاوی شەڕ دەکات و دەڵێت" هێشتا من کۆتاییم بە شەڕی ئازادی نەهێناوە." ئایا فاوست بە ئەوەندەی کە یەك رەخنە بێت هەر ئەوەندەیش مەیدان خوێندن نییە؟" (مەبەست لە مەیدان خوێندن سەر راکردن لە بەرانبەر کەسێك یا راگەیاندنی شەڕ لە بەرانبەر کەسێکە. وە)

کاتێك کە بۆ یەکەمین جار ئەم چیرۆکەم خوێندەوە خۆم زۆر بە نزیکی گرتچەن دەزانی، من وەك گرتچەن بووم و زۆربەی ژنەکانیش وەکو گرتچەن بوون.

کاتژمێر پێنج و ٤٥ خولەیەکی پاش نیوەڕۆیە، لەم کاتژمێرانەدا ناکۆکییەکانی نێو مێشکم سەریان هەڵدەدایەوە. بیرم لەو لای ئەو خاڵانە دەکردەوە کە جێ گومان و سەرنج بوون. ڕەنگدانەوەکان و ئایین ! گوڵیش کە کۆك و بنەمای خۆی لە خۆشەویستی وەردەگرت. ئەو پەردەی کە بە بیروڕامەوە بەسترابوو و زەوقەکانیشی تێپەڕاندبوو. کاتێك کە سەرقاڵی نووسینەوەی ئەم کاتژمێرانە لە نێو دەفتەرەکەمدا بووم جارێکی دیکە ڕوونی تەلەفۆنی بۆم کرد. کاتێك کە هاوارم کرد "دەنووسم ! ئەگەر زەحمەت نەبێ بە دەنگی ڕۆمانسی قسە مەکە." لە وەڵامدا وتی" بۆ بەشداریت لە ئاهەنگی خەڵات وەرگرتنم نەکرد؟ و دواتر وشەکانی خۆشەویستی یەك لە دوای یەك پێشکەشی منی کرد و منیش کەنیام". ڕوونی لاسایی منی دەکردەوە کە دەبوایا وەکو ئەکتەرێك لە نێو ئاهەنگەکەدا وتەیەکم پێشکەش بکردبایا. کەسایەتییەکی لێهاتوو هیچ کات هیچ جۆرە وشەیەك بۆ کەس ناهێڵێتەوە. بە هەبوونی خۆی ئەمر لە سەر مرۆڤەکان دەکات. ئایا دەسەڵات تەنیا پەیوەندی نێوان ئەوانەی کە یەکسان نەبوون، نەبوو؟

ئێمە پارچە ماندوو بووەکانی کۆمەڵگەیەك بوون کە هیچی پێوە دیار نەبوو. زۆر درەنگ فێری ڕووبەڕوو بوونەوەی بە جەسارەت لەگەڵ خۆماندا بووین. کاتێك کە هەبووم و بەجۆرەیش بە دەر دەکەوتم و مرۆڤەکانم لە دەنگەکانیان دەناسییەوە ئەو کاتە هەر شت جارێکی دیکە تێکەڵ دەبوویەوە. ئەو ڕێگایە کە بەرەو ئازادی دەڕۆشت لە سەرتاپا هەر هەمووی ئێش و ئازار و گونا و تاوانباری بوو چونکە ئازادی مەعسووم نەبوو !

لە پشوویەکی هاویندا مستەفا کەماڵمان ناسی. یەکەمجار زۆر دوور بوو. کاتێك کە بەو چاوانەی کە چۆنە نرخی شتێك دەستنیشان دەکەن سەیری کرد تێگەیشت. کاتێك کە لە دوای سەرهەڵدانەکەی دەرسیم باوکیشی لەگەڵ خەڵکەکانی دیکەدا دەرسیمی بە جێ هێشتووە و ڕووی لەم دەڤەرانە کردووە ئەو کاتە تەمەنی تەنیا ١٣ ساڵان بوو." هیچ کات پەیوەندییەکانی ئێمە لەگەڵ گونددا نەپچڕان، تەنیا لەگەڵ دانیشتووانی ناوچەکەی خۆماندا ژیانی هاوسەریمان پێك دەهێنا، بەڵام بۆ یەکەمجار من ئەم داب و نەریتەم پێشێل کرد." کاتێك کە وتی من لەگەڵ یەکێکی ئادالیدا ژیانی هاوسەریم پێك هێناوە و زۆر خۆشبەختم"، وێنەیەکی سەر دیواری پێ نیشان دام، کاتێك کە هاوڕێکانی خۆی کە لەیەکەم یاریدا پێکەوە پارییان کردووە بە منی ناساند، ئاماژەی بە وێنەی مستەفا کەماڵ کرد بە پێکەنینەوە وتی" هاوناوی یەکترین "...

کاتێك کە زەینەب وتی" دەمەوێ لەگەڵ باوکتدا تۆزێك قسە بکەم" لە وەڵامی زەینەبدا وتی" بە هیچ شێوەیەك نابێت" چونکە باوکم زۆر بەدرەفتار و بێ خۆ و ناياسايیە. کاتێك کە توورە دەبێت یا لە کاتی نووستن و سەرشۆردندا لەگەڵ دایکمدا هەر بە کوردی قسە دەکات. پێغەمبەری باوکم ئاتا تورکە. ناوی براکانم عیسمەت، فەوزی و زیا و ناوی خوشکەکانیشم سەبیحە و ئۆلکۆیە. لەم ساڵانەی دواییدا هیچ پەیوەندییەکی ئێمە لەگەڵ گوند و دەڤەرەکەی خۆماندا نەما. نە باخ ماوە و نە باخچە! خوشکی من نابێت ئەم جیا بوونەوە بەجۆرە بێت...

کاتێك کە بۆ جەژنەکانی نەورۆز ئەو رۆژنامەنووسانەی کە لە هەر چوار لای جیهانەوە دەهاتن، دەست بە سەر دووربین و ئالاوەکانیاندا دەگیرا و رۆژنامەنووسەکانیش راپێچی گرتووخانە دەکران و لێپێچینەوەیان لەگەڵدا دەکرا. کریستیانا، دوروسە، ئەلەنی، تینا، نیك و ژوان هەمیشە میوانە سەرەکییەکانی جەژنی نەورۆز بوون. چرچەکانی روخسارەکانیان کە هەر ساڵ دەگۆڕدران ئەوەی بە من دەسەلماند کە منیش گەورە بوومە. لەگەڵ خۆیاندا زۆر نەرم و نیان و خۆش کردار بوون و ئەو شتەی کە بۆ خۆیان داوایان دەکرد بۆ ئەوانی دیکەیش داوایان دەکرد. هەست و زانا بوونی ئەوان پڕ بوو لە خۆشەویستی. ئەوان زۆر بە باشی دەیانزانی کە پێگەی کۆمەڵایەتی ئەوان تەنیا و تەنیا بە هەبوونی مرۆڤەکانی دیکە دەتوانێ ببێتە خاوەن واتا و مانا. ئەوان ئاستی خۆیەتی و من منیەتی و خۆشەویستی پارەیان تێپەڕاند بوو و گەیشتبوونە ئاستێك لە ئازادی. بە هۆی ئەوەیەوە کە زەینەب زۆر بە باشی منی گەورە و پەروەردە کردووە زۆر مەدحی زەینەبیان دەکرد. کاتێك کە منیش هەستم بە خۆشحاڵی و سەربەرزی زەینەب دەکرد زوو بە زوو دەچوومە نێو ژوورەکەمەوە و سەیری ئاوێنەکەم دەکرد و دەمگوت" تۆ زۆر خاوەن شانسی". دواتر کاتێك کە سەیری دەس نووسە لار و وێرەکانی خۆمم دەکرد دەمگوت" بە جەستەی خۆت مەنازە و متمانەی پێ مەکە بەڵکو پێویستە متمانە بە مێشکی خۆت بکەی".

کاتێك کە باسی ڤافقا، سەرتره، داستایۆڤسکی و ژویسە دەکرا هەر هەمووی رووداوەکانی نێو شار لە بیر دەچوونەوە. دەنگەکان هەر هەموویان یەکیان دەگرت و ئاماژەیان بە ناکۆکییەکانی نێوان تاك و کۆمەڵگە دەکرد. باسیان لە شاتۆ و دۆزی ڤافقا دەکرد، منیش چەند جار دەستم بە خوێندنەوەی ئەم رۆمانانە کرد، بەڵام تەواوم نەکردن ئەمە لە کاتێکدایە کە رۆژانێکی دوور و درێژ بوو کە سامسای گرەگوور لە نێو مێشکمدا جێ بۆ خۆی دۆزیبووەوە. ئەو رۆمانانەی کە رووداوی زۆریان تیادا بوو بۆ من زۆر سەرنجڕاکێش نەبوون. تەنیا ئەو

هەڵبەستانەی کە بەرەو دنیای دەروونییەوە دەڕۆیشتن بڕێك سەرنجی منیان رادەکێشا.... کاتێك کە ئەو غرووورەی کە دار بەرنادا و رەفتارە تووڕەکانی ستەندهیال، ژۆلیەن سورەل، حەیرانیەتی داستایۆڤسکی و تیپە تێکەڵ کراوەکان سەرنجی منیان رادەکێشا لە کۆتایی نەهاتن بە مۆبلیاتە بێ ماناکانی بالازاج و موجەوهەرەکانی، منی زۆر ئازار دەدا. لە کۆڵانەکانی بالازاجی پاراگۆز، ژویسە و دۆبلیندا گەڕام و ماندوو بووم و مێشکم تێك چوو. هەر چەندە لە سەرەتادا بلووم بۆ من سەرنجڕاکێش نەبوو بەڵام دواتر بە پێچەوانەوە حەزم لێ دەکرد. بلووم شێواوە، بەڵام بە هێز و زانا بوو. دواتر بێدەنگ دەبووین. کاتێك کە بیرەوەرییەکانی دڵشاد، ڤیڤالید و رودێرگو وەکو ئەوریشم رۆحی منیان ئازار دەدا، ریتمی دڵ و تاوی دەمم دەگۆڕدرا.

کاتێك کە زەینەب لە پەنجەرەکەوە سەیری کۆڵانەکەی کرد و وتی " مامەکانی ئێمە سەری کۆڵانەکەیان گرتووە"، دوروسە و نیکیش لە پشتی پەنجەرەکەوە ئەوانیان تەسویر دەکرد، بەڵام ژوان لە جێی خۆی نەجووڵایەوە چونکە دەیزانی کە دواتر ئەو وێنانەی لە لایەن ژوان و دوروسەوە کێشراون دەدرێنە خۆیشی. ئەو تانك و چەك و ئالایانە کە وەکو کابووسێك باڵیان بە سەر هیواو و ئاواتەکاندا دەکێشا...

کاتێك کە رۆژنامەنووس، مامۆستا و وڵات پەروەرەکان یەك لە دوای یەك دەکوژران یا کاتێك کە ئەو کەسانەی کە تێکەڵی هیچ شتێك نە ببوون دەکوژران ئەو کاتە مێشك و عەقڵی هەر کەس رادەوەستا. لە نێو مەخزەنەکانی نهۆمەکانی خوار و ژێر زەویدا جەنازەکان دەردەهێنران، منداڵەکان لە سەر کۆڵانەکاندا دەسماڵیان دەفرۆشت و زبڵەکانیان تێکەڵ دەکرد. ژمارەی ئەو ژنانە کە بۆ بژێوی ژیانیان روویان لە لەشفرۆشی کردبوو رۆژ لە دوای رۆژ لە زیاد بووندا بوو. لە ناکاوەوە پیاوە رێکوپێکەکان دەردەکەوتن. لە دوای ئەوەی کە بە چاوی رزگارکەر سەیری کچە جوانەکان و بێوە ژنەکانیان دەکرد و خۆیانیان نزیکی ئەوان دەکردەوە و دڵی ئەوانیان بە دەستەوە دەهێنا، ئەو کاتە بەرەو سرپەتەوە هەنگاویان دەنا. ئەو ژنانە کە رۆحەکانیان گیرودەی تاریکی ببوو بۆ ئەوەی کە کۆتایی بە ژیانی خۆیان بهێنن ناچار دەمان کە مەرگەمووش بخون. (مەبەست لە مەرگەمووش ئەو دەرمانەیە کە بۆ کوشتنی مشکەکان بەکار دەهێنرێت.وە). بە قاچەکانی خۆیانەوە بەردیان دەبەست و خۆیان فرێی نێو رووبارەکان دەدا یا خۆیان بە بەن دەخنکاند ، یا بە چەك خۆیانیان دەکوشت.

کاتێك کە لەگەڵ بەرفیندا لەوبەری قەراخەکانی رووبارەکەدا گیامان کۆ دەکردەوە، چیرۆکی جۆراوجۆرمان لە بەیدئاباد و شەهرزاد بۆ یەکتر دەگێڕایەوە. خاڵی بەرفین کە لە ئەورووپاوە

گەڕابووە وێنەی ئێمەی دەکێشا و قسەی بەساڵا چووەکانیشی تۆماردەکرد. جارێکیان لەگەڵ خۆشەویستەکەی خۆیدا گەڕابوویەوە. بە مەبەستی گەڕان لە نێو زیارەتگاکانی یزەدییەکان و چاوپێکەوتن لەگەڵ ئاسووری و کەلدانەکاندا چەند مانگێك مایەوە. بە هۆی ئەوەیەوە کە خاڵی لەگەڵ خۆشەویستەکەی فرنچسیو بەبێ نیکاح پێکەوە دەژیان هەر جار پێیان وتووە" لە نێو ماڵی ئێمەدا بەرەکەت نەماوە، رووبەرووی کارەسات دەبینەوە، پێویستە بڕۆن بۆ لای مەلا و نیکاحی خۆتان بکەن". بە مەبەستی بەشداریکردن لە ئاهەنگەکانی نەورۆز دەبوایا چووبانا بۆ قەراخەکانی ئەو بەری رووبار، فرنچسیو قاچەکانی خۆی هەڵدایەوە، زۆر سپی وەك بەرف بوون و ئەوانەی کە قاچەکانی فرنچسیویان دەدیت دەیان گوت" تۆبە تۆبە". مەلاکەش لە ژێر چاوەوە سەیری دەکرد و دەیگوت زۆر جوان و باشە، بەڵام جوانەکان گومڕا دەکەن و ئەمەش عەیب و گوناهە." کاتێك کە خاڵی بەرفین فرنچسیوی بەباوەش گرتوو بردی ئەو بەری رووبارەکەوە دەمی مەلا بە کراوەیی مابووەوە و دواتر وتی" هەی مونافق".

ئایا ئەو بارانە زەرد کە بۆنی خەردەڵی لێوە دەهات ئامادە کاری بۆ فیلمێکی خەیاڵی بوو؟ ئەو گیایانە و ئەو دارانەی کە رەش ببوونەوە، ئەو ئاژەڵانەی کە پارچە پارچە کرابوون و هەر یەك لە بن دیوارێکدا کەوتبوون....

کاتژمێر شەشی ئێوارەیە، هەر چەند کە کات تێپەڕ دەبوو نائارامی و نائاسایی بوونی بارودۆخی منیش دەستی پێ دەکرد. لە نێوان هەستی پێ نەگەیشتن و بیستنی هەواڵێکی نەخۆشدا گیرم دەخوارد. هیچ کۆتایی بە نائارامی و نائاسایی بوونی بارودۆخی من نەدەهات. دەنگێك لە نێو دڵی مندا دەیگوت" هاندانی هەبوون لە لایەن رۆحەوە تەنیا بە کەلکی سەرهەڵدان دێت". ئەو دەنگەی کە لە ناخمدا منی هۆشیار دەکردەوە زۆر بەهێز بوو، هاواری دەکرد" واز بێنە لەم وەزعە مەحجووب و شەرمنانە". کییە کە حەز نەکات ببێتە باشترین، جارێکی دیکە دەست پێ مەکەوە".

تەمێکی پرتەقاڵی دۆڵەکەی خوارەوەی داپۆشی بوو. نەسیمە فێنکەکان بۆنی منداڵی منیان دەهێنا. کاتێك کە لە ترساندن و ترس تێگەیشتم ئەو کاتە هیچ سەیری دەست و برینەکانی سەر دەستەکانم نەدەکرد. تەنافە باریکە درێژەکە هەر وەکو ئەوەی کە سووتابێت دەکەوتە بەرچاو، کاتێك کە گوشارم دەخستە سەر ترس و سەیری شوێنە دوورەدەستەکانم دەکرد ئەو کاتە هەستم بە بەهێز بوونی خۆم دەکرد. بە هۆی نووسین و لە بیرنەکردنەوەی ئەو شتانەی کە دەم نووسی هیچ کات نەبوون وەکو جەستەیەکی بێ رۆح، چونکە جەستەی بێ رۆح بە مانای لە

بیرکردنی رووداوەکانە. هەستی هەبوون بەو وشانە کە دەمهێنانە سەر زمان و شەیدا بوونی ئەو وشانەم بەبیٚ کاریگەر کردبوو و هەولّم بۆ مانایەکی راستەقینە و سەرکەوتنێکی باش دەدا.

بۆنێکی نادیاری بخورد لە هەوادا دەهات. کاتێك کە هەتاو بەرەو ئاوابوون دەڕۆشت جۆگەکانیش دەبوون وەکو تەنافێکی درێژی شین و لەو لایشەوە شەوقی نێو بالآخانە بەرزەکان بە دەر دەکەوت. دەست و ئێسقانەکانی من دەستیان بە ئێش و لەرز دەکرد. ئایا من ئەو کەسە بیٚ هێزە بیٚ عارە بووم کە زۆر ژیاوم، لە رێگای نووسینەوە بەرەو رابردوو بەرێکەوتبووم و دەمویست کەفارەتیٚ خۆم بدەم یا لە ژێر گوشاری ویژداندا خۆم رزگار بکەم؟ مۆمکێنە ئیعتیرافکارێك بم کە زۆر شت لە نێو دلّمدا بێت و مۆمکینە مرۆڤێکی کیندار بم.....

کاتێك کە من هەولّم دەدا پیٚ لەو گیایانە کە لە نێو بەردەکاندا سەریان دەرهێناوە نەکەم زەینەب وتی" پێویستە خالّی دەرچوونمان خۆمان بین و خالّی سوورانەوەیشمان هەر خۆمان بین". کاتێك کە سەیری کانالّە تەلەفزیۆنییەکانم دەکرد دەنگی چەکەکان بێدەنگی وتاریکی شەویان دەدڕاند و سەگەکانیش دەستیان بە هەراوهۆرا دەکرد. کاتێك کە زەینەب بە تەلەفوون سەرقالّی قسە کردن بوو، منیش لە پشتەوە بەو پەڕی خۆشەویستییەوە سەیری زەینەبم دەکرد. لە دەنگە گیراوەکانی زەینەبدا تێگەیشتم کە رووداوی نەخۆش رووی داوە. لە پشتی رۆژنامەکاندا خۆم درێژ کرد و دواتر گلۆپەکانی کوژاندەوە و دەرگاکەی کۆنترۆلّ کرد، بەلاّم لە لای مەخزەلەکەدا دەنگی ئاو دەهات، تپ، تیپ، تپ....

گوللە هەر وەکو باران بە سەر ئەو مرۆڤانە کە دەیانەویست کردەوەکریارە نادیارەکان شەرمەزار بکەن باریابوو، هەر هەمووی هالّ و کریدۆرەکانی تەوارییەکان پڕ بوو لە بریندار. کاتێك کە چووینە تەواری لە نێو رێگادا شەپۆل شەپۆل دەنگی سلۆغان لە نێو تانکەکاندا دەهات، لە نێو تەواریدا دەمەقالّەیەك لە نێوان زەینەب و یەکێك لە ئەفسەرەکاندا هاتە ئاراوە، هەر چەند زمانە تورکییەکەی زەینەب تا رادەیەك کارئاسانی بۆ ئێمە دەکرد، بەلاّم لە نێو تەواریدا هیچ سوودێکی نەبوو. من تا ئێستا هیچ زەینەبم بەجۆرە نەدیتبوو، بەو روخسارە سوور بووەی خۆی بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد لە سەر ئەفسەرەکە و دەیگوت" ئەگەر دەولّەتێك نەتوانیٚ ئەمنیەت و ئاسایشی من بپارێزێت ئەو کاتە من بۆ چی خاوەنداریەتی لەو دەولّەتە بکەم". زۆر بە خێرایی ئێمەیان سواری پاسێك کرد. هەتاویش لە سەر سەرماندا بوو، لە سەر کورسییەکاندا دانیشتین، بۆنی عەرەق و خوێن دەهات. لەنێو پاسەکەدا کەلەسەکان رابوون و جارێکی دیکە داخرانەوە و ئێمەیش تەنیا سەری خۆمانمان دەپاراست. کاتێك کە گەیشتینە بنکەی ئاسایش منیان ئازاد کرد. منیش بە هیچ کەسم نەگوت کە حالّمان بەجۆرەیە. سیٚ رۆژ و سیٚ شەو چاوەڕوانی زەینەبم کرد. هەمیشە وا هەستم

دەکرد کە دەستێك قوورگم دەفشێرێت و هیچ نەمدەتوانی لەسەر قاچەکانمدا رابوەستم. لە سەر تا پێ ببووم بە پارچەیەك سەهۆڵ. لە نێو بالکۆنەکەدا بە تەنیا سەیری دووره دەستانم کرد و وتم" ئاه دایکی من، ئاه باوکی من ، ئاه کاکی من، ئاه زەینەب"

کاتێك کە نیوەشەو لە خەودا هۆشیار بووم دیتم کە لە نێو باوەشی زەینەبدام. زەینەبیش بە هێمنی خۆی خوار کردەوه و وتی" خۆشکی من، دایکی من، زۆر بە نەرمونیایی سینە نەرمەکەی خۆی بە دەموچاوی مندا کێشا، رۆژێك لە دوای ئازاد بوونی زەینەب ماڵەکەمان پڕ بوو لە مێوان. هیچ کەسیش بە دەستی خاڵی نەدەهات. بەو شتانەی کە بۆمانی هێنایان بوو زیاتر لە ١٥ رۆژ گوزەرانمان کرد. کاتێك کە فشاری دیالکتیك بەرزدەبووەوە و باوەرییەکانیش کۆکەکانی خۆیانیان دەهەژاند ئەو کاتە هەر هەموویان دەبوون وەکو وشەی زمانە جۆراوجۆرەکان و بەشەکانی دیکەی گوێ زەوی. بێجگە لە جەوهەر و متمانە کردن بە خۆیان پڕ بوون لە نهێنی ئەوانی دیکەیش.

کاتێك کە باس لەو کەسانە دەکرا کە بە زۆر خەراج و باجیان کۆ دەکردەوە، ئەوانەی کە گومان لە سەریان بوو، ئەوانەی کە ئارامی و ئاسایشی کووچە و کۆڵانەکانیان تێك دەدا و کاتێکیش کە باسی ئەو کەسانە دەکرا کە لەگەڵ مەرگدا دەست و پەنجەیان نەرم کردووە من دەمەویست لە نێو تێپەڕ بوونی کاتدا بگەمە ئەو ئازادییەی کە زۆر بیرم لێ دەکردەوە. کۆمیتەکانی هاوکاری دامەزرابوون، هەر کەس وەك مووررییەکان هاوکاری یەکتریان دەکرد، زۆربەی ئەو شتانە کە کۆدەکرانەوە بریتی بوون لە پاڵتۆ، جلی گەرم و پەنجەوانە. ئەو هەوڵدانانە دەبوون بە هۆکاری ئەوەی کە راستییەکانیش زۆرتر خۆیان بنوێنن. ئەمە بۆ باوەڕ کردن بە راستییەکان بوو، نازانم هەر چۆنە دەبوو ئەوانەی کە راستییەکانیان باوەڕ دەکرد هەر ئەوانە بوون کە زۆر دەترسان. ئەو کەسانەی کە لە نێو ماڵەکانی خۆیاندا وێنەی ئاتاتورك و ژەنەراڵەکانیان هەڵواسیبوو، سکاڵایان لە سەر خزم و کەس وکارە نزیکەکانی خۆیانیش تۆمار دەکرد. ئەو منداڵانەی خۆیان کە لە سەر رێگای راست لایان دابوو بە بێ ئەوەی کە چاوێك بە بارودۆخیان بخشێننەوە پێشکێشی سوپایان دەکردن و سوپاش گوایا بە مەبەستی شەڕ لە دژی تیرۆر ئەو منداڵانەی بەکار دەهێنا. بۆ ئەوان سەرهەڵدانەوە لە بەرانبەر دەوڵەت بە مانای سەرهەڵدانەوە لە بەرانبەر خوادا بوو. ئەوان متمانەشیان بە خۆ و مندانەکانی خۆیانیان نەبوو، ئەمە زۆر سامناك بوو کە سەیرم دەکرد باوکێك متمانەی بە منداڵی خۆی نەبێت. جێ پێ

ئەسپ و جێ پێ پیاوە سووك و ناپیاوەکان تێکەڵ کرابوون. نەخۆشییە بەربڵاو بووەکانیش لەنێو کۆمەڵگەدا دەسووڕانەوە...

کاتێك کە لەگەڵ بەرفیندا لە سەر نوینگەکانی خۆمان کە بۆنی خۆریان لێوە دەهات ئەستێرەکانمان دەژمارد و بۆ خۆمان خەیاڵمان دەکردەوە، ناخی ئێمە پڕ دەبوو لە هێز. ئەو دەنگانەی کە لە نێو مانگەشەوی بێ شەوقدا بەرز دەبوونەوە، بۆنی بخورد، ئەو عەرەقەی کە لە نێو لەشماندا دەهاتە خوارێ، ئەو دەنگەی کەواڵ کە بەبێ وەخت و ماوە دەبیسترا لە نێو بێدەنگی شەودا بزر دەبوو. ئێمەش باوەشمان بە یەکتردا دەکرد و ئاگری جگەرە هەڵدەگیرسا و دەکوژایەوە، دەنگی جیرەجیرِ لە تەختەکانی سەر بانەکاندا دەهات. کاتێك کە دەنگە دەنگی ئەو ژن و مێردانەی کە تازە ژیانی هاوسەرییان پێك هێنابوو دەبیست، بێدەنگ دەبووین و لە نێو خۆماندا دەستمان بە پێکەنین دەکرد. دایکم بە بیانووی ئاو خواردنەوە هەڵدەستا و دەهاتە لامان و گوێی منی رادەکێشا و دەیگوت" زۆر عەیبە". پوورە پوورە شەیڤیش لە سەر سەرماندا دەستی بە بۆڵەبۆڵ دەکرد و بەو دەنگە داوودیانەی خۆیەوە بێدەنگی شەوە زەنگی لێ حەرام دەکردین. کاتێك هەستمان بە جیاواز بوونی پوورشەڤ کرد کە وردە وردە بایەخی ئەو جیاواز بوونەی لە دەست دەدا. کاتێك کە لە دوور دەستانەوە دەنگی هەراوهۆریای سەگەکان دەهات من و بەرفینیش سۆزی ئەوەمان دەدا بە یەکتر کە هەتا هەتایە هاوڕێی یەکتر بین. ئێمە وا خەیاڵمان دانابوو کە پێویستە بخوێنین برۆین بۆ سینەما، ماشین لێ بخۆڕین و یاری شەترەنج بکەین. کاتێك کە سەیری ڕێگای ئەستێرەکان و زەنگی شەومان دەکرد، قژەکانی ئەو پشیلەیە کە لە نێوانماندا خۆرخۆری دەکرد بە سەر و رووماندا بەڵاو دەبوونەوە و خەوی ئێمەش دەچوو. هەر بۆیە چاوەڕوانی ئەوەمان دەکرد کە ئەو ئەستێرانە کە باسمان دەکردن لە یەکتر بدەن.

زۆربەی جارانیش کە دەیانگوت بەرەبەیان هێزە سەربازییەکان دێن، ئێمەش لە نێو کونجێکدا خۆمان حەشار دەدایەوە و بەو هەستە منداڵانەی خۆمان بیرمان لە بێ کۆتایی دەکردەوە و دەستمان بە دۆعا کردن دەکرد. کاتێك کە چاوە گەورەکانی بەرفین لە نێوتاریکی شەودا دەدرەخشانەوە، سازە پارچە کراوەکەی کاکم و کراسە دڕاوەکەی دایکم و دەنگی ئەو بێ تەلانەی سەربازەکان خەوی منیان دەرەواند و ئازاریان دەدام...

رۆژێك بەیانی بە بۆنی گۆشتی سووتاو لە خەو هەڵستام. دوو کەس لە بەردەم هاوسەرەکانی خۆیاندا بەنیان بە دەست و قاچەکانی خۆیانەوە بەست بوو و خۆیانیان سووتاند بوو. ئەو دوو کەسە کە ببوون بە تۆپێك لە ئاگر هاواریان دەکرد" ئاگرەکە نەکوژێننەوە".

کاتێك کە بیرم لە رووداوەکانی هاوینە هەوارەکە دەکردەوە زۆر شت کاریگەری دەکردە سەر مێشکی من. قۆناخی راهاتنم، ترس و ئێش و رۆحیەتی تاوانبار بوونم لەگەڵ ئەو هێزەی کە منی کردبوو بە من تەنیا و تەنیا شەڕ بوو. ئەو شەڕە کە من لە نێو قووڵاییدا بووم و ببووم بە پارچەیەکی حاشاهەڵنەگری، مرۆڤەکان تەنیا بریتی لە هەستی من منی نین، هاوکات بەشێکن لە رووداوەکانی دژ بە خۆیان و ئەو شتانەی کە لە دەرەوەی ئیرادەی ئەوان روو دەدەن.

ئەو بووکە گچکە منداڵانە کە لە بەرەبەیاناندا بۆنی باشی و هەژارییان لێوە دەهات، خەیاڵی ئەوەیان دەکرد کە ببن وەك سووڵاڤ و بێشەنگ. کاتێك کە قەیسییەکانیان کۆ دەکردەوە وەکو ئەسپ نەدەچوونە سەر دارەکانەوە، لە بەرزایەکانەوە بازیان نەدەدا. ئەو کاتە ئێمەش هەر وامان دەکرد لە شوێنە بەرزەکانەوە بازمان نەدەدا، چونکە ئەگەر لە کاتی پێکهێنانی ژیانی هاوسەریدا پەردەی کچێنیت نەبوایا بە ناچاری و بە سەر شۆڕی بۆ ماڵی باوکت بەڕێ دەکرایەوە. لەگەڵ بەرفیندا بریارمان دابوو لە نێو یەك قوتابخانەدا ببین بە مامۆستا، لەگەڵ مێردەکانماندا پێکەوە نان و خواردنمان ئامادە دەکرد و بە هیچ شێوەیەك قەبووڵمان نەدەکرد کە مێردەکانمان لێمان بدەن.

برازا و براکەی مولکییە بە بیانووی رۆیشتن بۆ ئاهەنگێکی دەعوەت گێڕان لە ماڵەوە دەرچووبوون و نەگەڕا بوونەوە. لە نێو رۆژە ساردەکانی زستاندا بووین. کاتێك کە مولکییە بە مەبەستی سەردانی خانەوادەکەی سەفەری ئانکارای کرد ئێمەیش لەگەڵیدا چووین. هاوکات لەگەڵ دەرکەوتنی هەتاوە بێ هێزەکە بەرفەکانی سەر بانەکانیش دەتوایەوە. لە دەوروبەری باڵاخانە و بینایەتە بەرزەکاندا دەنگە دەنگی رەشەبا دەهات. باوکی مولکییە زۆر نیگەرانی ئەو کەسانە بوو کە لە دژی دەوڵەت سەریان هەڵدابوو. لە ناراستە کردنی وشە ناڕاستەوخۆکان بۆ ئێمە هیچ وازی نەدەهێنا. دایکی مولکییەش سەیری بۆشایەتییەکەی دەکرد و دەیگوت" یا عەلی بە هاوارماندا بێ". دایکی مولکییە بە قژەکانی خۆی کە گزکی زەرەتی بە بیری من دەهێنایەوە و بەو چاوە گەورانەیەوە هەر وەك چەرمە سوورەکانی ئامازۆن بوو. سەیر کردنە نەخۆشەکانی باوکی مولکییە کە مولکییە پێیان ناڕەحەت دەبوو نەمجارە روویان لە زەینەب کردبوو. زەینەبیش بەبێ ئەوەی کە دەست بە دڵ خۆشی دانەوەی باوکی مولکییە بە قسەی پڕو پووچ بکات باسی لەوە دەکرد کە ئەگەر دەوڵەتێك کە نەتوانێت لە رووی ئابووری و گوزەرانییەوە ئاسوودەیی و ئاسایشی هاووڵاتییانی خۆی فەراهەم بکات ئەو کاتە چارەنووسێکی زۆر ئاڵۆز چاوەڕوانی دەوڵەتێکی بەمجۆرە دەکات. کاتێك کە ئەو شەوە بە هاواری گریان و شین کردنی دایکی مولکییە هۆشیار بوومەوە شتێك وەکو هێلکە لە نێو قوڕگی مندا گیری کرد و منیش ویستم دەست بە گریان بکەم بەڵام نەگریام.

کاتێك کە بە سەر پەنجەی قاچەکانمدا چوومە نێو هۆڵەکەوە و سەیری ژوورەکەی دایکی مولکییەم کرد، دیتم کە دایکی مولکییە سەرینەکەی کوڕەکەی بە باوەش کردووە و بۆنی دەکات و دەگرییێت و لە خوا دەپاڕێتەوە. لە ناکاوەوە دایکی مولکییە لە سەر هۆشی خۆی چوو و مولکییە و زەینەبیش زوو هاتن و چەند دەرمانێکی هێمن کەرەوەیان پێدا.

من نەمتوانی بخەوم، تاریکی باڵی بە سەر مندا کێشا. کاتێك کە دەنگە دەنگی مرۆڤەکان لە بەر دەرگا کەوتە گوێم وتم" ئەمانە چ جۆرە مرۆڤێکی سەرخۆشن بەم نیوە شەوە". من وا بیرم دەکردەوە کە ئێرە ئانکارایە و لەنێوەشەودا لە نێوماڵەکاندا مرۆڤەکان نەدەرفێندران یا لە بەر دەرگای ماڵەکانی خۆیاندا گولله باران نەدەکران. کاتێك کە من هەناسەیەکم هەڵکێشا ئەو کاتە دەنگی چەکەکان هات و هاوکات دایکی مولکییە بە دەنگێکی لەرزنۆکەوە دەیگوت" دەرگا ناکەمەوە"، لە پشتی دەرگاکەیشەوە دەنگێکی زۆر سەیر هات کە دەیگوت" ئەگەر دەرگا نەکەیتەوە ئەو کاتە ناچارین دەرگاکە بشکێنین". زوو بە زوو لە جێگای خۆم رابووم و چووم و دایکی مولکییە کە لە پشت دەرگاکەدا بووم گرتمە باوەشی خۆم. زەینەب و مولکییەش هاتن و باوکی مولکییەیش بیژامە خەت خەتییەکەی خۆی هەڵدەکێشا و رادەوەستا. کاتێك کە بە چەکە لوولە درێژەکانی خۆیانەوە هاتنە نێو ماڵەوە دەنگە دەنگی بێ تەلەکانی دەستیان بەرز بوویەوە. و ئێمەش سەیری سینگ و یەخە گەورەکانی ئەوانمان دەکرد. زەینەب و مولکییە وتیان" سەیری هەر شوێنێکتان کرد" بەرپرسە چاوە گەورەکەیان وتی" بێدەنگ بن". ئەو ماڵەی کە ژێر و روو کرابوو، ئەو پرسیارانەی کە دەپرسیان و ئەو شتانەی کە دەنووسران... بەرپرسە چاوەگەورەکە چاوەکانی خۆی داخست و سەری خۆی هەژاند و وتی" لەجیاتی ئەوەی هاوکاری جوانەکان بکەین ئەوان تووشی بیروڕا و هەستی جۆراوجۆر دەکەین، زۆر شانسیان هەبوو ، ئەگینا لەکاتی تێپەڕ بوونیان لە سەر سنوور گولله باران دەکران". لەم کات و ساتەدا دایکی مولکییە وتی" خوا شوکر" و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. بە هۆی ئەوەیەوە کە پشووی هاوینان لەگەڵ مولکییە و ئەواندا دەبووین هەمیشە من لە نێوان رۆحیەتی تاوانبار بوون و هەستی خۆشبەخت بووندا دەهات و دەچووم. هاوکات لەگەڵ کۆتایی هاتنی کاتژمێری کار و دەوام کۆڵانەکانیش قەرەباڵغ دەبوون. لە روخساری مرۆڤەکاندا ترس و دڵەراوکێ دیار نەبوو. هەر چۆنە سەیری پشتەوەی خۆیانیان نەدەکرد هەر بەهۆجۆرەش هیچ لایەنگری شەڕ و دەم قاڵە نەبوون. لە کاتی هاتنی مێوانەکاندا هەم تووڕە دەبووم و هەم کەیف خۆش دەبووم. کاتێك کە لە سەر بابەت یا لە سەر شتێك یەکتریان تێدەپەڕاند و ئەو دەنگانەی کە جار ئارام بوون و جاریش تووڕە بوون ئەو کاتەی

کە لە نێو گاڵتە کردنە ئەتنیکییەکاندا دەهاتن و دەچوون، منیش تەنیا گوێ بیستی قسە بێ زەرەر و زیانەکانی مولکییە و زەینەبم دەکرد.

جار جار لەوە تووڕە دەبوون کە ڕۆژێك و ڕۆژگارێك شۆڕشگێڕ بوون و ئێستا بوونە دیلی پارە و کەوتوونەتە نێو کاروانی قەسر کراوەکاندا، ئەو مرۆڤانەی کەخاوەن تێگەیشتن و زانست بوون، بەڵام بەبێ کولتوور و بەرەژوەندی پەرست بوون، بە هیچ شێوەیەك ئامادەی گۆڕنکاری نەبوون، زەینەب و مولکییە هەمیشە باسی ئەمجۆرە مرۆڤانەیان دەکرد. ئەو شوێنەی کە ئێمە تێدا دەژیاین و لەگەڵ ئانکارا دوو دنیای زۆر جیاواز بوون. ئەو نانەی بەیانیان کە بە شێوەیەکی تایبەت ئامادە دەکرا و تا نزیکەی نیوەڕۆ درێژەی هەبوو، ئەو شتانەی کە کڕیبوومان بە بیرم دەهێنانەوە. دراوسێکان کاتێك کە بەو زکە گەورەی خۆیانەوە دوایین پێشهاتە سیاسییەکانیان شرۆڤە دەکرد بە ڕوخساریانەوە دیار بوو کە هیچ ڕوو ڕاست نین. ئەکرەم ئەوەندە هەستیار و زانا بوو کە کاتێك کە هەستی بەوە دەکرد کە مرۆڤێك بۆ هیچ جۆرە گۆڕانکارییەك ئامادە نییە بە هیچ شێوەیەك لەگەڵیدا دەستی بە گفتوگۆ نەدەکرد. ئەکرەم هەمیشە زۆر بە هەستیارییەوە ئەم خاڵە باشەی دەپاراست. ئەو ژنانە کە قژی مێردەکانی خۆیانیان شانە دەکرد لە نێو یاری خۆشبەختیدا بوون. ئەو کاتەی کە ئەمجۆرە ژنانە سەری خۆیانیان بە قورسایی جستەی خۆیانەوە ماندوو دەکرد، زەینەبیش وەك زانایەکی شوێنەوارناسی لە نێوانیاندا ڕێگایەکی بۆ خۆی دەدۆزییەوە و مولکییەیش پێ دەگوت" ئەمان واز بێنە تۆش". ئەوان بیریان لەوە دەکردەوە کە ئەگەر فراق و کەلوپەلەکان بگۆڕن بەمجۆرە ڕزگاریان دەبێت. بابەتی ڕۆژنامە و تەلەفزیۆنەکان زۆر ئازار دەر و بەبێ بنەما بوون. هێزە بەرهەڵەستکارەکانیش کە پارە و پوول هەر هەمووی هەست و سەراپای ئەوانی داگیر کردبوو متمانەیان بە خۆیان هەبوو کە هیچ کات ناتوانن بگەنە دەسەڵات. هەر چەندە زۆر حەزیان لەم بارودۆخەی خۆیان دەکرد، بەڵام لە بەرانبەر لە دەست دانی هێزی خۆیانیشدا دەترسان.

زەینەب و مولکییە بەو خواردنە خۆشانەی کە ئامادەیان دەکردن ئەوەیان دەسەلماند کە ژنە ڕۆشنبیرەکان ئەگەر بیانەوەێ دەتوانن هەر کارێك بکەن، بۆیە هەمیشە ئامۆژگاری ئەو ژنانەیان دەکرد کە لە نێو ماڵدا کاریان دەکرد. هەمیشە دەیان گوت" ژنەکان کاتێك کە خواردنەکانی خۆیان ئامادە دەکەن ڕووبەڕووی ئیلتیفات دەبنەوە ئەو کاتە هەست بە ڕاستی و هێزی خۆیان دەکەن". گەیشتن بە سروشتی بوونی مرۆڤ بە مانای هەبوونی خودی مرۆڤ بوو و ژمارەیەکی زۆر کەم لە مرۆڤەکان توانیبوویان بگەنە ئەم مەرتەبەیە. کاتێك کە دەستە پڕلە خۆشەویستی و

پڕ لە نەزاکەتەکانی زەینەب قژەکانی منیان شانە دەکرد، مولکییەش سەرقاڵی بڕشتنی ماسی بوو و دەیگوت پێویستە زۆر هۆشیار بم تا تام و چێژی ماسییەکان خراپ نەکەم. مولکییە ئەو کاتەی کە جلەکانیشی رادەخست، زۆر لە رووی رەنگ و قەبارەی جلەکانیش بیری دەکردەوە و بە پێی رەنگ و قەبارە جلەکانیشی رادەخست. جار جار لەجیاتی یەکتر جلەکانمان ئۆتوو دەکرد بەڵام بە هۆی هەستیار بوونی خەتەکانی ئۆتوویەوە زۆربەی جاران هەر کەس جلی خۆی ئۆتوو دەکرد. کاتێك کە لە سەر جلە پەمبەییەکاندا گوشارم دەخستە سەر ئۆتووکە، ئەو کاتە دەهاتە بیرم کە دایکم جلە کۆنەکانی دەدڕاند و لێیان جلی نوێ دەدوورایەوە. دەرقاچە بەرفراوانەکانی قاتەکە جار جار قاچی منی ئازار دەدا. جارێکیان لە نێو بازاڕی حەلەبدا دەگەڕاین، چاوم بە قاتێکی سووری دانتۆڵ کەوتبوو و زۆر گوشارم دەخستە سەر دایکم کە بە لێشوایی و حەیرەتەوە سەیری جل و بەرگەکانی دەکرد تا قاتێك لەو قەزیفانە بکڕێت. کاتێك کە دایکم وەکو ئەوەی کە تاوانم کردبێت سەیری منی دەکرد و نرخی قاتەکانی دەپرسی" دەیگوت " بۆ ئەوەندە گرانە تۆزێك ئینسافت هەبێت". دواتر دەستی منی دەگرت و بەدوای خۆیدا دەکێشاند.

ئەو کاتەی کە ویستمان لە دیاربەکر بگەڕینەوە ئەو زەیتوون، رەچەل (مرەبا) روون و هەنگوینە کە مولکییە و ئەکرەم بە بێدەنگی بۆ ئێمە ئامادەیان دەکرد تا هاتنی وەرزی بەهار تێری من و زەینەبی دەکرد. کاتێك کە زەینەب لەگەڵ ئەو ژنە گوندییانەی کە زیاتر لە ئەڵماسی رەش نرخ و قیمەتیان دەدا بە زەیتوونەکانیان قسەی دەکرد بە دەنگی زەینەبەوە خەمگینی دیار بوو و دەیگوت" من ئەم زەیتوونانە لە تامەکەیاندا دەناسمەوە". ئەو کاتەی کە کەبابمان لە نێو مەنقەڵەکەدا دەبرژێشت پشیلەکە خۆی دەدا بە دەست و پێ منەوە و دەستی بە میاومیاو دەکرد و مولکییەش بۆ ساڵی داهاتوو پلانی دادەنا. مولکییە کاتێك کە قسەی دەکرد ئەوەندە شیرین بوو کە من و زەینەب لە پێکەنیندا بێهۆش دەبووین. دەتوانرا دیواری باخچەکە بە شێوەیەکی رێك و پێکتر بەرز بکرایایەوە، ئەو سیرانەی کە بە دیوارەکانەوە هەڵواسرابوون و گوڵەکان و فڕینی باڵندە گچکەکانی تەباخ لە نیوەشەوێکی مانگی تەباخدا دیمەنێکی زۆر سەیر و جیاوازیان هەبوو. کاتێك کە ئەکرەم سەرقاڵی دەرهێنانی ماسییەکان لە نێو ئاگرەکەدا بوو وتی" دەزانن ئەم باڵندە گچکانەی تەباخ چیرۆکێکی زۆر خەمناکیان هەیە، ئەمە دەنگە دەنگی ئەوەیە کە هەوڵ دەدەن هێلکەکان و قاچەکانی خۆیانیان گەرم بکەنەوە. کاتێك کە هێلکەکانیشیان کرد بە جووجکە ئەو کاتە خۆیان دەمرن." سەیری ئەو گیا و

بەهاراتانەم دەکرد کە بە دیواری ماڵەکەوە هەڵواسرابوون، بە راستی سروشت شتێکی زۆر موحتەشەمە، من نەمتوانی ئەو شەوە هیچ وەڵامێك بۆ ئەو پرسیارانە ببینمەوە کە سەبارەت بە سروشت لە خۆم پرسیم بوون و بە رۆژانیش بیرم لە سەر چیرۆکی ئەو باڵندە گچکانەی مانگی تەباخ دەکردەوە.

ئەو رۆژە گەرمانە و ئەو پاش بەندانەی کە لە سەر بانەکانەوە هەڵواسرابوون، گەرما بێ حەدەکە و تامی ئەو قەیسییانە کە لە نێو دەمی مندا مابوونەوە، ئەو رەشەوڵاغانەی کە وەکو لەکەیەکی رەش لە نێو مێشکی مندا دەمانەوە، دەنگی پۆمپەکان، باڵەفڕخانە نێو خەیاڵم.... کە باسی هەر شتێکیان دەکرد منیش لە نێویدا بووم. سەیر کردنی ئەوان بۆ من وەکو مرۆڤێکی گەورە و پرسینی بیروڕای من نیشانەی ئەوە بوو کە زووتر لە کاتی خۆیدا گەورە و عاقڵ بوومە. ئەوان دەیانگوت هاوتەمەنەکانی تۆ زۆر بەبێ مانا و واتە سەیری رووداوەکان دەکەن، بەڵام تۆ زۆر بە پەرۆشی و بەو پەری هەستیارییەوە سەیر رووداوەکان دەکەی. نەکرەم هەمیشە ئەم شتەی بە من دەگوت.

هەر جار لە کاتی جیا بوونەوەدا لە نێو گەراجەکەدا دەستمان بە گریان دەکرد. دەنگی ئەو پێکەنینانە کە لە نێو ماڵەکانی نێو دارەکاندا بەرزدەبووەوە، ئەو تیشکانەی هەتاو کە لەو لای گوندە خۆشەکانەوە بەدەر دەکەوتن و کاتێك کە ئەو بەحرە کە وەك مرەکەب بوو بە جێمان دەهێشت هەوڵم دەدا کە فرمێسکەکانم لە زەینەب بشارمەوە، بۆیە من سەیری روخسارە نەرمەکەی زەینەبم دەکرد و برێك دەهاتمە سەر خۆم. کاتێك کە بە تەکانە گەورەکەی پاسەکە هۆشیار بوومەوە لە نێو گرێدایی بوون بە کات و مەکاندا دژیام. دواتر کە روخسارەکەی زەینەب دەبوو بە روخساری دایکم هەمیشە هەستم بەوە دەکرد کە دەستە نەرم و نیاکانی زەینەب لە سەر سەرمدان.

ئەو گوندە هەژارانەی کە لەگەڵ بێ کەسی و تەنیاییدا دەست و پەنجەیان نەرم دەکرد و ئەو کاتەی کە ناوچەکان وەکو تابەلایەك لە لایاندا تێپەڕ دەبووین رۆحی منیش لە نێوان ئەو تەلانەیدا کە بەجێ کرابوون پەلەقاژێ دەکرد. کاتێك کە ئەو جەستانەی کە لە نێو باخچەکاندا کاریان دەکرد و چاوەڕێی کەس یا خزمێکی نزیکی خۆیان بوون، هەر دوو دەستی خۆیانیان دەدا بە لا تەنیشتی خۆیانەوە و سەیریان دەکرد، ئەوانەی کە لە سەر کانی ئاوەکەدا ئاویان دەبرد و ئەو چادرە رەشانەی کە لە دوای کەرەکاندا وردە وردە بە رێوە دەچوون یا ئەو کۆچەرانەی کە بە دوای مریشکەکانی خۆیاندا دەگەڕیان دەمدیتن وا هەستم دەکرد کە تۆزێکی دیکە دەگەمە

ماڵەوە، بەڵام لە ناکاوەوە یەکێك داوای هەویەی لێ کردین. کاتێك کە ئەو دەنگە زەبەلاحەم بیست لە نێو دنیای خەیاڵدا راچڵەکیام. درەنگانی شەو کاتێك کە لە نێو پاسەکەدا هاتینە خوارەوە ئەو شتانەی کە لە دوورەوە دەدرەخشانەوە وەکو گیانلەبەری حەفت دەست نزیکی ئێمە دەبوونەوە. دەبوایا چاوەڕوانیمان بکردبایا و هیچ کەسیش نەبوو کە ئاگای لە دەردی ئێمە بێت بێجگە لە ئێش و ئازارەکانی ئێمە...

لە نەورۆزاندا ئەو جلانەی کە بۆ نەورۆز دووریبوومان بوون دەمانکردە بەر خۆمان. کاتێك کە هەڵبەستەکانی جگەرخوێنیش دەبوون بە دوعا ئەو کاتە بۆ رۆحی شەهیدەکانی رێگای ئازادی و ئەو کەسانەی کە بۆ ئازادی مرۆڤ شەڕیان کردبوو و گیانی خۆیانیان لە دەست دابوو گوڵی سوورمان دەخستە نێو رووبارەوە. بۆنی خاك و گیا تەڕەکان و هاوارو شین و رۆرۆ، کچە گچکەکانی نێو قەبرستانەکەیش بەو شتە گچکانەی دەستی خۆیانەوە ئەم لا و ئەو لایان دەکرد و گوڵەکانی نێو قەبرستانەکەیان ئاو دەدا. بۆ چی شێخەکان، حاجییەکان و مەلاکان و مامۆستاکان هەبوونیان هەبوو؟ بۆ چی دەکەوتنە نێوان خوا و عەبدەکانی خوا؟ ئاه هەژاری ئەی باڵە گەورەکەی نەزانین...!

ئەو شێخە کە هاتبوو و لە نهۆمی خوارەوە نیشتەجێ ببوو سیستەمی ژیانی ئێمەی تێك دابوو. هیچ دیار نەبوو کێ دێت و کێ دەڕوات. زەینەبیش زۆر رقی لەوە بوو کە رۆژێك چەندین جار لە دەرگای ئێمەیان دەدا و پرسیاری شێخیان دەکرد. جارێکیان زەینەب قیڕێکی زۆر گەورەی کردە سەر ئەو ژنەی کە سەرقاڵی هێور کردنەوەی منداڵە گچکەکەی نێو باوەشی بوو و وتی" بۆ خاتری خوا بۆ نارۆن بۆ لای دکتۆر چ کارێکتان لای ئەم پیاوە هەیە"؟ ژنەکەش سەیری ئەم لا و ئەولای خۆی کردو وتی" ئامان با مێردەکەم نەبیسێت من دەکوژێت، دەڵێن هەناسەی شێخ شەفابەخشە". ئەو ژنانەی کە ددانەکانیان کەوتبوون و دەموچاویان چرچ ببوو دەموچاوی خۆیانیان دەکێشا بە دەرگای شێخەوە و لە ئێوارە تا بەرەبەیان لە بەر دەرگای شێخدا دادەنیشتن. من وام زانیبوو کە شێخ پیاوێکی باڵا بەرز و بەتەمەنە. کاتێك کە رۆژێکیان چاوم پێکەوت سەرم سوڕما. جوانێکی زۆر سەردەمیانە و جل و بەرگی مودێرنی کردبوو بەر خۆی زۆر بە شێوەیەکی سەردەمیانە تراشی کردبوو، بۆ خەتەنە کردنی منداڵەکانیان کەسانێکی زۆر دەهاتن بۆ لای شێخ و چەند کەسێك خواردنیان بۆ ماڵە شێخ دەهێنا و چەند کەسێکی دیکەش بزن و مەڕیان دەهێنا. ئەو مەڕو بزنانەی کە لە بەر دەرگای ماڵەکەدا دەبەسترانەوە بە راستی شتێکی زۆر ئازار دەر و سەیر و سەمەرە بوو. ئێمەش وامان دەگوت

بەخۆمان" ئێمە چ ناچارین کە ئەم هەموو سەرئێشانە قەبووڵ بکەین، ئێرە نە هۆڵی ئاهەنگ گێرانە نە بازاڕی کڕین و فرۆشتنی ئاژەڵانە." دواتر ڕۆژێکیان زەینەب تووڕە بوو و ئەم قسانەی بە ئەوانەی وت کە هاتبوون بۆ لای شێخ. زەینەب زۆر تووڕە ببوو و ئەوانەیش کە هاتبوون بۆ لای شێخ بە سەرسوڕمایی سەیری زەینەبیان دەکرد و دەیانگوت" تۆبە تۆبە". شەو ژنی شێخ هاتە لای زەینەب، کە سەیرم کرد وام زانی یەکێکە لەو مانکەنانەی کە هەر جار وێنەیەك بۆ سەربەرگی گۆڤارەکان دەکێشێت. کاتێك کە لە ژێر زمانی خۆیدا دوعای دەکرد لە سەر قەنافەکەی نزیکی بەر دەرگادا دانیشت. ژنی شێخ بەو تورکییە ئەستەنبوولییەی خۆیەوە بە وتنی وشەی" داوای لێبووردن دەکەم" دەستی بە قسە کردن کرد. دواتر باسی ئەوەی کرد کە ئەو خەڵکە پێویستی بە ئەوان هەیە و شێخیش لە ڕووی پەروەردە و زۆر شتی دیکەوە هانی خەڵك دەدات و هاوکارییان دەکات. زەینەب زۆر بێدەنگ و ئارام بوو، چونکە ئەو خاوەن ماڵ بوو و ژنە شێخیش لە نێو ماڵەکەیدا میوان بوو. زەینەب زۆر بە هێمنی وتی" بە پێی ئەو شتانەی کە بیستوومە بۆ دەروێش و لایەنگرەکانی خۆتانیش ڕەچەتە و دەواو دەرمان دەنووسن، ئەمە کاری ئێوەیە؟ ئایا ئەمە تاوان نییە؟" ژنی شێخیش زۆر بە نەرمی وتی" من دوو ساڵ تبم خوێندوە (مەبەست خوێندنی پزشکییە. وە) و دەرمانی بێ زەرەر بۆ نەخۆشەکان دەنووسم، ئەم کارە سەوابیشی هەیە چونکە هێز و توانای ماڵی و دارایی خەڵکی ئێمە نییە کە سەردانی دکتۆر بکات".

زەینەب" هیچ شتێکی بەمجۆرە نابێت، مۆڵەت و دیپلۆمەکەی خۆت بێنە و نورینگەیەك بۆ خۆت دابمەزرێنە".

ژنە شێخ هیچ هەستی بە شتێك نەدەکرد و زۆر بە جەسارەتەوە دانیشتبوو، هۆکاری جەسارەتەکەی ژنە شێخیش ئەوە بوو کە هەر ڕۆژ چەندین مرۆڤی نەزان و هەژار ڕوویان تێدەکرد و لە هەست و نەستی ئەوان سوودی وەردەگرت.

هەر ساڵ بە مەبەستی خەیرات کردن بۆ خانەوادەکەم و بۆ ئەو کەسانەی کە گیانی خۆیانیان بەخت کردبوو و بۆ ئەو کەسانەی کە ژیانی خۆیانیان بۆ بە دەستەوە هێنانی ئازادی تەرخان کردبوو شەکر و شوکلاتەم بڵاو دەکردەوە، زەینەب هەمیشە دەیگوت ئەوان چاوەڕوانی ئەو ڕۆژانە دەکەن کە ئێمەش ئازاد ببین و بگەینە ئازادی خۆمان. ئەو ڕووبارە کە پڕ بوو لە نهێنی هەر هەمووی دەنگ و ڕەنگەکانی بۆ نێو خۆی ڕادەکێشا، بۆ ژیانێکی بێ کۆتایی...

ئەو کێشەیەی کە ڕیشەی لە نێو ناخمدا کردبوو پێ دەگوتم" لە نێوان ئەگەری هەبوون و گەیشتن بە هەبوون زۆر شتی دیکە هەیە کە تا ئێستا من هیچ ئاماژەم پێیان نەکردووە".

کاتێك کە خۆمان بۆ گۆشە بێدەنگەکانی نێو شار ڕادەکێشا هەوڵمان دەدا کە بەرحەق بوون و مافدار بوونی خۆمانمان بپارێزین. جار جار ئەو دەنگە بەرز و خاوەن بڕیارانەمان دەبیست کە لە سەر شاخەکانەوە دەهات. ئێمە زۆر بە باشی ئەو دەنگانەمان دەناسی. جار جاریش دەنگی شین و ڕۆڕۆ لە بێدەنگیدا تێکەڵی ئەو دەنگانە دەبوو کە لە سەر شاخەکانەوە دەهاتن. کاتێك کە ئەو دەنگەمان لەگەڵ دەنگی ڕەشەباکان دەبیست بۆ هەزاران ساڵ لەمەوبەر سەفەرمان دەکرد. لە نێو ئەم سەفەرەدا شتی زۆر باش و خراپ هەبوو. لە دەست پێکردنی یەکەمین ڕۆژی وەرزی هاویندا ئەگەر چی تەنیا بۆ کاتە ساتێکیش بێت خەم و ئێش و ئازارەکانی خۆمانمان لە بیر دەبردەوە. ئەو پەپوولانەی کە کۆدەبوونەوە و لەو بەری قەراخەکانی ڕووبارەکەدا دەسووڕانەوە، ئەو گوڵە یوسفیانەی کە لە بەر پەنجەرەکاندا دانرابوون، ئەو بەنەفشانەی نێو باخچەی دائیرە ڕەسمییەکانی حکوومەت کە وەکو بووکێکی خەمبار بوون و ئەو گوڵە لالانەی کە بەکارەتی خۆیانیان لە دەست دابوو پێکەوە قسەیان دەکرد. کاتێك کە بیری شاخەکانی قرقلار و باخچەکانمان دەکردەوە هەناسەیەکی قووڵمان هەڵدەکێشا، زەینەب بە منی دەگوت" پێویستە تۆ یەکێك لەو نووسەرانە بیت کە یەکێك لە ڕۆمانە هەرەباشەکانی سەردەم لە سەر پردی نیوەدا بنووسیت".

ئەو شنە بایە کە بۆنی گیاکانی پێوە بوو ڕوخساری ئێمەی دەشۆرد و ئێمەش سەیری ئەو ڕووبارەمان دەکرد کە وەکو خەنجەر دەدرەخشایەوە. کاتێك کە پرسیارەکانی بۆچی و چۆنە مێشکی منیان بە خۆیانەوە سەرقاڵ دەکرد منیش لە خۆم دەپرسیم کە بۆچی خوایەکی ئەوەندە باش مۆڵەت دەدات کە ئەم هەموو شتە خرابە ڕوودات. هاوارم دەکرد بۆچی؟ ... بۆچی؟...

بە مەبەستی ئەوەی کە پاڵ بە شتێکی باشتر و خاوێنتر بدەم و بەجۆرە خەیاڵ و کابووسەکانم لە بیربەمەوە، تا ئەو کاتەی کە مێشکم ڕادەوەستا کتێبم دەخوێندەوە. کاتێك کە من ئەم کتێب خوێندنەوەی خۆم و ناکۆکییەکانی نێو کۆمەڵگەم پێکەوە هەڵدەسەنگاند هاوارم دەکرد" ئاه زەینەب" بەجۆرە ڕادەوەستام و برێك پشووم دەدا. زەینەب کە هەمیشە ئاگاداری بارودۆخی من بوو و چاودێری لە سەر من دەکرد بە پێکەنینەوە پێ دەگوتم" پێویستە تۆ خۆڕاگر بیت".

ئەو کاتەی کە من چیرۆکی بورگەسم خوێندەوە بە ڕاستی من شەیدای سەبر، تاقەت و هێز و شەوقی خوێندنەوەی بورگەس بووم و کاتێك کە بیرم لەم قسەیەی ناوبراو" کات ڕووبارێکە کە

من لەگەڵ خۆیدا دەتبات، بەڵام رووبار من بۆ خۆمم". دەکردەوە سەرم سوڕدەما. دواتر من لە هێزی ئەو کەسانە کە من منی نێو خۆیان بە شێوەیەکی دروست شرۆڤە کردووە و بە گەرمی باوەشیان بە جەوهەری خۆیانەوە کردووە تێدەگەیشتم، چونکە منیش لە نێو خۆمدا هەست و ویستی هەبوونی منم بە هەبوونێکی جیاواز پەروەردە دەکرد.

کاتژمێر شەش و ٤٠ خۆلەك کات وەکو رووبارێك بوو... باخچەکانی ئاوات لە نێو تەمێکی زۆردا بزر دەبوون. ئەو پردە هەڵواسراوە... ئەو بەلەمانەی کە لە نێو ئاودا جموجۆڵیان دەکرد، رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ مێژوودا، ئەو بیرەوەرییانەی کە هەر یەکە و لەگەڵ خۆیاندا عەیبێکیان بە بیر دەهێنایەوە، مرۆڤە بێدەنگەکان و .... دەبوایا زەینەب ئەم رۆژانەی بدیتبایا.

بە هۆی قەدەغە کراوە بوونی زمانی زگماکیم و بن دەست بوونی دایك و باوك و کاکم دەبوایا من زۆرتر لە هەر کەس فێری زانست و زانین بووبام. ئەو ساڵەی کە دەستم بە خوێندن لە زانکۆدا کرد و شوور و دڵخۆشی چاپ و بڵاوبوونەوەی یەکەمین بابەتم منی تووشی هەستی متمانە کردن بە خۆ کرد.

کاتێك کە من دەمگوت" پێویستە بۆ ئیسبات کردنی هەبوونی ناسنامەی خۆت دان بە هەبوونی ناسنامەی ئەوانی دیکەدا بنێ و بە مەبەستی گەرەنتی کردنی ئەو هەبوونە پێویستە کە جیاوازییەکانیش لەگەڵ واقیعدا هەڵبسەنگێندرێن چونکە هەر ناسنامەیەك چەندین نرخی تایبەت بە خۆی هەیە و پاراستنی ئەم نرخانەش پێویستی بە هەڵوێستێکی سیاسی هەیە" رووبەڕووی ناڕازی بوونی و تووڕە بوونی ئەوانی دیکە دەبوومەوە. زانستی هونەر، پیاوێکی زانا و لێهاتوویە، بۆیە واتا و مانا نەدانی ئەم شتانە لە لایەن زانستی هونەرەوە وەکو ئەو مرۆڤە زانایانەیە کە هەست بە راستییەکە دەکەن، بەڵام هیچ شتێکیان بە دەستەوە نییە و هیچ هەنگاوێکیش لەم رووەوە هەڵناگرن. ئەمجۆرە مرۆڤانە کە زۆر لووت بەرزن و قاچیان لە سەر زەوی داناکەوێت کاتێك کە بە هەستێکی لاوازی رۆمانسیدا هۆشیار دەبوونەوە هەوڵیان دەدا کە وەك لایەنێکی بێ لایەن رۆڵ بگێڕن. ئەرێ لە پێ ناو و لە ژێر ناوی بێ لایەنیدا رەتکردنەوەی جیاوازییەکان مانای چییە؟

ئەو کاتەی کە دەنگی شین و رۆڕۆی ئەو مرۆڤانەم دەبیست کە بەرەو قەبرستانەوە دەڕۆیشتن، لەو لای رووبارەکەوە تا ئەو کاتەی کە مرۆڤەکان لە بەر چاوم دەبوون بە لەکەیەکی رەش و بزر دەبوون سەیرم دەکردن. ئەوەندە ئەو جەنازانەی کە لە نێو لمی قەراخی رووباردا چاقا و هەڵماسی بوونیان بینی بوو کە جار جار بەردیان بۆ ئەو جەنازانە فڕێدەدا و دەیانەویست

ئەو جستە و جەنازە هەڵماسییانە بتەقێننەوە. ئەمە ببوو بە یارییەك بۆ ئەو کەسانەی کە لە قەراخی رووبارەکەدا شەویان رۆژ دەکردەوە. ئەو رەنگە خاکییانەی کە لە ناکاوەوە بە مەبەستی هاوکاری کردنی تاریکی هەر شوێنیان دادەپۆشی و بێدەنگییەکەیان لە ناودەبرد، دەرفەتێکی باشیان بۆمردن دەخولقاند. کاتێك کە دیتم سەگەکان تەرمێکیان لە نێو لمەکەدا دەرخستوو و پارچە پارچەیان کرد، نەمدەتوانی نان بخۆم. من پرسیارم لە زەینەب کرد کە ئایا ئەو جەنازانەش کە لەبەر هەتاو بێننەوە هەڵدەماسن؟ زەینەب لە وەڵامی مندا ئەو ئاسۆیەیی کە رەنگی وەکو رەنگی پەمبە بوو نیشانی مندا و وتی" بێدەنگ بە سەیری ئەو باڵندانە بکە چەندە جوان باڵ دەگرن."

کاتێك کە لە رێگا پڕ لە دارەکەی زانکۆیەوە دەگەڕامەوە دەمگوت کاتێك کە زەینەب ببینم و هەست بەو غرووڕەی زەینەب بکەم ئەو کاتە باوەش بە گەردوونەوە دەکەم. دەمەویست وەك زەینەب ماقووڵ، بە هێز و زانا و بە پێوان بم و هەوڵم دەدا کە مەمکەکانیشم بکەم وەکو مەمکەکانی زەینەب. ئایا هەستی بەردەوام بوونی مێژوو بە مانای لە بیر بردنەوەی نەسلی نێوان رابردوو و داهاتووی مێژوو بوو؟ هەمیشە هەستم بەوە دەکرد کە هەست بکەم هی شوێنێکم. کاتێك کە بیرم لەمە دەکردەوە بۆنی خەردەڵ دەهاتە بیرم و تووشی سەرگێژە دەبوومەوە و کاکم و ئەسپە هارەکەی لە نێو شەواندا تێپەڕ دەبوون و دواتریش دایك و باوکم هەر بەم شێوەیە...

کات بریتی بوو لە زامێك کە بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ یاساکانی ژیاندا رانەدەهات. نەمدەتوانی هیچ شتێك لە بیر ببەمەوە. هەمیشە هەستم بەوە دەکرد کە بە هیچ شێوەیەك ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ کاتی پێشتر لە روودانی ئەو رووداوانە... ئاخ هەست پێکردن... ئاخ..

ئەو رۆژانەی کە زەینەب سەردانی سوئێدی کرد من لە ماڵی مولکییەدا دەمام. هیچ کات بەو شێوەیە کە جارێکی دیکە ناگەینەوە بە یەکتر، لە یەکتر جیا نەدەبووینەوە. لە سەر یەك قەرەوێڵەدا دەنووستین. بە مەبەستی ئەوەی کە بتوانم ئەگەر چی بۆ کاتێکیش بێت، هەستی بێکەسی لە بیر ببەمەوە دەستم بە هەر کارێك دەکرد و هەمیشە هەوڵمدەدا کە دەم بە خەندە بم. کاتێك کە بەیانیان لە قەراخی بەحردا پیاسەم دەکرد، هاوکات لەگەڵ ئێش و ئازاری دەروونمدا سەیر کردنەکانی منیش تێکەڵی شەپۆلەکانی بەحر دەبوون و منیش سەیری ئارەقەی سەروچاوی مولکییەم دەکرد کە تێکەڵی لمی قەراخی دەریا دەبوو. مارتییەکانی نێو بەحر هەر وەکو ئەوەی کە گاڵتە لەگەڵ مندا بکەن لە نێو بەحردا بەرزدەبوونەوە و جارێکی دیکەی

خۆیان فێری نێو قووڵایی بەحردەدا. کاتێك کە سەیری دووره دەستانم دەکرد، لە نێو دوورگەکانی یۆناندا رووناکیم دەدیت.

ئەو کاتەی کە لەگەڵ مولکییە لە نێو باخچەکەدا باینجانی رەشمان دەبرژاند، مولکییە سرێکی خۆی بۆ من گێڕایەوە و وتی" ئەریٚ خۆشکت (زەینەب) هیچ باسی ئەوەی بۆ تۆ کردووە کە عاشقی تێکۆشەرێکی ئازادییە؟ سەیر مەکە وا قورس و خاوەن پیوانە، زینو (مەبەست زەینەبی منە لە رووی خۆشەویستییەوە بەکار دەهێنرێت.وە) ژنێکی رێکو پێك و بە عەقڵە. وام دەزانی زەینەب هەرشتی بۆ تۆ گێڕاوەتەوە. بەڵام زەینەب لەو ژنانەیە کە سرە تایبەتییەکانی خۆی لەگەڵ کەسدا باس ناکات." لە دوای بیستنی ئەم قسانەی مولکییە وام هەست کرد کە هەبوونێکی زۆر بێ قیمەت و بێ نرخم. چۆن زەینەب، ئەو زەینەبەی کە باسی هەر شتێکمان پێکەوە دەکرد و پێکەوە دەنووستین چۆن باسی شتێکی بەمجۆرەی بۆ من نەکردووە. کەوتمە نێو هەستی ئەوەیەوە کە ئایا زەینەب بە ئەوەندەی ئەوەی کە سرەکانی لەگەڵ مندا باس بکات منی خۆش نایەوێ یا من ناتوانم ئەو سرانە لە نێو دڵی خۆمدا بپارێزم؟

کاتێك کە هەستم بەوە کرد کە نابێ لە زەینەب کە زوو بە زوو سەردانی دەرەوەی وڵاتی دەکرد تووڕە ببم، مامۆستا بووم. لە نێو ژوورەکەی خۆمدا دەستم بە سەفەر لە نێو جۆگرافیای بێ کۆتایی ئەدەب و وێژەدا دەکرد. هەر چۆنە کاتێك کە مرۆڤ ئەوانی دیکە بیناسێت ئەو کاتە هەستی رەخنە گردن لە نێو رۆحیدا بەهێز دەبێت، هەر بەمجۆرەیەش لە دوای ناسینی مرۆڤەکانی دیکە من ناچار دەبووم کە بە شێوەیەکی جیاوازتر سەیری خۆم بکەم. لێکۆڵینەوە و بەراوردێکی بەمجۆرە هەرچەندە لە راستیدا دەبوو بە هۆکاری زانا بوون و بەهێز بوونی من بەڵام لە نێو دڵی مندا دەبوو بە هۆکاری هەڵسانی باو و باهۆزێکی زۆر بە هێز. مامۆستا بووم و هیچ خۆشەویستێکی من یا هیچ هاورێیەکی پیاوم نەبوو. جارجاریش تەنیا لە رووی پەیوەندییە فلورتییەکانەوە حەزم لەو پیاوانەی دەکرد کە زۆر لە نێو کەسایەتی و پێستی خۆیاندان. لەم رووەوە تەها کە خەڵکی مارەش بوو جێگای خۆی لە نێو دڵی مندا کردبوویەوە. هەر بەیانی لە بەر دەرگای ژوورەکەی مندا تێپەڕ دەبوو و بە پێکەنینەوە دەیگوت " چایی تۆ زۆر تام خۆشە فێری ئەم چاییە بوومە". کاتێك کە چاییمان پێکەوە دەخواردەوە و باسمان لە ئەدەب و ئەدەبیات، سیاسەت و قسە وردە و فتنەکارییەکانی نێو زانکۆ دەکرد، تەها وەکو مریشکی تاووس دەستی بە خوراندنی جەستەی خۆی دەکرد. زۆربەی پیاوەکان لە بەرانبەر ژنە بەهێزەکاندا زۆر هەستیان بە بێ متمانەیی لە بەرانبەر خۆیاندا دەکرد، بە پێچەوانەوە لە بەرانبەر ئەو ژنانەی کە لاواز بوون لە بەرانبەر پیاوەکاندا، ئەمجۆرە پیاوانە هەستیان بە

خۆشبەختی دەکرد. ئەمە لەکاتێك دایە حەز کردنی شێر لە شێر و دۆستایەتی شێر لەگەڵ شێردا زۆر جیاواز بوو، پیاوەکان نەیاندەویست هەست بەم جیاوازییە بکەن.

جارێکیان هاتمە ماڵەوە و دەستم بە گریان کرد و وتم" ئەرێ کەری کوڕی کەران چ عەیبێکی من هەیە، چی من لە ئەوانی دیکە کەمترە؟" ڕەنگە وەڵامی ئەم پرسەیشم زۆر بە باشی بزانیبا، بەڵام دەمەویست ناخی خۆم خاڵی بکەم و تۆزێك ئاسوودە ببم. زەینەب هەمیشە دەیگوت" ئەگەر بڕیارە بە شێوەیەکی بێ قیمەتانە لەگەڵ کەسێکدا پێکەوە بژی، هیچ نەژیت باشترە". کاتێك کە لەناهەنگی بووك گواستنەوەکان و لە نێو هەڵپەڕکێکاندا ئەو وشەیەم دەبیست کە دەیانگوت زۆر خۆشبەختین" منیش دەمگوت " ئەی هەژارینە هەستە کورت خایەنەکان ئێوەیان هەڵخەڵەتاندووە". دەنگێکیش لە ناخمدا پرسیاری دەکرد" ئەی تۆ چیت"؟ کاتێك کە ئەم دەنگەم دەبیست لە نێو پرسیار و وەڵامەکانیاندا نوقم دەبووم.

دراوسێیەکمان لە تەمەنی ٥٠ ساڵان بوو، سمێڵەکانی خۆی بە ڕەنگی ڕەش ڕەش کردبوو و لە عەرەفەی ژن خواستندا بوو. هەر وەکو یاریزانێکی شانۆ لە لای دڵبرینی جواندا بوو. ئەوەندە ڕێکوپێك بوو کە باسی ناکرێت. بە لای دڵبرینەوە بەڕێوەبەری هەر هەمووی بەڕێوەبەرەکان بوو. ئەو خاڵە هاوبەشەی کە ببووە هۆکاری ئەوەی مرۆڤ نەتوانێت ئەو دوو کەسە لە یەکتر جیا بکاتەوە ئەو سادەیی و دڵپاکی بوو کە لە پشت فریبکارییەوە لە نێو چاوەکانیاندا دیار بوو. ترسناك، خائین و تاوانبار، ئەو دەنگەی کە بە هاوارێك دەرگاوانەکەی دەترساند لە بەرانبەر دەنگێکی دیکەدا دەترسا. بە هیچ شێوەیەك ئەوان سەری خۆیانیان بە هیچ شتێکی دیکەوە سەرقاڵ نەدەکرد، نە ئەو نووسینانەی کە لە سەر دیوارەکاندا هەڵواسرابوون، نە هاتوچۆی نێو جادەکان و نە خۆپیشاندان و پرۆتستۆکانیش،. کاتێك کە ماشینەکەی خۆی دەڕازاندەوە و دەنگی مۆسیقای بەرز دەکردەوە و سەیری ئێمەی دەکرد قاچەکانی دەلەرزیان و ئێمەش بە شێوەیەکی گاڵتەجاری سلاوومان لێ دەکرد. ئێمە لە نێو مەکانی تایبەت و سەربەخۆی خۆماندا هەستمان بە ئاسوودەیی نەدەکرد و بتەوێ و نەتەوێ کاتێك کە سەیری چاوەکانمانی دەکرد وا هەستمان دەکرد کە لە نێو شەڕداین. بە ڕای ئەوان ئێمە ئەو کەسانەین کە لە ڕێ دەرچووینە و کۆمۆنیستێکی بێ ئیخلاق و قەحبە بووین.

دواتر زەینەب نەیتوانی خۆی لە بەرانبەر پێشکەوتنەکانی تەکنۆلۆژیا بێدەنگ بکات بۆیە مۆبایلێکی کڕی. بە دەنگی زەینەبەوە دیار بوو کە زەینەب زۆر کەیف خۆش و ئاسوودەیە، کاتێك کە زەینەب بە تەلەفوون قسەی دەکرد من گوێ خۆم دەگرت و دەچوومە نێو

باڵکۆنەکەوە. نە کۆتایی بە سەردانەکانی زەینەب بۆ دەرەوەی وڵات دەهات و نە کۆتایی بە پەیوەندییە تەلەفوونییەکان و نووسین و خوێندنەوەکانی زەینەب دەهات....

هەستەکانی گرێدای بوون، بۆشایەتی دەروونی، کینە سەرکوت کراوەکە، ئاواتە نەبینراوەکان، هاوڕێیەتییە درێژخایەنەکان، خۆشەویستییەکان و پێکهێنانی ژیانی هاوسەری وردە وردە ببوون بە شتێك کە جێبەجێ کردنیان زۆر ئەستەم دەبوو.

پەسەند کردنی و ئەوانەی کە بۆ خۆشەویستی لە نێو خۆیاندا جەرگیان سووتا بوو، بەڵام نەیانتوانی بوو هەستی دەسەڵات لە نێو دڵی خۆیاندا لاواز بکەن، کاتێك کە وا هەستیان دەکرد کە ئەو کەسە کە حەزیان لێیە پارچەیەکە لە جەستەی خۆیان، بە مەبەستی ئەوەی کە ئەویش وەکوخۆیان لێ بکەن ،هەمیشە هەوڵیان دەدا کە بیکەنە وەکو فریشتەیەکی باشی. ئەو خۆشەویستەی زەینەب کە سەرەتا زەینەب بە پێویستی نەزانی بوو باسی لە لای منەوە بکات، کابرایەکی ئەرمەنی بوو بە ناوی زاڤین کە لە رێکخراویی لێبووردنی نێونەتەوەییدا کاری دەکرد. من کاتێك کە ئەمەم بیست سەرم سوڕما و وا بیرم لە وتەکانی مولکییە کردەوە. مولکییە جارێکیان باسی کردبوو و پێی گوتم " کە زەینەب حەزی لە کوڕێکە کە تێکۆشەری ئازادییە". من خۆم لە نێو دڵی خۆمدا زیندانی کردبوو، کاتێك کە قسەم دەکرد چاوەکانم دادەگرت، بۆ ئەوەی کە لە ژوورەکەمدا دەربچم هەزار و یەك بیانووم دەدۆزییەوە. زەینەب سەرەتا زۆر بایەخی بەم هەڵویستەی من نەدا، بەڵام دواتر کە هەستی کرد من زۆر تووڕەم، بۆ هەر کوێ کە دەڕۆیشت زۆر ئیسراری دەکرد کە منیش لەگەڵیدا بڕۆم.

زەینەب دەیگوت "سیاسەت تێکۆشانێك نەبوو کە بۆ گۆڕانی کۆمەڵگە بکرێت بەڵکو تێکۆشانی ناساندنی هەبوونی راستییەکانی تاکەکان بوو. بۆیە ئەو رۆحە برسییانە هەمیشە دەتوانن بۆ تێر کردنی خۆیان دەست بە هەر کارێکی خراب و نایاسایی بکەن، زۆربەی جاران بەرهەڵستکاری یا بەرهەڵستکار بوون، گەورەترین پەناگا لە بەرانبەر تیرۆری ژیانی ناوخۆییە".

ئەو کاتەی کە زەینەب لە نێو کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا بەو دەنگە نەرم و نیایانە و بەو هەڵوێستە رێکو پێکانەی خۆی سەرنجی هەر کەسی بۆ لای خۆی رادەکێشا، زاڤینیش لە پێشەوە دادەنیشت و بە غرووروەوە سەیرو گوێبیستی زەینەبی دەکرد و قسەکانی زەینەبی دەنووسی.

من لە پەیوەندییەکانی نێوان زەینەب و زاڤین زۆر تووڕە ببووم، بەڵام هیچ کاتێکیش لە سەر هۆکارەکەی بیرم نەدەکردەوە، بە راستی نەمدەویست بیر بکەمەوە.

رۆژێکیان له دوای کۆبوونەوەیەك له ژێر باراندا بەرەو شوێنی دانیشتنی نووسەرەکان که کافەیەکی ئوتانتیك بوو رۆیشتین. کاتێك که گەیشتینە کافەکە ئەگەر یەکێك دەستی بە مندا دابا من دەگریام ئەوەندە تووڕە بووم. بە چاوێکی سووك سەیری زەینەبم دەکرد و لێ تووڕە ببووم و پێم گوت" عەیب نییە! بەم تەمەنەوە وەکو کچێکی هەرزەکار عاشق ببیت". روخساری زەینەب له بەرانبەر زاڤیندا سوور دەبووەوە و چاوەکانیشی پڕ دەبوون لە هیوا و ئاوات و خۆشبەختی. زاڤینی قژ فرفرِی له رووی سیاسی و هونەرییەوە خاوەن زانیاری و هەستیارییەکی باش بوو. تەمەنی منداڵی له شاری ماردین تێپەڕاند بوو و دواتر باریان کردووە و چووبوونە ژنێڤ. کاتێك که باسی ناشنا بوونی خۆی لەگەڵ زەینەبدا دەکرد قاچەکانی من لە ژێرمێزەکەدا دەلەرزیان. ئەو کاتەی که بابەتەکەی زەینەبی که له سەر بارودۆخی ژنانی نووسیبوو خوێندووەتەوە دەعوەتی زەینەبی کردووە که له کۆبوونەوەکەی ٨ی مارسدا بەشداری بکات. زاڤین دەیگوت" کاتێك که له کۆبوونەوەکەدا زەینەب قسەی دەکرد، له تۆنی دەنگی زەینەب و ئەو وشانە و ئەو رستانەی که رێکی دەخستن، منیش کەسایەتی زەینەبم دەناسی. بۆ ئەوەی که متمانە بە خۆ بکەم جارێکی دیکە کاتێك که له باڵەفرِخانەدا زەینەبم بینی هەست و بەراوردەکانی خۆمم هەڵسەنگاند." ئەو کاتەی که زەینەب هەستی بە نائارامی و تووڕە بوونی من و لەرزانی قاچەکانی منی دەکرد دەستی منی دەگرت و دەیگوت" تۆ ئەوەندە گەورە و عاقڵی که دەتوانی لەمەوبەدواوە بە باڵی خۆت باڵ بگری". کاتێك که ئەم قسانەی زەینەبم بیست دەستم بە گریان کرد. زاڤین که لەم بارودۆخە سەریسوڕمابوو بۆ ئەوەی که من و زەینەب پێکەوە باشتر له سەر ئەم مەسەلەیە قسە بکەین ئەو شەوە ئێمەی بەجێ هێشت.

ئەو دەنگەی نەی (یا عوود) که له نێو تاریکی شەودا دەکەوتە گوێی من بۆ من تەنیا خەم و خەفەت بوو. کاتێك که دەمەویست بۆ ساتێك لەو خەیاڵ و پرسیارە پووچانەی که له مێشکمدا دەردەکەوتن خۆم رزگار بکەم، هەر شت بایەخ و نرخی خۆی له سەر من فەرز دەکرد و منیش دەمەویست خۆم له هەر هەمووی ئەو شتانە که مێشك و عەقڵی منیان داگیر کردبوو خۆم رزگار بکەم. دەنگ و سەیر کردنە نەرم و پڕ له خۆشەویستییەکانی زەینەبیش نەیاندەتوانی هێمنم بکەنەوە. له نێو تاریکیدا وەکو باڵدارێکی باڵشکاو بووم که له نێو دۆڵێکدا کەوتبێت و رێگای خۆی بزر کردبێت. بارانی زەرد، بۆنی خەردەڵ، دایکم، باوکم و کاکم هەر هەموویان دەهاتنەوە بیرم....

هیچ ئەمدەویست دەنگی زاڤین ببیستم، ئەو دیاریانەش کە هێنای بوون دەمەویست هەر هەموویانی فڕێبدەم و هەمیشە دەمگوت با بمرێت و ئاواتم بە مردنی دەخواست. بەو رق و کینەی بەرانبەر زاڤین کە لە نێو ناخمدا کۆببووتەوە هەر هەمووی قارەمانی چیرۆکەکانی داستایۆڤیسکیشم لە پاشەوە هێشت بوو. دەنگێك لە ناخمدا پێ دەگوتم" عەیبە بۆ تۆ" کاتێك کە من ئەم دەنگەم دەبیست سەیری زاڤینم دەکرد و هەوڵمدەدا دەست بە پێکەنین بکەم.

مینە و ئەحمەد کە بڵاو کراوەی بەرهەڵستکارییان بڵاو دەکردەوە و ئەفسوون و حەسەن کە بە ساڵان بوو لە نێو گرتووخانەدا بوون هاوڕێ زۆر نزیکی زەینەب بوون. ئەو کتێبانەی کە لە تورکیادا بڵاویان دەکردەوە نایاسیی بوون و بە هۆیەوە دادگایی دەکران بەڵام لە وڵاتانی دیکەدا هەر ئەو کتێبانە چەندین خەڵاتیان وەردەگرت. ئەندامانی رێکخراوی رۆژنامەنووسانی بێ سنوور هەر هەمووی دنیا دەگەڕان. کولتووری یەك رەنگی میدیاکان بوو بە هۆکاری بەگۆڕتر بوونی هەستی نەتەوایەتی، ئەوانەی کە لە نێو بەرەی هاوکاری چەپڕەو و ئەوانەی کە لە نێو بەرەی بێ لایەنی لیبراڵ جێان دەگرت خاوەن پەیوەندییەکی نزیك و نهێنی بوون، لە بەرانبەریشدا نووسەرە شۆڤەنییە ئیعتیڕافکارەکان بە نووسینە بێ بنەماکانی خۆیان دەبوونە هۆکاری ئاڵۆزکردنی بارودۆخ و هاوسەنگییەکانی نێو پێکهاتەکانی کۆمەڵگە و هەر ئەم نووسەرانە بۆخۆیانیش دانیان بەم کردەوانەی خۆیاندا دادەنا.

کاتێك کە بە مەبەستی بەشداری کردنی پێشەنگای کتێب چوومە ئەستەنبووڵ و بڕیارمدا کە لەمەو بەدواوە لە ئەستەمبووڵ ژیان بکەم، ئەو کاتە زەینەب ببوو بە دوو بەش و هەمیشە لە ژنێڤ بوو. زاڤین پیاوێکی رۆژئاوایی بوو بەڵام حەزی لە کولتووری وڵاتانی رۆژهەڵات دەکرد و دەیگوت وڵاتانی رۆژهەڵاتی زۆرتر لە وڵاتانی رۆژئاوایی خاوەن واقیعیەتن و هەر بۆیە مرۆڤە رۆژئاواییەکان لە دژی مرۆڤ و واقیعیەتی کولتووری وڵاتانی رۆژهەڵاتن.

ئەستەنبووڵ شارێکی زۆر گەورە و دایم لە گەورە بووندا بوو. کاتێك کە لە جادەی ئیستیقلالدا هاتوچۆم دەکرد وام دەزانی کە لە نێو ئاوە قووڵەکانی مێژوودا مەلەوانی دەکەم و لە نێو دڵی خۆمدا دەمگوت" چ کەسانێك هاتن و چ کەسانێك چوون". بیزانسییەکان و رۆمانەکان و عوسمانییەکان زۆر شتی باشیان بە جێ هێشتبوو. عەنتیکەکانی نێو کۆشکەکان و ئەو کۆشکانەی کە ببوون وەکو عەنتیکە، جارییەکان، حەرەمەکان، رێفۆرمخوازەکان و وەزیرەکان، ئەو ژنە ناموسڵمانانەی کە کارو پیشەیان هونەری شێوەکاری بوو، هەر هەمووی

نێش و ئازارەکانی سەردەمی ناوینیان لە سەر دەر و دیواری ماڵەکاندا خستبوو بەرچاوی نەوەکانی داهاتوو.

هەر شارێك کولتوور و یاساکانی خۆی و شتە بنەڕەتییەکانی خۆی لە نێو خۆیدا نوێ دەکردەوە و بەمجۆرەیش شار وەك تاکێك بوو کە ببوو بە کۆمەڵگە.

ئەو کاتەی کە لە بۆغازی ئەستەنبوولدا ماسیم دەخوارد لە نێو ئاسوودەییەکی بێ هاوتادا بووم و لەگەڵ هاتوچۆی کەشتییەکاندا منیش سەفەری رابردووم دەکرد. ئەو فراقانەی کە دەشکان و ئەو پیاڵانەی کە لە یەك دەدران هەر هەموویان ریتمی هاوبەشی زمانە جۆراوجۆرەکان بوون. کاتێك کە من سەیری مێزە بۆشەکان و سەیری پێکەنین و دەمەقاڵەی مرۆڤەکان و سەیری شەپۆلەکانی دەریام دەکرد، مینە پێی گوتم " تۆ زۆر خۆت پەرۆش دەکەی". دواتر ئەفسوون و حەسەنیش باسی ئەو وڵاتانەیان دەکرد کە سەردانیان کردبوون. کاتێك کە بۆنی گۆشتی برژاو دەکەوتە لووتم ئەو کاتە بیرم لەوە دەکردەوە کە هەر مرۆڤێك لە راستیدا تەنیا بۆخۆیەتی، چونکە وام دەزانی کە هاوسەر، خۆشەویستی، برا، باوك و دایك و هاورێکان هەر هەموویان تەنیا بۆ سەرقاڵ کردنی مرۆڤن. دڵم زۆر پڕ ببوو نەمتوانی وەڵامی سەیر کردنە پڕ لە خۆشەویستییەکانی زەینەب بدەمەوە. من تازە هەستم بەوە دەکرد کە هەستی حەز کردن و گرێدراو بوون بە کەسانی دیکە هەمیشە وەکو شەپۆلێکی کورت خایەنە.

ئەو کاتەی کە زاڤین باوەشی بە زەینەبەوە دەکرد و بە ئەرمەنی گۆرانی بۆی دەگوت، زەینەب سەیری منی دەکرد و خۆی لە زاڤین برێك دوور دەخستەوە. کاتێك کە دەمانەویست سەردانی ماڵی مینە و ئەحمەد بکەین ئەستەمبووڵ لە نێو ناخی مندا دەکوڵا. بە زانا بوون هەنگاوی وردم دەنا چونکە دەمەویست بە دوا بکەوم. بە هیچ شێوەیەك نەمدەتوانی دڵ شکاوی خۆم بشارمەوە. لە نێو تاریکی شەودا کاتێك کە وەکو تورناکان لە یەك سرەدا دەمانەویست لە ئەوراڵزەکە بەسەر بکەوین زەینەب چاوەڕوانی منی دەکرد و بە دەنگێکی نەرم و پڕ لە سۆز پرسیاری لێ کردم " سەرمات نییە". هەر وەکو ئەو منداڵانەی کە نەیاندەویست دایکی خۆیان عەفوو بکەن هەوڵم دەدا کە چاوم نەکەوێتە نێو چاوانی زەینەبەوە. کاتێك کە لە بەر رووناکی مانگەشەودا سێبەرمان درێژ دەبوویەوە و لە لای ئەو خانەوادەنە کە چەندین سڕ و نهێنییان لە نێو خۆیاندا حەشار دابوویەوە دەگەڕاینەوە بیرەوەرییە کۆنەکانم بە بیرم دەهاتنەوە. کاتێك کە باڵندەکانی شەو باڵیان دەگرت دەنگی شوور و شەوقی ئەفسوونمان بیست. لە نێو تاریکییە لاجوەردییەکەدا هەر وەکو ئەو یاریزانانە بوو کە سەرقاڵی راهێنان و ئامادەکردنی خۆیان بوون.

دەریا بە شێوەیەکی جەسوورانە دەنگی ئەفسوونی لە نێو خۆیدا بزر دەکرد. ناسانسورە مێژووییەکەی شۆقەکان و سەقفە بەرزەکان و چۆنیەتی کارکردن لە نێو ئەم شوقانەدا بیر و مێشکی مرۆڤی بۆ ساڵانی رابردوو بە پاشەوە دەبرد. لەم کاتو ساتانەدا من بیرم لەوە دەکردەوە کە لە نێو باڵاخانە کۆنەکاندا کە زەمین لەرزەکانیش بە هیچ شێوەیەك نەیانتوانی بوو کاریگەری لە سەریان بکەن چی رووداوە و چ جۆرە سڕ و نهێنییەکیان لە نێو خۆیاندا حەشار داوەتەوە. من لە نێو ئەمجۆرە بیر کردنەوانەدا بووم کە دەنگی ناوەختی پیانۆ و دەنگی گفتوگۆی ئەو هونەرمەندانە کە سەرقاڵی ئامادە کردنی خۆیان بوون دەکەوتە گوێمان. مرۆڤە ناودارەکانی رابردوو ئەوانە کە شك و گۆمانیان لە سەر واقیعیەت و راستەقینە بوونی هەبوون هەبوو، بەم نیوەشەوە چییان دەکرد؟ لە سەر دیك و سەحنە و پەردەکاندا چییان دەکرد؟ کاتێك کە بیرم لەم پرسیارانە دەکردەوە رابردوو و بیرەوەرییەکانی خۆمم بە بیر دەهاتنەوە. ئەفسوون بۆ گاڵتە کردن شەپەیەکی زۆر باشی لە پشت ملی حەسەن دا و لەم کات و ساتانەیشدا مولکییە و ئەکو (مەبەست ئەکرەمە. وە) زۆر بێدەنگ بوون. حەسەن بەبێ ئەوەی کە درەنگ بوونی کات رەچاو بکات تەلەفۆنی بۆ مولکییە و ئەکرەم کردو دەعوەتی کردن. هێنانی تۆوی کوێندرەی بێ پێست بە لای مولکییەوە زیاتر لە عادەتێك ببوو وەکو کولتوورێك، دەیگوت خواردنی نان بەبێ نێوە هیچ تام و چێژی نییە. زەینەب برێك پەشێو بوو، هەرچەند ئەگەر قسەشمان نەکردبا بەڵام دەمانزانی کە لە نێو ناخی یەکتردا چی رووی دەدا. زاڤین هەستی بە پەیوەندییە رۆحییەکەی نێوان من و زەینەب دەکرد. کاتێك کە هەستم بەوە کرد کە هەر هەمووی خۆشەویستییەکان و هەر هەمووی نیلتیفاتەکان روویان لە من کردووە ئەو کاتە لە روخساری مندا ئاگر دەباری. کاتێك کە زەینەب بە هەستیارییەوە ئەو مێوانەی کە پێستیانی لا بردبوو دەیدا بە دەستی منەوە دەیگوت" چی دەبێت لە من تێ بگە".

ئەفسوون و مینە خانەوادە خاوەن مڵك و ماڵەکانی خۆیانیان بەجێ هێشتبوو و بۆ پاراستنی بیرورای خۆیان خۆڕاگرییان دەکرد. بەڵام کاتێك کە رەخنەیان ناراستەی رێبازی نێو خانەوادەکان دەکرد لە راستیدا باسی جیاوازی و جۆرەیەك لە دەوڵەمەندی کولتوورییان دەکرد، بۆیە زۆر کەیف خۆش دەبوون. لەم کات و ساتانەشدا مولکییە دەیگوت" ئەجنەکان من مەهێننە سەر سەری من هەی لووسە بێتامانە". مولکییە باسی ئەوەی دەکرد کە لە بارودۆخێکی زۆر ئاڵۆز و ناڵەباردا گەورە بووە، هەمیشە ماڵیان پڕ بووە لە مێوان، لە ئامادە کردنی خواردن بۆ ئەو کەسانەی کە لە گوندەوە هاتنە و سەردانی ماڵی ئەوانیان کردووە وەڕەز بووە، گوندییەکان تەنیا تا ئەو کاتە

دۆست و هاوڕێن کە چاو و گوێیان بکرێتەوە دواتر دەبنە وەکو نەیاری مرۆڤ. مولکییە هەمیشە ئەمەی دووبارە دەکردەوە کە کاتێك کە مرۆڤ خاوەن تەربییە و ئەخلاق و کولتووری باش نەبێت ئەو کاتە پەروەردەی مکانیکی بە تەنیا ناتوانێت ببێتە هۆکاری باش بوونی مرۆڤ. من خۆم بە بەرپرسیاری هەڵسوکەوتی هەرکەس دەزانی. زۆربەی کاتەکانی خۆم بۆ ئەوان تەرخان دەکرد، زۆر هەولم بۆیان دەدا، دەرگای کتێبخانەکەی خۆمم بۆیان دەکردەوە، یا کاتێك کە بۆ وەرگرتنی ئەوان لە نێو قوتابخانەکاندا شەو و رۆژ هەوڵمدەدا ئەوان لە جیاتی ئەوەی کە قەدری ئەو هەوڵدانانەی من بزانن هەمیشە لەگەڵ ئەو کەسانەدا یەکیان دەگرت کە بۆنی ئەوانیان دەدا. چونکە رەقابەت و فتنە و فتنەکاری و قسە هێنان و قسە بردن لە نێو ئەمجۆرە یەکگرتنەوانەدا دەبوو بە هۆکاری بەخێو کردنی رۆحی ئەوان. هەر ئەو کەسانە کە من ئەوەندە بۆیان هەولم دابوو بۆ ئەوەی کە سلاوی من نەکەن زۆربەی جاران رێگاکانی خۆیانیان دەگۆڕی. وەکو ئەو وڵاتە نادیمۆکراتیکانە کاتێك کە بۆ خۆیان دوژمنی خەیاڵییان دروست دەکرد و بەمجۆرە پشتی خۆیانیان بە خۆڕاگری نێو ژیان گەرم دەکرد. ئەمە لە کاتێکدایە کە گەورەترین دوژمنی ئەوان ئەو رۆشنبیرانە بوون کە بە یەکجاری لە نێو کولتووری بۆرژوازیدا نۆقم ببوون. کاتی پیرۆز کردنی جەژنەکانی سەری ساڵمان لە ماڵی دەراوسێیەکی خۆمان بە ناوی خالس کە خزمی رۆژنامەنووسێکی تازە پێگەیشتووبوو تێدەپەڕاند. پێی گوتین بۆ جارێك لە حاڵ و وەزعی ئێمە ناپرسن، ئێمە خۆ زۆر نزیکی یەکترین، مانای ئەم وتەیە ئەوە بوو کە مادام ئێوە سەردانی ئێمە ناکەین ئەو کاتە ئێمەیش بە هیچ شێوەیەك سەردانی ئێوە ناکەین. ئەریّ ئەو گوندییانە کە تازە دێنە نێو شارەوە و تۆیش بۆیان هەر جۆرە خزمەت و هاوکارییەك دەکەی بەمجۆرە هەڵسوکەوت دەکەن. کاتێك کە مولکییە باسی ئەم شتانەی دەکرد من ژن بوونی خۆمم لە بیر کردبوو و لە نێو ئەو جاهیلانەیدا کە مولکییە بۆیان قسەی دەکرد دانیشتبووم. دوای کۆتایی هاتنی ئەم وتانەی مولکییە، من لە نێو پرسیارەکانی سەبارەت بە هۆکاری ئەم هەڵسوکەوتەی گوندییەکان نوقمی هەزار و یەك جۆر بیر کردنەوە دەبووم. کاتێك کە دەستمان بە قسە کردن دەکرد بە راستی کە زۆر قسەمان دەکرد. جارێکیان من نەشتەرگەرییەکم کرد و ئەو کەسانەی کە دەهاتن سەردانی منیان دەکرد بە هەڵسوکەوتی خۆیان خزم و کەس و کاری منیان بە بیرم دەهێنایەوە. وا بزانم ئەو ژنە هەستی بە بێچارە بوونی ژنان بە تایبەتی منی کردبوو کە کاتێك دەیەویست تۆزێك دەوروبەرمانی کۆ بکاتەوە کچەکەی کە هێشتا کاریگەری بن دەستی لە سەری بوو لە ناکاوەوە دەستی دایکی راکێشا و پێی گوت" بێچارە تۆ بۆ کۆ دەکەیتەوە؟" کاتێك کە من ئەم هەڵسوکەوتەی ئەو کچەم بینی تێگەیشتم کە

ئەو مرۆڤانەی کە سەرەتا زۆر هەژار و داماون و پێویستییان بە هێز و یارمەتیدان هەیە دواتر کە تۆزێك بن بە خاوەن هێز ئەو کاتە دەیانەوێ لە یەکەمین دەرفەتدا تۆڵەی رابردووی خۆیان بکەنەوە. ئەو کاتە کە زەینەب لەمجۆرە قسانەی مولکییە وەرەز بوو هەڵستا و ویستی ڤیسکییەکان نوێ بکاتەوە. ئەکرەم پێی ناخۆش بوو کە زەینەب گوێ ناداتە ئەم قسە و باسانەی مولکییە، هەر بۆیە زۆر بە هێمنی ولەسەرخۆیی مولکییەی ئاگادار دەکردەوە.

کاتێك کە لە کۆنفرانسی فرە کولتووریدا زەینەب و نۆڤام چوومسکیم پێکەوە دیتن و لە سەر فرە کولتووری قسەیان دەکرد ئەو کاتە رەشەبای نێو هەناوم تۆزێك ئارام ببوو. چوومسکی باسی خۆشحاڵ بوونی خۆی بۆ سەردانی مزیوپوتامیا و ئەنادۆڵ دەکرد، کاتێکیش کە باسی شەڕی ئەمریکا و ڤێتنامی دەکرد ئەو کاتە ئێمەیش بە جەسارەتەوە باسمان لە فەلستین و کارەساتەکەی هەڵەبجە دەکرد. لە دەنگی چوومسکیدا دیار بوو کە لە نارسیزم خۆی خاوێن کردووەتەوە. چوومسکی بەمجۆرە درێژەی بە وتەکانی خۆی دا" نەتەوەو دەوڵەت بە شێوەیەکی زۆر وەحشییانە لە ئەورووپادا بەجێ کراوە داواکارییەکانی ئەم سیستەمە بۆ پەرە پێدانی داگیر کردنی ولاّتانی دیکە لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەیشەوە هەر ئەو کەسانە کە کوشت و کوشتارە جۆراوجۆرەکانیان بەرێوە دەبرد بە ئەوانی دیکەیان دەیگوت تیرۆریست. تیرۆری دەوڵەت چەندین قات لە جۆرەکانی دیکەی تیرۆر بەهێزتر و بەرفراوانتر بوو. تیرۆری هەرە بەرفراوان و هەرە وەحشەتناك لە لایەن دەوڵەتە خاوەن هێزەکانەوە پەیڕەو دەکرێت. تیرۆریستی هەرە بەهێز ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی ئەمریکان. رۆژهەلاّتی ناوەڕاست خاوەن گەورەترین کێڵگەی نەوتییە و ئەمریکاش دەیەوێ کۆنترۆڵ و دەسەلاّتی خۆی بە سەر ئەم ناوچانەدا بسەپێنێت."

کاتێك کە زەینەب دەستی بە قسە کردن کرد لە هەیەجاندا رەنگی سوور بوو و بە مەبەستی زاڵ بوون بە سەر هەیەجانەکەیدا جار جار دەستی بە کۆخین دەکرد. سەیرێکی زاڤینی کرد و زەردە خەنەیەکی کرد. کاتێك کە باسی فرە کولتووری و پەیوەندییەکانی نێوان کولتوورە جیاوازەکانی دەکرد دەیگوت ئێمە بێجگە لەوەی کە هەوڵ دەدەین کولتوورەکان قۆناخی تەنیا بوونی خۆیان تێبپەرێنین لە لایەکی دیکەیشەوە هەوڵ دەدەین کە کولتوورەکانی دیکەیش بە باشی بناسین. دوای ئەم وتەیە باسی لە باشییەکانی سروشت و بە هێز بوونی یەکێك لە هەبوونەکانی نێو سروشت کە مرۆڤ بوو دەکرد و دەپرسی ئایا مرۆڤ مافی ئەوەی هەیە کە ئەم هەموو شتە باشانەی سروشت لە ناو ببات؟ لە کاتی پرسینی ئەم پرسیارە لە لایەن زەینەبەوە من سەیری زاڤینم دەکرد. زاڤین هەر دوو دەستی خۆی دابوو بە ژێر چەناگەیەوە و زۆر بە ورد

بینی گوێبیستی زەینەبی دەکرد و ئەمەش بەس نەبوو لە سەر پێیەوە دەستی بە چەپڵە کوتان بۆ زەینەب کرد. من لە چەپڵە کوتانەکەی زاڤین تووڕە ببووم و دەنگێك لە نێو ناخمدا پرسی" ئایا هێشتاکە رقت لە پەیوەندی نێوان زەینەب و زاڤینە؟". ئەم دەنگە و ئەم پرسیارە زۆر دڵی منیان ئازار دەدا.

لە نێو کتێبخانەکانی جاددەی ئیستیقلالدا کتێبمان دەکڕی و لە نێو کافەکاندا قسەمان دەکرد و زەینەبیش سەیری دەریای دەکرد و نوقمی بیرکردنەوە دەبوو. کاتێك کە لە نێو جانتاکەیدا وێنەی خانەوادەی نیشانی زاڤین دەدا هەوری ماتەمینی سەر و رووی دادەپۆشا و دەیگوت" دایکی من ژنە ئاغایە، هیچ حەزی لە من نەبوو، نە تەنیا من بەڵکو حەزی لە باوکم و ئەوانی دیکەیشی نەدەکرد، بۆ ئەوەی کە خۆ و دەسەڵاتی خۆی بە سەر هەر کەسدا بسەپێنێت هەمیشە دەستی بە وتەوبۆڵە و رەخنە گرتن و ئیراد گرتن دەکرد. هیچ کەس ناتوانێ بە ئەوەندەی دایکی من ئیرادەی ئەوانی دیکە لاواز بکات و کەسایەتییەکانی ئەوانی دیکە رەنجیدە بکات. بە غروور و تەکەبورەوە سەیری براکانی منی دەکرد. یەکێکیانی دەبردە لای چەپ و ئەوی دیکەی دەبردە لای راستی خۆی و دەستی بە ئەمر کردن دەکرد. هەمیشە بە چاوێکی سووك سەیری باوکی منی دەکرد و پێی دەگوت دوو وشە نازانی و هەمیشە لە نێو بێستاندا وەکو زەرەت گەورە بوویی. بە هۆی ئەوەیەوە کە من برێك وەکو باوکی خۆم بووم هەمیشە لێوی بۆ من گاز دەگرت و دەیگوت بەم عەقڵەوە ناتوانی ببیتە دەستە بۆ هیچ بەبرێك. (مەبەست بە کەڵکی شتێك نایێ و بەبر ئەو ئالاوەیە کە دار و درەختی پێ دەبڕنەوە.وە). باوکم دایکمی فێری ئەوەی کردبوو کە وتەوبووڵە نەکات. چەند ساڵ دواتر کاتێك کە من لە دایکم کە خاوەن رۆحێکی ئامازۆنی بوو (مەبەست سەرکەش و جەسوورە. وە) تێگەیشتم ئەو کاتە چەندین دیواری بەرز و ئاسنین لە نێوانماندا بوون. هاوکات لەگەڵ ئەم قسانەی زەینەبدا زاڤین پرسیاری لێ کرد" بڕۆین بۆ لای دایکت؟"

کاتێك کە بە فەریبۆت (جۆرەیەکی واپوور یا بەلەمی گچکەیە. وە) دەمانەویست بڕۆین بۆ ئایوالیك زەینەب بێدەنگ دەبوو" تێ نەگەیشتم کە ئەم بێدەنگییە بە مەبەستی نزیك کردنەوەی زاڤین بوو یا بە هۆی کاریگەری ئەو بیرەوەریانەیەوە بوو کە دەیگێڕانەوە. کێ دەیزانی کاتێك کە دار زەیتوونەکان وەکو نوقرە دەدرەخشانەوە و لە نێو باخە تێرێکاندا هەیبەتی خۆیانیان نیشاندەدا و پان لیریان دەکێشا و دڵی کچە جوانەکانیان بەربڵاو دەکرد و دانسیان دەکرد (شایی و ئاهەنگ گێڕان). کاتێك کە من بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەفریدوت (مەبەست

خوداوەندی جوانی و خۆشەویستییە. وە) دەریاکانی بە کەفەکانیانەوە خۆش دەویست، لە خۆم و لە سروشتە جوانەکەی سەر زەوی دوور دەکەوتمەوە. شك و گومانەکانی من لەسەر ئەوەی کە چی دیکە هاورێیەتی و دۆستایەتی نەماوە وردە وردە دەبوون بە راستی و واقیعیەت. دایکی زەینەب دارەکەی دەستی دەدا بە زەوییەوە و بەو چاوە شینانەی خۆی کە وەکو دەریا بوون سەیری چاوەکانی زەینەبی دەکرد و دەیگوت" لەمێژە من تۆم لە دەست داوە کچی خۆم". کاتێك کە دایکی زەینەب ئەم قسەیەی دەکرد زەردەخەنەیەك لە نێو روخسار و چاوی برا و برازاکانییەوە دیار بوو. توورە بوونی دایکی زەینەب بە کۆتایی نەدەهات، کاتێك کە زاڤینی دیت لێوی خۆی گاز گرت و وتی" کچی من لە شار و وڵاتی خۆتدا هیچ کەسێك بە دەستت نەکەوت؟ لە بنەماڵەی خۆت هیچ خێرت نەدیوە، چییە ئێستا لەگەڵ کەسێکی کە هیچ دیار نییە کێیە و بنەماڵەکەی کێیە هاتوویتە بەرچاوم". دایکی زەینەب بە دەنگی بەرز ئەم شتانەی بە زەینەب دەگوت. دواتر زەینەب لە سەر قەبری باوکیدا دەگریا و دەیگوت" ئاخ بابۆ من چەندە بیری تۆم کردووە" و زۆر بە هێمنی فرمێسکەکانی خۆی سڕییەوە. زۆر لە ئایوالیکدا نەماینەوە. براکانی زەینەب کە وایان زانی بوو زەینەب بۆ دابەش کردنی میراس و ماڵ و مڵك هاتووە، هەڵسووکەوتیان لەگەڵ زەینەبدا زۆر سەرد و سڕ بوو. بە زەینەبیان دەگوت تۆ کەسێکی کە لە رێگای راست دەرچوویی و بە دەوڵەت و نەتەوەکەی خۆت خیانەتت کردووە. هیچ بایەخێکی پەیوەندییە خوێنییەکان نەمابوو. زانا بوون و جیاواز بوون لەگەڵ خۆیاندا پەراوێز خستن و گۆشەگیر کردنیانیشی هێنابوو.

دواتر زاڤین لە جەهانگیردا ماڵێکی باشی کرێ گرت. بە مەبەستی خۆ ئامادە کردن بۆ کۆچ کردن بۆ ئەستەنبووڵ کۆکردنەوەی کتێبەکان بە پێی ناوەرۆك و ناوەکانیان کارێکی زۆر خۆش بوو. دابڕانمان لە شارە سوورەکە بڕێك ئەستەم بوو. ئێمە زۆر بە باشی ئاگامان لە پێکەوە ژیان و دابران لە یەکتر هەبوو.

کاتێك کە ئێمە دەستمان بە کۆکردنەوەی شت و مەکی نێو ماڵ کرد، ئاگر بەستێکی یەك لایەنە راگەیندرابوو و شەڕ و پێکدادانەکانیش تۆزێك کەم ببوونەوە. لەم رۆژانەشدا زەینەب و زاڤین بە مەبەستی سەردان چوون بۆ دەڤەری حەران و نەمروود (دەڤەرێکە لە باکووری کوردستاندا و نەمروودیش شاخێکی سەربەرزە لە باکووری کوردستان. وە). نێو ماڵ پڕ دەبوو لە بۆنی ئاکاسیا (جۆرە گوڵێکی بۆن خۆشە. وە) و دەنگی ئەو منداڵانە دەهات کە وردەواڵە و شتی گچکەیان دەفرۆشت. ئەو مەکتووبە یا ئەو دەست نووسە کە لە سەر زەوییدا بوو سەرنجی

منی راکێشا. لە نێو ئەو نووسراوەدا گوڵی وشك کراویش هەبوو. نووسینەکە زۆر ڕێکوپێك بوو، بەڵام نە ناو و نە مۆر و نە مێژووی لە سەر نەبوو.

" بۆشایەتییەك کە تێپەڕ بوونی ساڵەکانیش نەیتوانی لە ناوی ببات لە ناخمدا ریشەی کردووە، ڕۆژەکان لەگەڵ ناکۆکییە ناوخۆییەکاندا تێپەڕ دەبوون... دڵی من بە هیچ شێوەیەك نەیتوانی بوو دەنگی خۆی ببینێتەوە، هیچ نەمزانی کە کات چییە، هەمیشە خۆشەویستیم بە دواوە خست.

هیچ چارەیەکم نەبوو، منیش ببووم وەك وڵات و شارەکەی خۆم، خەیاڵەکانی منیش وەکو ئەو گوندانە بوون کە کاول کرا بوون.

عشق نەیتوانی لەگەڵ سێبەری مندا رابێت! هیچ کەس نەیزانی و تێ نەگەیشت کە بەو سەیرکردنانەی خۆمەوە چەندە ماندوو و هیلاکم.

دوای ئەوەی کە من تۆم ناسی رۆحم لە خەوی زستانەی خۆی هەڵسا. چەندە من و تۆ وەکو یەکترین، هەبوونی تۆ بانگەوازی ئاراستەی من دەکرد، هەبوونی منیش بە دوای تۆدا گەڕا تا تۆی دۆزییەوە، هەر هەمووی ئەو دەنگانەی نێو دڵی من کۆتاییان پێ هات، رۆحی لەرزانی منیش هەر هەمووی ئەوانەی گرتە باوەشەوە، کاتێك کە نهێنییەکانی هەزاران ساڵ و خۆڕاگریەکەی شارەکەم دەچۆڕانە نێو دڵمەوە، لە نێو ژوورەکەی خۆمدا پرسی قەدەغەکراو دەنووسم و دەچم... باوکم، دایکم و براکان و خۆشکەکانم، لە سەر هەر تایەکی قژەکانمدا هەزاران هەرەشەی رابردوو، ئێستاش وشە نوێیەکان تێکەڵی وشەکانی من دەبن و دەستە خاوەن هونەرەکانیش رەنگی رۆحی من دەماڵن.

چی دیکە لە هەست و پێشبینییەکانم تووڕە نابم لەو شتانەیش کە دەیانزانم و لەو شتانەیش کە بیرم کردنەوە هیچ تووڕە نابم.

ئەو ژنە کراس دڕاوەی نێو کتێبەکان کە من خوێندوومن بە چاوی خۆی سەیری من دەکات، تۆ خۆت لە نێو ئەو رستانە کە دەیان نووسم حەشار داوەتەوە، خۆشەویستی تۆ بۆنی پێنووسەکەی من دەکات و منیش لە نێو دەریای عەشقدا مەلەوانی دەکەم.

کتێبە هەرە باشەکان بۆ تۆ دەنووسم، بهێڵە کە چیرۆکەکەی تۆیش بە پشتی خۆم هەڵبگرم.

بهێڵە با بیبەم بۆ بێ کۆتایی و دەرفەتم پێ بدە با باس لەو مێژوویەی مزیۆپۆتامیا بکەم کە لە نێو تازیەدایە (مەبەست پرسە و ماتەمینییە.وە). دەنگی تۆ سەیبەری خەمۆکی من بەربلاو دەکات، منیش دەکەنم و دەڵێم" ئاه بۆ چی ئەم ژنانە بەمجۆرەن". کێ ئێمەی لە خۆمان

جیا کردەوە، کێ ملی کێشا بە چاوەکانمانەوە، ئەرێ ئێمە هەر بەجۆرە لە دایك بووین، بێدەنگ بە! دایکانی ئێمە چەندین ڕێگایان پێوایە، ئەو ژنانەی کە شەڕیان دەکرد، یا ئەو کچانەی ئێمە کە ئێستا لە پشت دیوارە ئاسنینەکاندان نەبیسن، ئەو شار و گوندانەی کە ئێمە بیریان لێ دەکەینەوە سەر لە نوێ لە دایك دەبنەوە، ئەو کەسانەش کە لە سەر گوێ زەویدا دەرفەتی خۆشەویستیان بە دەست نەکەوتووە ژمارەیان زۆرتر دەبێت، تۆ من ماچ دەکەی لە نێو گوندێکی شاخاویدا و مێژووی رابردووی خۆمانیش شرۆڤە دەکەین، لەو شارە عەنتیکەدا دەبمە پسپۆڕی شوێنەوارناسی رۆحی تۆ. لە نێو دارستانە ئمارەکاندا، لە نێو ئەو تیشکانەی کە چاوی تۆ بێ ئارام دەکەن، سەیرت دەکەم و تا کۆتایی تەمەنم حەزت لێ دەکەم چونکە من بە عەقڵەوە حەزم لە تۆیە....

من زۆر سەرمسورمابوو کە چ کەسێك ئەم نووسینەی نووسیوە. ئەمە نە نووسینی زەینەب بوو چونکە من دەست نووسی زەینەبم دەناسی. کێ دەیزانی کە خاوەنی ئەم نووسینە لە کوێیە! شایەد نووسینی نووسەرێکی ئاماتۆر و تازەکار بێت، شایەد لە لایەن تێکۆشەرەکانی ئازادی لە سەر چیاکانەوە نووسرابێت، یا لە لایەن ئەوانەی کە لەنێو گرتووخانەدا یا لە لایەن ئەو کەسانەیەوە نووسرابێت کە بە زۆرەملێ ناچار کرابوون کە گوندەکانیان چۆڵ بکەن. من زۆر حەزم دەکرد کە رۆحێکی بەجۆرە رۆحی من بێت. وردە وردە ئاگر سەرتاپای منی داگرت و منیش حەبێکی ئارامبەخشم خوارد و چوومە بالکۆنەوە و سەیری رووبارم کرد، بە راستی رووبار وەك خەنجەر دەدرەخشایەوە.

هەر شتێکی نوێ و هەر ڕووداوێکی نوێ خاوەن ئێش و ئازارێکی تایبەت بە خۆیەتی، بۆ ماوەیەك لە دژی ئەو هەستانەی خۆم کە حەزیان لەم شارە نەدەکرد شەڕم کرد. لەو بەیانییانەی کە پڕ بوون لە بۆنی نەم بە زۆر لە خەو هەڵدەستام. دەریا، کەشتییەکانی نێو دەریا و گوندەکان و مارتییە بێ عارەکانی نێو دەریا زۆرتر غەریب بوونی منیان لە سەر من فەرز دەکرد. ئەمە لە کاتێك دایە کە ئەستەنبوڵ پڕ ببوو لەو کەسانەی کە لە دەڤەرەکەی ئێمەدا کۆچیان کردبوو و هات بوون و لە ئەستەنبوڵدا نیشتەجێ ببوون. دانیشتووە بوومییەکانی ئەستەنبوڵ زۆر لە گوندییەکان توورە دەبوون و هەمیشە دەیانگوت" ئەستەنبوڵێشیان کردووە وەکو گوندەکانی خۆیان پێویستە چارەسەرییەك بۆ کێشەی کۆچکردن بدۆزرێتەوە". کاتێك کە دەنگە دەنگی مارتییەکان دەکەوتە نێو خەمی ناخی منەوە، ئەو بیرەوەریانەم بە بیر دەهاتەوە کە دەنگی ئالاوە هۆشیار کەرەوەکانی کەشتییەکانم دەبیست. پەنجەرەکەم دەکردەوە و برێك

هەوایەکی نمدارم هەڵدەکێشا. کاتێك کە لە ژێر ئەو هەتاوە بێ کاریگەرییەدا چاوەکانی خۆمم دادەخست عەقڵ و مێشکی من لە لایەن هەزاران دەنگەوە دەورپێچ دەکرا.

هاوکات لەگەڵ دەست پێکردنی وەرزی هاوین سەفا کردنی من لە نێو باڵکۆندا دەستی پێدەکرد. تا ئەو ئاستەی کە قاچەکانم لە سەر زەوی دابڕایانا بیرم لە دووره دەستان و وڵات و گوندی خۆم دەکردەوە یا وەکو ڤانترولوگێك قسەم لەگەڵ قارەمانەکانی نێو ڕۆمانەکاندا دەکرد.جارێکیان وا بزانم ئەوەندە لە نێو فکر و بیرەوەرییەکاندا بووم کە دراوسێکەم بە ئەنقەست دەستی بە کۆخین کرد. سەرەتا هیچ تێنەگەیشتم کە چی گوت. کاتێك کە ماڵەکانیش پێکەوە چەسپابن ئەو کاتە شتێکی تایبەتی مرۆڤ نامێنێت. سەرەتا لەوە ترسام کە ئەو شتانەی کە من بیریان لێ دەکەمەوە لە لایەن دراوسێمانەوە بیسترابن. من وتم" کەش و هەوا چەندە خۆشە؟" دەراوسێکەی من کە کچێك بوو کە تەمەنی جوانی لە ئەڵمانیا تێپەڕ ببوو دەیزانی کە کار کردن و ژیان لە ئەڵمانیا چەندە خاوەن ئێش و ئازارە. پرسی" لە بەیانی تا ئێوارە لە سەر مێز دانیشتووی و دەنووسی و دەخوێنیتەوە هیچ بێزار نەبوویی؟ حەیفە وەڵلاهی! بۆ چاوەکانت حەیفە! کاتێك کە من ئەم شتانەم بیست ئەو کارەکتەرانەی کە لە نێو مێشکمدا جێیان گرتبوو دەهاتنە بەرچاوم و دەیانگوت" بۆ چی بێدەنگی وەڵامی بدەوە". ئەم کارەکتەرەی کە ئەمەی پێ گوتم جەنابی بلووم بوو. هەر وەکو خێڵە پاش کەوتووەکان قسەی دەکرد.

دواتر دراوسێکەم سەری بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و دەستی بە خوراندنی سەری خۆی کرد و وتی" تو ئوئو.. ئەلیادا لە ریشە و بنەڕەتی شارستانییەتەکاندا، دەی بڵێ کە ئەو ئودیسەیای کە ببوو هۆکاری بەناو و دەنگ بوونی سوفولەکس. دەی باس لە قارەمانە سەر زەردەکەی ئەسپارتا مەنەلاوس و باسی ئەو ئاقهیلاسە بکە کە هەکتوری کۆشت و باسی ئەسپەکەی ئولیسەس بکە. لەم کات و ساتانەدا مامو تویەی دەرکەوت هەر وەکو ئەو کەسانەی کە بە دوای کۆکردنەوی پارەدابوون ناوبراویش بە دوای کۆکردنەوەی زانیاری و زانست بوو. کاتێك کە دەیگوت" هەر چەندە کە لە سەرچاوەی شەربەتی زانستدا مرۆڤ شەربەت بخواتەوە هیچ تینووبوونی ناڕەوێت". دواتر دەنگی ئەجنەکەی کریستوف پولمارم بیست کە لە نێو تاریکیدا دەهات و دەیگوت" وڵاتی ئێوەش هەر وەکو مکزیکە، ئاه زۆر گومانم هەیە، نازنم بێمە نێو ئەم دونیا بێ عەدالەتەوە یا نا".

سەلیم ئیشیك و تۆرگۆت ئوزبەن کە زۆر خەڵك حەزیانی لێ نەدەکرد پرسییان کە " ئەدەبیاتی بورژوازی چییە". ئەوان دەیانگوت کە رووحاڵی ئەدەبیاتی بۆرژوازی لە

کۆمەڵگە و ڕۆحی کۆمەڵگە زۆر دوورە. منیش وتم "ڕاوەستن ڕاوەستن! چۆنە نووسەرە ڕۆشنبیرەکان منیان دەورپێچ کرد". لەم کات و ساتانە خاتوو بوڤاری داوێنە کورتەکەی خۆی کۆکردەوە و هات و وتی" ئاە ئەو پیاوانە هەر هەموویان بەجۆرەن، سەرەتا دەڵێن عاشقین و دواتر واز دێنن". هێشتای ئەم قسانەی خاتوو بوڤاری تەواو نەبووبوون کە ئاننا کارانینایش هات. ئاننا وشك و لە سەرخۆ و بە هێز بوو، دەستی بە لا تەنیشتی خۆیەوە بەست و کەنییا و وتی" تاوان هی ئێمەیە خاتوون". هەر شت وەکو ڕابردوو دەڕۆیشت. ئاننا وتی" وا بیر دەکەینەوە کە ئەو کەسانە کە پێوانە ئەخلاقییەکان پێشێل دەکەن خوا سزایان دەدات؟" کێ سزای ژۆلیەن سورەنی پێدا؟ بوڤاریی چاوەکانی خۆی خوراند و وەکو ئەوەی بڵێ بە دوای پیاوێکی دیکەدا بگەڕێت وتی" ئەو بوو بە قوربانی نەزانکاری خۆی و دواتر خۆی لە ناو برد". پرۆفیسۆر ئایسەل وتی" مەگەر ئاسانە کە ژن بوون و بە تەنیا ژیان کردن و پەراوێز خستن"..

دانا دەنسمورە" بەراستی ئەو ئازادییەی جنسی کە باسی لێوە دەکەن جۆرێکی نوێیە لە هەڵخەڵەتاندنی ژنان و داگیر کردنی هەستی ژنانە، عەقڵی خۆتان لە سەری خۆتاندا کۆ بکەنەوە".

فەریدە پرسی کە" پێویستە چی بکەین؟" پێویستە واقیعبین بین و خوێندن و نووسین فێری ئەو کەسانە بکەین کە لە گوندەکاندا هاتوونە. مامۆستای گوندی پرکانیس" بە چاوی تۆز و دوومان و پەمبە سەیری دونیا نەکەین، وەرن سەیری منداڵەکانی حەکاری بکەین هەر هەموویان بە نا نا هاوار دەکەن". ئەمینەش وتی" کەواتە ئێمە بە بەلاشی و بۆشی هاواری حەق و حقووق دەکەین، کاتێك کە ئێمە لە ژێر ئەشکەنجەدا بووین ئێوە لە سەر مێزەکاندا کەیفتان دەکرد". کنعانی شۆڕشگێڕی ترسنۆك چاوەکانی خۆی داخست و وتی" ئاخ تەنیا بۆ ساتێك توانیم بایا لە ترسی پۆلیس ڕزگار ببوومایا". لەم کات و ساتانەدا مەحمەدی باڵا کورت هات و وتی" مەسکەن و ماوای ئێمە چیاکانە، هیچ کات عابێد ئاغاکان کەم نابنەوە". قارەمانە بێ ماناکەی ژیانی نوێ!... کوا ئەو کەسەی کە یەك شەو کتێبێك بخوێنێتەوە و ژیانی خۆی بگۆڕێت. وەکو بایەقووشی کۆر لەم لاوە بۆ ئەولا دەڕۆیشت و خۆی دەگۆڕا. هەر دووکیان دەستیان بە قەیرانی پێکەنین دەکرد. پرۆفیسۆر کیەن دەسماڵە تۆزاوییەکی دەستی خۆی دەتەکاند و دەیگوت" منیش لەگەڵ کتێبەکانمدا بسووتێنن". بەرچەت دەیگوت" هیە هیە ئەو نووسەرەی کە کتێبەکانی لە نێو مەیدانەکاندا نەسووتێنرێن نە نووسەرە".

سمبێلەکانی دون قۆیژوتە دەلەرزیان و دەیگوت" پێویستە وەك من مانا و واتە بدەینە جیهان، پێویستە بۆ دۆلیجینەئا ئاگرتان پێ بکەویت و گڕ بگرن ئەو کاتە دەتوانن ئایینی خۆتان بەرفراوانتر بکەین".

کاتێك کە دراوسێکەم وتی" نەتان بیست؟ سەیربکەین لە سەرەوە تۆز دەبارێت". سەری خۆمم بەرز کردەوە و سەیرم کرد، دەستێکی چاق و تۆزاوی چەند کیسەیەکی بە دەستەوەیە و دەیانوەشانێتەوە. "خوایا" شەپۆلەکانی وەرجینا ولف لە نێو دڵی مندا بوون و من وتم لەگەڵ کێدا قسە دەکەم. چی بوو ئەو بۆشایەتییە و تەنیاییەی نێو ناخی من!

دەنگێك لە نێو ناخی مندا دەیگوت" بەسە، بەسە ". بارودۆخ بەمجۆرە بوو خۆشەویستێکیشم نەبوو. سەڤتاب لە زانکۆدا پێ گوتبووم " ئەستێرەکانی بەختی من کەوتوونەتە نێو تاریکییەوە هیچ کەسێك سەیرت ناکات". بێگۆمان ئەمە تەنیا بۆ گاڵتە کردن بە من بوو، کاتێك کە نەیدەتوانی هەستەکانی خۆی کۆنترۆڵ بکات و هەر هەموویانی دەرژاندە سەر شەقامەکان، وای دەزانی کە خۆی زۆر خۆشبەختە. بەڵام هیچ وا نەبوو. هەست و نەستی من تەنیا سەرکەوتن و پێشکەوتن بوو، نازانم ئایا ئەو تەنیاییەی کە ببوو بە قسمەتی من ئەنجامی ئەو زانا بوونەی من بوو یا سزای شتێکی دیکە بوو؟ ئازادی ئابووری بە مانای هەنگاونان بۆ ئازاد بوون بوو، بەڵام ئەمە بە تەنیا بەس نەبوو، چونکە پێویست دەکرد کە لە سەر هەر هەمووی دڵەڕاوکێ شك و گومانەکانیشدا زاڵ ببم. مانەوە لە نێو ئەو خەتە باریکە بەرتەسکەی پراتیکدا، بە مانای لەنگەر داخستن لە بەندەرێکی نائارام بوو. هەر چەندە گەڕان و دیتن و ناس کردنی مرۆڤەکانی دیکە شتێکی زۆر خۆش بوو، بەڵام هەمیشە دەمەویست لەگەڵ زەینەب و زاڤیندا بم. شەیدا بوونی من بۆ زەینەب یەکێك لە تایبەتمەندییە هەرە سەرەکییەکانی من بوو. دەبێت کە ئەم شەیدا بوونەی من زۆر بە دڵی فەیسەڵی عەنتیکە فرۆش بووبێت چونکە کاتێك کە منی دەدیت دەمی تا بناگوێ دەکرایەوە و بێدەنگ دەما. فەیسەڵ خەڵکی جەزائیر بوو. هیچ کات نەیدەتوانی ناکۆکییەکانی نێوان ژیانی نوێ و ژیانی کۆنی خۆی حەشار بداتەوە. ئەرێ بەمجۆرە بوو، ئایا وەکو کۆمەڵگەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست هێشتاکە سەرقاڵی گفتوگۆ کردن سەبارەت بە دیمۆکراسی، رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، نەتەوەپەرستی و جیاوازییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و چینایەتی نەبووین؟ فەیسەڵ کە لە ئەستەنبووڵ سەرقاڵی خوێندنی بەشی شوێنەوارناسی بوو، بۆ چەند ساڵێکیش لە شوێنەکانی دیکەدا مابووەوە و دواتر بۆ ژیان کردن ئەستەنبووڵی هەڵبژاردبوو. فەیسەڵ عەنتیکە فرۆشی چینی پێشکەوتوو بوو. هەرچەندە لە نێوان چرچە گەورەکانی نێو روخساری و دەنگە باریکەکەیدا ناکۆکییەکی زۆر گەورە هەبوو و ئەم ناکۆکییەیش دەبوو بە هۆکاری ئەوەی کە خەڵك شك و گومانی لێ بکەن، بەڵام بە هەڵسوکەوت و

ڕەفتارە نەرم و نیاکانی خۆی دڵی زۆربەی مشتەرییە ژنەکانی بۆلای خۆی ڕاکێشا بوو. بۆیە هەمیشە دووکانەکەی پڕ بوو لە مشتەری. هەر چەندە ئەو هەموو کچە جوانە نەیانتوانی بوو سەرنجی فەیسەڵ ڕابکێشن، بەڵام من حەزکردنی فەیسەڵ لە خۆم بە دوور بوونی فەیسەڵ لە وڵاتی خۆی دەبەستەوە و زۆر بە هەندم وەرنەدەگرت. مەحجووب بوونی من دەبوو بە هۆکاری زەبەلاحتر بوونی هەستە خۆرهەڵاتییەکان. فەیسەڵ هەمیشە بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن کاریگەری بکاتە سەر من، بۆیە هەمیشە هەوڵی دەدا خۆی لە من نزیك بکاتەوە. هەر چەندە من زۆر حەزم لە فەیسەڵ نەبوو، بەڵام زۆر کەیفم بە هەڵسوکەوتی فەیسەڵ لە بەرانبەر خۆم دەهات. جار جار کاتێك کە دەچووم بۆ لای لە دووکان، بۆ ئەوەی کە بە تەنیا بمبینێتەوە، لەگەڵ مشتەرییەکانی دیکەدا هیچ قسەی نەدەکرد و بەجۆرە پەیامێکی دەدا بە مشتەرییەکانی کە بە تەنیامان بهێڵن. کاتێك کە بۆنی ڤانیلیا لە پۆپەکەیدا دەهات و لە نێو ئەو شتانەی کە هەر یەکیان بۆ خۆی سەرمایەیەك بوو پیاسەی دەکرد، باسی مرۆڤایەتی و ئەو کۆمەڵگایەی دەکرد کە چۆن لە جەوهەر و ناوەرۆکی خۆی دوور کەوتووەتەوە. بە ڕاشکاویش دەیگوت" کە کەسێکم کە باوەڕی و متمانەم بە ئازادی تاکەکەسی لە بواری ئابووریدا هەیە و لە نەسڵی لیبراڵە نوێیەکانم."

ئەگەر بهاتایا و ئەو بەردە بیلانەی کە بە مەڕمەڕ داپۆشرابوون، کۆپە خاکییەکان، ئەو دەرگایانە کە بە شێوەی تواندنەوەی بەرهەم هێنرا بوون، ڕەنگە سەنعەتییەکان، ئەو پانودیوارییانەی کە بە سەدەفی ژاپونی بەرهەم هێنرابوون ، قەنافەکان و چاو بلبلەکان قسەیان بکردابایا ئەو کاتە کێ دەیزانی کە باسی چیمان بۆ دەکەن. من وا بیرم دەکردەوە کە ئەو شتانە شاهێدی چەند جۆرە خۆشەویستی و ئێش و ئازار و دەورانی عەنتیکە بوونە. جۆرەیەك لە خەمۆکی بە چاوەکانی فەیسەڵدا دیار بوو. بە هۆی زۆر ژیان کردن و زۆر دیتنی ئێش و ئازار و زۆرگەڕانەوە هیچ ماندوو نەببوون. بۆیە فەیسەڵیش دەیەویست ببێتە خاوەن دڵێك کە کون کون نەکرابێت. ئەو پیاوانەی کە کاتێك چاویان بە ژنان دەکەوت و ئاوی دەویان بەر دەبوو و بۆ ئەوەی کە کاریگەری لە سەر ژنەکان بکەن هەر هەمووی هێزی خۆیانیان بەکار دەهێنا هیچ سەرنجی منیان ڕانەدەکێشا. ئەو پیاوانەی کە هەر وەکو خۆیان بوون، خاوەن جەسارەت و دروست و ڕێکوپێك...

پەیوەندییە خۆشەویستییەکانی من بە هێز بوون، بەڵام ئەم پەیوەندییانە بە هیچ شێوەیەك نەبوون بە هۆکاری خۆشەویستییەکی بەهێز و مایەندە. لە ڕاستیدا من جەسارەتی خۆشەویستی ڕاستەقینەم نەبوو. لەو وڵاتەدا کە قەدەغەکاری، تابۆکان، مردن و خۆکۆشتنەکان باڵیان بە سەر هەر شتێکدا کێشا بوو، هەر شت وەکو ناچارییەك بوو. ئابوورییەکی سەربەخۆ بۆ ئەو ژنانە کە

خاوەن پەروەردەیەکی باش بوون نەیدەتوانی هیچ شتێك بگۆڕدرێت. پێکهێنانی ژیانی هاوسەری و فەدا کردنی شیانەکانی خۆیان بۆ بەخێو کردنی ماڵ و منداڵ دەبوون بە هۆکاری ئەوەی کە ئەو ژنانەیش واز لە کاریزماکانی خۆیانیان بهێنن. بوون بە خاون عەقڵ و کاریزما بە مانای تەنیا بوون و تەنیا مانەوە بوو. ئەو پیاوانە کە لە تەمەنی منداڵیدا ژیانی هاوسەرییان پێکدەهێنا و بە لای خۆیانەوە پێشکەوتوو بوون، کاتێك کە بۆ پێکهێنانی ژیانی هاوسەری خزمەکانی خۆیانیان هەڵدەبژارت دواتر روویان لەو ژنانەی دەکرد کە لە تەمەنی جوانییدا نەیانتوانی بوو لەگەڵیاندا هیچ جۆرە دیالۆگێك ساز بکەن. کاتێك کە ئەو کەسانە کە دەیانزانی چییان دەوێ، هێڵێکی رەشیان بە سەر رابردوودا دەکێشا و باوەشیان بۆ ژیانێکی نوێ دەکردەوە. ئەوانی دیکە بە پێچەوانەوە لە بە تەمەن بوونی دایکی منداڵەکانی خۆیانیان سوودیان وەردەگرت و خۆیان لەگەڵ ئەو ژیانە هاوبەشەی کە داهاتووی نەدەبوو رادەهێنا. جارێکیان لە نێو گفتوگۆیەکی ئەدەبیدا شاعیری ناودار رووی لە ژنەکان کرد و هاواری کرد" مانای چییە، چ جیاوازییەك لە نێوان من و ئێوەدا هەیە، منیش کاتێك کە جوان بووم بە زۆری دایك و باوك ناچاری پێکهێنانی ژیانی هاوسەری کرام، جوان بووم، هێشتا ژنم نەدیتبوو. دواتر بووم بە خاوەنی منداڵ، دایکی ئەو منداڵانەی خۆم کە هیچ خوێندەواری نییە و هیچ پارەیەکی نییە چۆن لە ماڵ دەربکەم. نە لە دەستدا هەیە نە لە نێو پەنجەدا، راهاتن لەگەڵ ئەم بارودۆخەدا لە مردنیش خراپترە، چ دەسەڵاتدارییەك برای من؟...".

کاتێك کە زەینەب سەردانی سۆنێدی دەکرد منیش دەست و پەنجەم لەگەڵ قەیرانەکاندا نەرم دەکرد. کاتێك کە هەر دەمخوارد و دەنووستم و هیچ شتێکی دیکەم نەدەکرد و تەنیا بیرم لە دووردەستان دەکردەوە، دەنگە بێ وەختەکان منیان ئازار دەدا. مرۆڤەکان لە نێو شەوە تاریك و زەنگەکاندا لەگەڵ یەکتردا قسەیان دەکرد، فاحیشەکانی سەر شەقامەکان بۆ خۆیان پیاسەیان دەکرد، ئەو جوانانەی کە ماسکەیان بە سەر خۆیاندا دابوو سووتیان دەکێشا، گەوادەکان رەحمیشیان بە دایك و ژنی خۆیانیش نەدەکرد. ئەو جیرانەی نهۆمی سەرەوەی ئێمە پیرە ژنێکی رۆمانی، ناوی ئەلەنی بوو. بەو چاوە گچکە پڕ لە رووناکییانەی خۆیەوە هەر وەکو سمورەیەك بوو کە مرۆڤ دەیتوانی حەزی لێ بکات. بەو زمانە تورکییەی کە قسەی دەکرد من زۆر هەستم دەکرد کە ئەویش بیانییە. من لە ئەلەنی فێری وشەکانی مەریەمی دایك و بەیان و بابانوئێل بووم. کاتێك کە بەو دەستە پڕ لە گۆشتانەی خۆی ئەو پشیلەی دەخوراند کە هەمیشە لە باوەشیدا بوو پرسیاری کرد " هیچ خۆشەویستێکت هەیە یا نا؟" دواتر پێکەنینێکی ماقووڵ

سەر و رووی دادەگرت و دەیگوت" گویّ مرۆڤ حەز لە بیستنی وشەی باش و جەستەی مرۆڤیش حەز لە شێلاندنی دەستی باش دەکات". کاتێك کە ئەم قسانەی دەکرد و وشەی تایبەت بە خۆی بەکار دەهێنا من زۆر کەیف خۆش دەبووم و بۆیە هەمیشە حەزم دەکرد کە قسە بکات. زۆربەی جاران من لە وشە تورکییە سەقەتەکانی ئەو وەکو ئستور، یاپور (وشەی ئیستیوور بە مانای دەخوازی و وشەی یاپیوور بە مانای ئەنجامدانی کارێکە لە تورکیدا، بەڵام ئەلەنی چونکە تورك نەبووە نەیتوانیوە ئەو وشانە بە باشی تەلەفوز بکات. وە) هێزم دەگرت.

من بە شێوەیەك لەگەڵ دۆست و هاوڕێکانی زەینەب را هاتبووم کە لە زانکۆدا لەگەڵ هیچ کەسێکدا پەیوەندیم دانەدەنا. بە پێ زۆربەی خوێندەکارەکان من غەریب و پڕ لە نهێنی بووم، برێکی دیکەیشیان وایان زانی بوو کە من ئەندامی ئیستیخباراتم. من زۆر حەزم لە جەو و کەش و هەوای زانکۆ دەکرد هاوکات ژوورە گچکە رازاوەکەی خۆمیشم زۆر خۆش دەویست.....

زەینەب لە ژنێڤ زوو بە زوو تەلەفۆنی بۆ دەکردم و دیگوت یا لە گراوەکانی رووسەناودا کتێب دەخوێنمەوە یا لە قەراخەکانی گولی لەماندا پیاسە دەکەم یا لە نێو پارکی ئینگلیزەکاندا یاری تەنیس دەکەم. من بە هیچ شێوەیەك نەمدەتوانی دەنگەکەی نێو ناخی خۆم هەڵبخەڵەتێنم. بە هۆی ئەوەیەوە کە زاڤین کەوتبوو نێوان من و زەینەب زۆر رەقم لێ دەهات و دواتر خۆم لە خۆم تووڕە دەکرد و دەمگوت " تۆ زۆر بە شێویەکی یەك لایەنە بیر دەکەیتەوە، بۆ چی خۆت ناکەیتە هاوبەشی خۆشحاڵی زەینەب و زاڤین؟ یا بەخێلییان لێ دەبەیت؟". من لە پەیوەندی کردن بە پیاوەکانەوە زۆر بە تەمکین بووم! ئەو جاهێلانەی کە لە دەردوورمدا دەسووڕانەوە دیار بوو کە زۆر پێشکەوتوو نین و زوویە زوو لە لایەن کچە جاهێڵە تازە پێگەیشتووەکانەوە هەڵدەخەڵەتێنران. کاتێك کە من ڕووبەڕووی کەسایەتی خۆم دەبوومەوە دەمگوت" تۆ هیچ لە گاڵتە کردن تێناگەی، زۆر جدی و وشکی."

کاتێك کە زەینەب پێ گوتم" پێویستە بێت بۆ ژنێڤ بۆ لای خۆم، ئەو کاتە من بە مەبەستی ئەوەی کە خۆشحاڵی خۆم بشارمەوە دەستم بە کۆخان دەکرد و دەستم بە پێکەنین و باس کردن لە گوڵەکانی خاتوو ئەلەنی بۆ زەینەب دەکرد. ئەو دەنگە نەرمانەی زەینەب کە پڕ بوون لە هەستی بەرپرسیاریەتی بە هیچ شێوەیەك نەیاندەتوانی رەنگ و بۆی تەنیایی لە روخساری مندا بسڕێنەوە.

بە هۆی ئەوەیەوە کە بۆ تێپەڕاندنی پشووی جەژن من لە جیاتی ئەوەی کە سەردانی ژنێڤ بکەم سەردانی دیاربەکرم کرد، زەینەب تەلەفوونی بۆ کردم و خۆی لە من تووڕە کرد" بۆچی نەهاتی بۆ لای من؟". ئێمە کاتێك کە بە تەلەفوون لەگەڵ یەکتردا قسەمان دەکرد، زۆر بە باشی لە هەست و نەستی یەکتر بە تایبەت ئەو هەستانەی کە ئاماژەمان پێ نەدەکردن تێدەگەیشتین.

کاتێك کە گەیشتم شاری سوور (مەبەست دیاربەکرە.وە) ئاگر لە عەقڵ و هەست و نەستی من بەربوو. دەنگی کەوتنە زەویی تەرمێك، ئەوجەنازە هەڵماسیانەی کە لە قەراخی رووبارەکەدا دەکێشران، خۆپیشاندانەکان و ئەو رژە کردنەی ماشینە سەربازییەکان کە لەگەڵ بۆنی خەردەڵدا تێکەڵ دەبوو. نەمتوانی راستەوخۆ برۆمە نێو شارەوە، بۆیە سەرەتا سەردانی پارکی شارم کرد کە لە بەر دەرگای شاردا بوو. لە بیر بردنەوەی هەر شت بە هیچ شێوەیەك نەدەبوو بە هۆکاری دووبارە و سەر لە نوێیەوە دەست پێ کردنەوەی هەر شت. ئاگر لە دڵ و جەستەی من بەرببوو، لە یەکەمین کەش و هەوای وەرزی بەهاردا، ئەو گوڵانەی کە وەکو خۆشەویستە تازە پێگەیشتووەکان بوون دەستیان بە پێکەنین کردبوو و سەری خۆیانیان لە بەرانبەر هێزەدینامیکییەکانی دیکە را کردبوو.

هەندێك لە کەسایەتییەکان بە هیچ شێوەیەك لە بیر ناکرێنەوە، بە تایبەتی دەنگ و ئەو چرچانەی سەروڕوویان کە دەبوو بە هێزێك بۆ هاندانی مرۆڤ. ئەم نهێنییە کە باسی لێوە نەدەکرا هەر وەکو مغناتیس منی بۆ لای خۆی رادەکێشا. عایشەی پەرستاریش یەکێك لەو کەسانە بوو کە نەمدەتوانی لە بیری بەرم. هەر چەندە پەیوەندی نێوان من و عایشە تەنیا بیر کردنەوەی یەکتر لە رۆژە تایبەتییەکاندا بوو، بەڵام عایشە بۆ من دۆستێکی تایبەت بوو. بە هۆی ئەوەیەوە زەحمەت نەکێشێت و ئامادەکاری نەکات، پێم نەگوتبوو کە دەچمە لای. کاتێك کە لە بەر دەرگای ماڵەکەیدا منی بینی، هەتاوە خۆشەکەی بەهار روخسارە ساف و سادەکەی دەلەرزاند. قژە درێژەکانی رەنگیان گۆڕا بوو و رەنگێکی نوقرەییان پێوە دیار بوو و چرچەکانی نێو دەم و چاویشی قووڵتر ببوون. وەکو هەر ژنێك کە هەمیشە سەرقاڵی ماڵ و سیستەمی نوێی ماڵەوە بێت، عایشەش بە سەرقاڵ کردنی خۆی بەجۆرە کارانەوە زۆربەی هەستەکانی خۆی سەرکوت دەکرد. لە دوای ئەحواڵ پرسین وتی" خواردن ئامادە نییە،" بۆیە بڕێك شتی سووکی دەرهێنا و ئامادەی کرد. خانەنشین کرابوو و ژیانی خۆیشی بۆ کوڕەکەی خۆی تەرخان کردبوو. لە ماڵە جوانە گچکەکەیاندا جۆرە خەمووکییەك بە دی دەکرا. کاتێك کە باسی ئەوەی دەکرد کە بە هۆی مێردەکەیەوە، لایەنە سیاسییەکان رێزی لێ دەگرن، دەستی بە پێکەنین دەکرد. ئەو

ماڵبەتانەی کە لە رابردوودا پەیوەندییان پێکەوە هەبووە، زۆر بە بێدەنگی پەیوەندییەکانی خۆیانیان پچڕاند بوو.

لە دوای کۆتایی هاتنی کۆنفەرانسێك بە رۆشنبیرێکی ناسراوی وتووە" ئەگەر بە ماشینی خۆت دەرۆی منیش لەگەڵ ئێوەدا دێم، بەڵام رۆشنبیرە ناسراوەکە وتوویەتی، کارێکی تایبەتیم هەیە" کاتێك کە عایشە ئەم داواکارییەی پێشکێشی ئەو رۆشنبیرە کردووە، بارانێکی خوڕەم و بەهێزیش باریوە. هەر وەکو ئەوەی کە دەیەویست پەردەیەك بە سەر نەهامەتییەکانی ژیانی خۆیدا بکێشێت وتی" با شووربام کەم بێت بەڵام سەرم بێ ترس بێت". لە درێژەی وتەکانیدا ئاماژەی بەوە کرد کە متمانەی بە هیچ کەسێکی دیکە نەماوە و لەو کەسانەش کە دەیانەوێ لە سەر خۆشبەخت نەبوونی ئەوانی دیکە خۆیانیان خۆشبەخت بکەن زۆر رقی دەهات.

پرسی زەینەبی کرد و منیش سەری خۆم خستە خوارەوە و باسی زاڤینم بۆ نەکرد، دوای قسەکانی من وتی" تۆیش زەینەبێکی گچکەی".

دوو رۆژ دواتر کاتێك کە زەینەب لە ناکاوەوە هاتە لام سەرم سوڕما، من زۆر کەم چاوم دەخستە نێو چاوی زەینەبەوە و زۆر بێدەنگ دەبووم. عایشەیش دەیگوت" دڵم بۆ کوڕەکەم کە لە سەربازییدایە، ئاگری پێکەوتووە بە هیچ شێوەیەك ناتوانم خەم و ئێش و ئازاری دیکە هەڵبگرم". بۆنی هەوا مرۆڤی سەرخۆش دەکرد و هەستی جۆراوجۆری بە مرۆڤ دەبەخشی. کاتێك کە چوونە گەڕەکەکەی خۆمان وا هەستم کرد کە گەڕەکەکەمان بڕێك پیر بووە، کاتێك کە ویستم بڵێم " دەمەوێ بۆ زەینەب زاڤینی بنێرمە کۆی قاف"، زەینەب ماچی کردم و وتی" ئەوەندە بەیەکترەوە گرێدایی بوون پەیوەندییەکی ساڵم و راست نییە". لە نیشێوەکەدا دابەزین و چووینە قەراخی رووبارەوە. دەنگەکانی ناخی من وەکو شریت لە دەور مەکارە دەسووڕانەوە و پێیان دەگوتم" هەر چەندە زۆر شت دەزانی و مانا و واتە دەدەیتە هەر شتێکی، بەڵام هەر لە سەر جێگای خۆتدا راوەستاوی". هەر چەندە ئەو دەنگانە بیانتوانیبایا منیان دڵڕەق بکردبایا، بەڵام هێشتاکە من هەر نەمدەتوانی بۆش بوونی سیستەم لە بیر بەرم. گەر بهاتبایا و من گەیشتبایام بەو هێڵە باریکە مومکینە ئەو کاتە تۆزێك بهاتبامایە سەر خۆم. هەر شت وەکو ئەوەی بوو کە بە جێمان هێشتبوو، نە لە ماشینە سەربازییەکان و نە لەو تیم و هێزە تایبەتییانەی کە لە سەر کۆڵان و گۆشەکاندا کەمینیان دادەنا ئەسەر و هێمایەك هەبوو. گولێ کە پێ گوتین سەوێ بە هۆی رووداوی هاتوچۆوەوە گیانی لە دەست داوە داوای لێ دەکردین کە هەڵوژە و قەیسی نەخۆین. گولێ وەکو رابردوولە سەرخۆ و بە زەوق نەبوو. کاتێك کە هەتاو بەرەو ئاوابوون دەڕۆیشت، گولێ لە نێو باخچەکەدا سەوزەی پاك دەکرد و بە هێمنی قسەی بۆ دەکردین.

وتی" براکەم سلحوی کوشتووە و منیشی بریندار کردووە، هیچ کات نەمتوانی قسەی خۆم بە سەر دڵی خۆمدا بسەپێنم، دەیانەویست لەگەڵ کەسێك کە لە تەمەنی باوکمدا بوو ژیانی هاوسەری پێك بهێنم. داخو چۆن دەتوانم لەگەڵ پیاوێکی ئەوەندە بە تەمەندا بە سەر بەرم، نازانم دەردی خۆم بۆ کێ باس بکەم؟ لووتمان دەبڕن و ئابڕوومان دەبەن، دەمانخنکێنن و جەنازەکانمان فڕێی نێو رووبار دەدەن، بە سەرماندا هەزار و یەك جۆر رووداو دەهێنن. خوایە چارەنووسی ئێمە ئەوەیە؟"

ئێمە ئەو شەوە لە لای گوڵێداماینەوە، شوێنی لێدانەکانی نیشانی ئێمەدا جەستەی هەر هەمووی شین ببووتەوە. ئەوانەی کە ئێمەیان دەناسی هاتن بۆ لامان و لە ماوەی چەند خولەیەکدا ماڵی گوڵێ پڕ بوو لە مێوان، ژنەکان وردە وردە چاویان دەکرایەوە و لە دژی سیستەم سەریان هەڵدەدا.

لەو کات و ساتانەی کە خۆکوشتنی ژنان و کچان پەرەی سەندبوو، مەلاکان هەر دەیانگوت" خۆ کوشتن گوناهە، ئەو گیانە کە خوا دایەتی بە مرۆڤ تەنیا خوا دەیتوانێ بستێنێتەوە". ئەم لێدوانانە تەنیا قسە بوون چونکە لە پراتیکدا هیچ کەس گوێ بەم شتانە نەدەدا. کاتێك کە دەنگە دەنگی باڵندەکان ژوورەکەیان پڕ کردبوو، دەنگی نەعلی گوڵێم بیست کە لە نێو هۆڵەکەدا هاتوچۆی دەکرد، لە نێو خۆیدا شین و رۆڕۆی دەکرد، منیش هەر وەکو گوڵێ دەستم بە بیر هێنانەوی دایکم، بەرفین و زەلێ کرد.....

زەینەبیش لەو شوێنەی کە نووستبوو دەجوولایەوە. پەنجەرەکەم کردەوە و بڕێك بۆنی هیوام هەڵکێشا کە لە نێو هەوای بەرەبەیانیدا دەهات.

کاتێك کە لەگەڵ زەینەبدا لە نێو باخچەکەدا پیاسەمان دەکرد، لەو بەری رووبارەکەوە بۆقە رەنگ هەنگوینییەکانی ئەو بەری رووبار و باڵندەکانمان سەیری دەکرد، ژنەکانیش قافڵە بە قافڵە بەرەو قەبرستانەوە دەڕۆیشتن. ئەو کەسانەی کە ئاگایان لە هاتنی ئێمە دەبوو دەستە دەستە سەردانی ماڵی عایشەی پەرستاریان دەکرد، قسە و باسەکان لە شەو دەستیان پێ دەکرد تاکو بەیانی هەر بەردەوام دەبوون. شەوی دوایی مانەوەمان لەوێ بۆ خواردنی نانی ئێوارە لە لایەن یەکیەتی رۆژنامەنووسانەوە دەعوەت کراین. من هەر هەمووی بیرەوەرییەکان و داتاکانی ئەو شەوم لە نێو دڵی خۆمدا نووسیبوو.

دیوارەکانی ئەو باخچەیە کە خاوەن حەوزێکی جوان بوو بە سیری هەڵواسراوەوە داپۆشرابوون، لەگەڵ ئەو کەسانەی کە یەکترمان دەناسی ئەحواڵ پرسیمان دەکرد. کاتێك کە لە سەر ئەو مێزەی کە وەکو U بوو دانیشتین تەنیا یەك ژن لە سەر مێزەکەدا بوو. کاك وەهاب

ئێمەی بە مێوانەکانی دیکە ناساند. کاتێك کە پیاوێکی ڕێکوپێك هاتە ئەو سەری مێزەکەوە و بەخێر هاتنی دوو نووسەری کرد کە یەکێکیان لە هەندەران و ئەوی دیکەیشیان لە ئەستەنبوولەوە هاتبوو، زۆر باسی ورد بینییەکان و داتا بێ نرخەکانی دەکرد.

من بە لای چاوەوە سەیری هەر هەموو نووسەر و شاعیر و ڕۆژنامەنووسەکانم کرد. بە دەمو چاوی هەرهەموویانەوە ئیفادەیەکی نارسیستی دیار بوو. کاتێك کە زەینەب پرسی" ئەرێ ئەم پیاوە پیرە ئەو شاعیرە نییە کە هاتبوو بۆ ماڵی مولکییە؟" هاتەوە بیرم کە ئەم شاعیرە جارێکیان بە شەو سەردانی ماڵی مولکییە کردبوو. هاوڕێکانی بە ئاغا بانگیان دەکرد. کاتێك کە هەر کەس لەگەڵ ئەوانی کە لە پێشەوە یا لە لا تەنیشتییەوە دانیشتبوون قسەیان دەکرد، دەیانگوت ئاگادار بن کە گوێی نهێنی لێرەدا هەیە و گاڵتەیان بە هەندێك شت دەکرد. وەهاب لەگەڵ شەمسیدا کە کارساز و خاوەن کار بوو باسی تەندەری نوێیان دەکرد. سەلیم ئەو نووسەرەی کە لە دوای ساڵەکانی ٨٠دا بۆ یەکەمین جار بوو هاتبووەوە وڵاتی خۆی وردە وردە دەستی بە دەرکردنی ناوودەنگ کردبوو. سەلیم لە بارودۆخی خۆی ڕازی بوو. سەلیم هەر وەکو دوو دەرهەم بوو لەنێو ئەو قاتەی کە بە قوماشی ئینگلیزی دووری بوو. سەرەڕای سادە بوون و ڕۆشنبیر بوونی، بە ناوچاوانییەوە بێ متمانەیی دیار بوو. بەوە دەچوو کە بۆ ئەوەی بتوانێ کاریگەری لە سەر مرۆڤەکان بکات هەر وەکو ئەمریکاییەکان هەر هەمووی کتێبەکانی ئەم بوارەی خوێندبێتەوە. کاتێك کە لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەبوو بە ناسراو و ئەو مرۆڤانەی بە ناوی خۆیانیان بانگی دەکردن، من تێگەیشتم کە ئەوەش بە دوای دۆزینەوەی خوێنەر بۆ نووسینەکانی خۆیدا دەگەڕێت. سەلیم زۆر بە باشی دەیزانی کە چۆنە سوود لەو کەسانە بگرێت کە تۆزێك دڵیان کراوەیە. کاتێك کە باسی ئێش و ئازارەکانی دەکرد، جارجاریش سەرکەوتوو بوون و باش بوونی بەرهەمەکانی خۆیشی دەخستە نێو وتەکانییەوە. ئەو کاتەی کە باسی ئەو کەسایەتییە گەورانەی دەکرد کە لەگەڵیاندا بووەتە هاوڕێ بە بێ ئەوەی دەست بۆ ئاو و سابوون ببات باسیشی لە کێشە هەنوکییەکانیش دەکرد. دواتر هێڵێکی لەسەر ئەو زانابوونەی وشەی من کە بەرهەمی هێنابوو دەکێشا و هەوڵی دەدا لە جیاتی وشەی من وشەی ئێمە بەکار بهێنێت. مەبەستی لەم کردەوەیە ئەوە بوو کە سەرنجی ئەو کەسانەی کە لە دەوروبەریدان بۆ لای خۆی رابکێشێت. ئەرسانیش ئەو نووسەرە بوو کە لە ئەستەنبوولەوە هاتبوو و کاتێك کە پیاڵەی ڤیسکییەکەی دەنا بە سەر خۆیەوە خۆی وەکو ناوەندی جیهان هژمار دەکرد. لەگەڵ سەلیمدا بە تەنیایی سەرقاڵی قسە کردن بوون. کاتێك کە سەلیم بە دەنگی بەرز بە شان و باڵی ڕۆمانە نوێیەکەی ئەرسانییەوە دەیچنی مەبەستی ئەوە بوو کە خۆی لە هاوڕێ نزیکەکانی ئەرسان نزیك

بکاتەوە و بەجۆرە لە نێو وێژەزان و ئەدەبیات زانەکاندا جێگایەکی باش بۆ خۆی بکاتەوە. بەڵام شتی سەرنجڕاکێش ئەوە بوو کە ئەرسانیش دەیەویست لە هاوڕێکانی سەلیم کە لە دەرەوەی وڵات بوون سوود وەربگرێت. لەم مامەڵەی بگرە دڵ و بدە دڵ هەر دووکیان مەمنوون و کەیفخۆش بوون. کاتێك کە ئەرسان بە پێکەنینەوە بە نووسەرە دیاربەکرییەکانی دەگوت" ئێوە نووسەری بەکرێ گیراون" من هەستم بەو راستییەی دەکرد کە لە پشت ئەم قسانەی ئەرسانەوە شاردرابوویەوە. چونکە ئەرسان لە لایەکەوە گاڵتەی دەکرد بەڵام لە لایەکی دیکەوە راستی جۆری بیر کردنەوەی خۆیانیان سەبارەت بە نووسەرە دیاربەکرییەکان دەردەبڕی. لەم کاتوساتەنەدا بوو کە نووسەر خاتوو سەلما ناڕازی بوونی خۆی دەربڕی و وتی" بە هۆی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژییایەوە دوور بوونی نێوان شار و وڵاتەکان لە ناو چووە و دنیایش لە نێو دەستی ئێمە دایە. بەکرێ گیراو بوونیش جۆرەیەکی ژیان کردنە، بەڵام شتی سەرەکی و گرنگ ئەوەیە کە مرۆڤ بتوانێت زانا بوون و مێشکی خۆی لە بەکرێ گیراو بوون رزگار بکات. چەندین هەزار مرۆڤ هەیە کە لە نێو یەك شاردا دەژین بەڵام ناتوانن لەگەڵ ئەو شارەدا رابێن". سەلیم لە پیاڵەکەی خۆیدا بڕێکی دیکە ڤیسکی خواردەوە و لە سەر عەینەکەکانی خۆیدا سەیری خاتوو سەلمای کرد و وتی" تۆ ژنێکی زۆر عەقڵمەند و هۆشیاری، بەڵام هۆکاری ئەو پەشێو بوونەی تۆ چییە؟" خاتوو سەلما چەتەڵ و چاقوویەکەی دەستی داناو هەر دوو دەستی لە ژێر چەناکەی خۆیدا دا و لێوەکانی خۆی بڕێك شۆڕ کرد و لە دوای راوەستانێکی کورتدا" راستە من تۆزێك پەشێوم بۆ پەشێو بوونی من ئەوەندە هۆکار هەیە کە.. کاتێك کە مرۆڤ شاهێدی ئەوەندە مەرگ و کوشتن و شین و رۆ رۆیە چۆن دەتوانێت پەشێو نەبێت؟ سەلیم لەم قسە بەهێزانەی سەلما بڕێك تووڕە بوو. بە وردبینییەوە سەیری دەورووبەری کرد و بە گوێ ئەرساندا وتی" پێویستە زۆر هۆشیار بین، چونکە ئێرە ئەستەنبووڵ نییە". دواتر بە زەردە خەنەیکەوە سەیری خاتوو سەلمای کرد و پیاڵەکەی بۆ تەندروستی و پێنووسەکەی سەلما بە سەرەوە ناو بڕێکی دیکە ڤیسکی خواردەوە. وا دیار بوو کە سەلما لە بەرانبەر ئەم هەڵوێستە دووڕوویانەی سەلیمدا تووشی بە با چوونی خەیاڵەکانی ببوو. لەم نێوانەدا زەینەبیش لەگەڵ وەهبی شاعیردا قسەی دەکرد. کاتێك کە وەهبی باسی لە رابردووی خۆی دەکرد خەمگین ببوو و یاری لەگەڵ پیاڵەکەی بەردەستی دەکرد و جارجاریش لە تەبلەکەی خۆیدا تووتونی دەردەهێنا و جگەرەی دەپێچا. کاتێك کە کۆخە کۆخی ئەوانی دیکە دەبوو بە هۆکاری پچڕانی قسەکانی وەهبی، ئەو کاتە وەهبی بە دەنگی بەرزتر قسەکانی خۆی بەردەوام دەکرد و دەیگوت" مێژوو پڕە لە ناکۆکی و پێکدادان، ئەگەر کۆمەڵگە لە بەرانبەر جیهانی بووندا سەری خۆی رابکات ئەو کاتە پووچ بوونی کۆمەڵگە دەست پێدەکات و کۆمەڵگە بەربەڵاو

دەبێتەوە". ئەو ژنە جوانەی دیکە کە لە سەر مێزەکەدا بوو کاتێك کە قژە جوانەکانی خۆی بەرەو دواوە هەڵدایەوە، بە حەزەرەوە دەستی بە قسە کردن کرد" تا ئەو کاتەی کە مرۆڤەکان لە نێو بارودۆخی جیاوازدا ژیان بە سەر بەرن و هەستی نەتەوەپەرەستی لە پەرەسەندندا بێت بێگومان کە شەڕ و پێکدادانیش دەبنە بەشێك لە ژیانی رۆژانەی مرۆڤەکان". لە دوای ئەم قسانە وەهبی بەو زمانەی خۆیەوە دەستی بە هێرش کردن کرد و وتی" راوەستە خانمی کۆمەڵناس، بە قوربانی ئەو چاوانەت بم کە دەیانەوێ ئێمە بخەنە نێو شەڕ و پێکدادانەوە" ئەڤینی کۆمەڵناس لە بەرانبەر ئەم وتە حەقارەت ئامێزانەی وەهبیدا رووی سوور بووەوە و دەیەویست شتێك بڵێت بەڵام لەو کاتەدا رووبەڕووی زەینەب بووەوە و وتی" هەمیشە بەجۆرە دەیانەوێ بێدەنگمان بکەن من زۆر بە باشی لە مەبەستی ئەم هێرشەی وەهبی تێدەگەم".

فەهمی کە یەکەمین کتێبی هەڵبەستی خۆی چاپ کردبوو باسی هونەر و هەڵبەستی بۆ وەهاب دەکرد و هاوکات گوێیەکیشی لەو کەسانە بوو کە قسەیان دەکرد. جار جار لە سەر جێگاکەی خۆی بۆ ئەوەی کە بە ئەوانی دیکە بسەلمێنێت کە لە قسەکانیان تێگەیشتووە دەسووڕایەوە و بە پەنجەی دەستی لە سەر دەوری پیاڵە ڤیسکییەکەی بەردەمیدا هێڵی دەکێشا. کاك بارام کە ئەو شەوە هەر هەمووی ئێمەی مێوان کردبوو وتی" با ئەمشەو برێك خۆشتر بەسەر بەرن و هەڵبەستوانی جوانمان کاك فەهمی دەیەوێ بۆمان چەند هەڵبەستێك بخوێنێت". فەهمی لە سەرەتایەوەی خۆی ئامادە کردبوو کاتێك کە ئەو کاغەزەی کە هەلبەستەکانی بە سەرییەوە نووسیبوون لە گیرفانی خۆیدا دەرهێنا، بەر لەوەی دەست بە خوێندنەوەی هەڵبەست بکات، سەیری مێزەکانی کرد تا بزانێت کێ ئامادەیە. قووڕگی خۆی خاوێن کردەوە و بە هێمنی دەستی پێکرد. ئەو دەنگە بە هەستەی فەهمی کە لەگەڵ ریتمی هەڵبەستەکاندا بەرز و نزم دەبوویەوە کاریگەرییەکی یەکجار زۆری لە سەر هەر کەس دەکرد. کاتێك کە کۆتایی بە هەڵبەست هات، دەنگی چەپڵەڕێزان بەرزبوویەوە. ئەرسان لە سەلیمی پرسی " ئەم کوڕە جاهێڵە کێیە؟" سەلیم وتی" مامۆستا بوو بەڵام لە کاری مامۆستایەتی لادار، بێچارە چەند جارە دەگەڕێت تا هەلێکی بۆ برەخسێت بڕواتە دەرەوەی وڵات.

ئەرسان وتی" بنەمای هەڵبەستەکانی زۆر بە هێز بوو، بەڵام..." دواتر رووی لە فەهمی کرد و وتی" دەستت خۆش بێت کاك فەهمی بەڕاستی هەڵبەستەکانت زۆر جوان بوون" دواتر برێك کورسییەکەی خۆی نزیکی فەهمی کردەوە و سەیری دەورووبەری کرد و بە دەنگێکی فەسیح وتی" بۆ بە زمانی زگماکی هەڵبەست نانووسی؟" فەهمی کە تیر بە دڵی کەوتبوو،

چەتاڵەکەی دەستی دانا و سەیری دەورووبەری کرد و وتی" ناتوانین بنووسین، ئایا نووسینی هەڵبەست بەو زمانەی کە چەندین ساڵە قەدەغە کراوە ئەوەندە کارێکی ئاسانە؟ لە ژێر چاودێریداین، هەوڵ دەدەین بەڵام ئەوەندە بارودۆخمان ئاڵۆزە کە...

بە راستی ژیان و گوزەرانی ئێمە تراژەدیایە". کاتێك کە فەهمی ئەم قسانەی دەکرد پێوە دیار بوو کە دەترسا. زەینەب کە داوای کووفتەی برژراوی کردبوو وتی" کاك ئەرسان، هونەر و ئەدەبیات لە کەش و هەوایەکی ئازاد و سەربەخۆدا بە پێش دەکەون". کاك وەهابیش بە مەبەستی قەبووڵ کردنی وتەکانی زەینەب سەری خۆی هەژاند. سەلیم بە هۆی ئەوەیە کە بە زمانی زگماکی هەڵبەستی نووسی بوو زۆر زەجر و ئازاری کێشا بوو و بە باشی دەیزانی کە هەر هەموو چاوەکان سەیری ئەو دەکەن.

زەینەب زیاتر لە هەر کەس ئەرسانی کرد بە موخاتەبی وتەکانی خۆی وتی" تا ئێستا لە هیچ شوێنێکی ئەم جیهانەدا نەمان بینیوە کە زمان یا جیاواز بوونی زمان و پێشکەوتنی زمان نەبووە بە هۆکاری پارچە کردنی وڵاتێك یا نەبووە بە هۆکاری هەڵگیرسانی شەڕێك. بەڵام لەو وڵاتەیدا کە هەستی ئێمە و ئەوان بە پێش بکەوێت بزانە کە زەنگی مەترسی زۆر زووتر لە هەر شتێك لێ دەدات. لە لایەکی دیکەیشەوە ئەو دەوڵەتانەی کە شەڕیان کردووە بە پێشەی خۆیان تا ئێستا نەیانتوانیوە زمان، هونەر یا خۆ هەڵبەست بە پێشەوە بەرن." دواتر کاك جومعە کە پارێزەر بوو وتی" هەر کەس دەزانێت کە ئەو هەموو شۆڕش و سەرهەڵدانانە بۆ خۆشی روویان نداوە". حلمی کە زۆر بە بێدەنگی لە دوای هەر کەسدا هاتبوو و لە سەر مێزەکەدا دانیشتبوو زۆر بە وردبینییەوە گوێبیستی هەر هەمووی قسەکانی دەکرد و لە ناکاوەوە وتی منیش وێنەگرم. کاتێك کە مێوانەکان ئەم دەنگەیان بیست برێکیان دەستیان بە پێکەنین کرد. کاتێك کە وتی" ئێمەش دەمانەوێ ناوچەکانی ئێمەش ببن بە باخ و گوڵستان، ئەو شتەی کە زۆر منی ئازار دەدا هەڵ هاتنی خاوەن کار و پیشەسازەکانی ئێمەیە، لە جیاتی ئەوەی کە ئەوان لە نێو ناوچەکانی خۆماندا دەست بە کاری سەرمایەگوزاری بکەن، بەرەو ناوچەکانی رۆژئاوا هەڵدێن و لەوێ سەرمایەگوزاری دەکەن، ئەگەر بێت و ئەو بێکارییەی کە لە نێو ناوچەکانی ئێمەدا هەیە چارەسەر بکرێت ئەو کاتە زۆربەی کێشەکان چارەسەر دەکرێن" لەم کات و ساتانەدا هەر هەمووی وتەکانی حلمی لە هەوادا مابوون. کاتێك کە وەهابیش وتی" پارە حەزی لەو شوێنانەیە کە ئارام بن و پارەی زۆریان تێدا بێت" زەینەب وتی" لە بەرانبەر داهاتوو و بارودۆخی ئاسایشی هاووڵاتییاندا تەنیا دەوڵەت بەرپرسیارە". ئەم وتانەی زەینەب کە بە مانای پەسەند نەکردنی وتەکانی حلمی بوون، بوون بە هۆکاری توورە

بوونی حلمی، ناویراو دەستێکی بە سمبێڵەکانی خۆیدا کێشا و بە دەنگێکی بەرز وتی" براکانمان لە رۆژهەلات یا کوردەکان زۆر تەنبەڵن، کی چی دەڵێت با بلێت کوردەکان بە گشتی تەنبەڵن". سەرەتا لە دوای ئەم قسانە بێدەنگییەك لە سەر مێزەکە زاڵ بوو، رەنگ و رووی بارام زۆر سوور بووەوە و فەهمیش وەکو دالێك بوو کە لە لووتی خۆیدا بریندار بوویێت و وتی" بە قسەی شیپ شاق زەختمان بەرز مەکەوە هاورێ". تەنبەڵ بوون شتێکی ژنەتیکییە، شتی هەرە سەرەکی و بنەڕەتی بارودۆخی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و کولتووری وڵاتە. وتەکانی تۆ وەکو سەمەری سەر ئاوە. کاتێك کە وتەکانی فەهمی کۆتاییان پێهات، مچ مچ دەستی پێکرد. باران ئەو کەسانەی کە لە لایدا دانیشتبوون ئاگاداری کردنەوە" سەری خۆتان هیچ بە وتەکانی ئەم مێوانە نەخوازراوەوە مەئێشێنن". سەلیم و ئەرسانیش پێکەوە قسەیان دەکرد. خاتوو سەلما بە مەبەستی ئەوەی ئەو قسە و رەفتارە دوور لە ئەخلاقانەی نێوان مێوانەکاندا نەبیسێت بە بیانووی تواليێتەوە دەر چوو بوو و دواتر هاتەوە. کاتێك کە ئەم شاعیرە پیرە پیاڵەکەی خۆی بەرز کردەوە و وتی" هەی میللەت با شتەکان بە ئاسانی وەربگرین" لە ناکاوەوە دەنگێك هات" کوردایەتی موردایەتی بەلاوە بنێن لەم شەوە خۆشەدا تەنیا هەڵبەست و هونەر دەتوانێت پیاو بکات بە پیاو". یەك دوو کەسێکیش وتیان " ئاغا بەڕاستی سەرخۆش بووە". ئەرسان پیاڵەکەی دەستی بەرز کردەوە و وتی" با بۆ راستگەرایی و رۆشنبیری بخۆینەوە". سەلیم بە ئەنقەست دەستی بە کۆخین کرد و مەبەستی ئەوە بوو کە هەر کەس سەیری ئەو بکات" بەڵێ راستگەر بوون و راست بینین شتێکی زۆر باشە، ئەگەر بە چاوی هەڵبەست و شوور و زەوقەوە سەیری ژیان دەکەین ئەو کاتە ژیان لە بەرانبەر زانا بوونی رێکخراوەکاندا زیاتر بێ کۆتاییە...". لە بەرانبەر ئەم وتە خڕ و مانادارانەدا مێوانەکان برێك بێدەنگ مان. وتارە یەك لایەنەکانی سەلیم برێك خاتوو سەلمایان ئازار دابوو. کاتێك کە سەلما بە زەینەبی وت" سەلیم ئەدەبیاتی کردە دەزگای ئیشپورتا" زۆر بە باشیشی گوێیستی وتەکانی ئەرسان و سەلیمی دەکرد.

ئەرسان" هەر چەندە لە نێو ئەدەبیاتی راستەقینەدا فێڵبازی و حیلە نییە بەڵام کێ چی دەڵێت با بلێت پەیوەندییەکانیش زۆر گرنگن". سەلیم زۆر بە شێوەیەکی وستایانە هەڵسوکەوتی دەکرد. بە لای ئەرسانەوە لە قۆناغی دووەمدا بوو و باسی لە ئێش و ئازارەکانی خۆی و قەدەغە بوونی نووسین بە زمانی زگماکی دەکرد. ئەرسان کە بە هیچ شێوەیەك بە چاوی رکەبەرێك سەیری سەلیمی نەدەکرد باسی هەر هەمووی رێگا و فێت و فێڵەکانی دەکرد و دەستی بە ملی سەلیم دەدا و دیگوت" تۆیش کەم فێڵباز نیت ها، دەبینم لە نێو هەر شارێکدا

ڕۆشنبیر و نووسەرێکی دۆستت هەیە و لەگەڵیدا پەیوەندی زۆر باشت هەیە، ڕاستە ئەم جۆرە پەیوەندییانە زۆر باشن چونکە ئەوانە بۆ خۆیان جۆرە ڕێکلامێکی بەلاشن". کاتێك کە سەلیم و ئەرسان پێکەوە پیاڵەیان بەرز دەکردەوە لێوی سەرەوەی سەلیم دەلەرزیا، لە هەمانکاتدا هەستی بە پەشێو بوونی خاتوو سەلما کرد و بە دەنگێکی وا کە گوایا ئەو پەشێو بوونەی خاتوو سەلما بەلایەوە زۆر گرینگە وتی" دەبینم خۆت لە نێو خۆتدا حەپس کردووە". پێکەنینێکی ڕەخنەئامێز خۆی لە سەر لێوەکانی خاتوو سەلمادا دیار کرد و وتی" ناوەندەکانی بڕیاردان دەرفەتی قسە کردنمان پێ نادەن، ئێوە باسی ڕاستیتان کرد و بەڕاستی کە ئێمە بۆ خۆمان لە ناوەڕاستی هەر هەموو ڕاستییەکاندایین، هەر چەندە ئێش و ئازاریش بکێشین و دڵمانیش بتوزێتەوە بەڵام لە نووسیندا هەر بەردەوام دەبین. هەر ئێش و ئازارەکانن کە دەبنە هۆکاری ئەوەی کە مرۆڤ بنووسێت. ئێمە بە مەبەستی تێگەیشتن لە ڕاستییەکانی ڕابردوو و داهاتووی خۆمان دەستمان بە نووسین کردووە". ئەرسان کە جارێکی دیکە بڕێکی دیکە لە ڤیسکییەکەی خواردەوە لە دوای دانانی پیاڵەکەی وتی" باشە زۆر باشە، من ئێستا هەستم بە پسپۆڕ بوونی ئێوە کرد". کاتێك کە سەلیم و ئەرسان باسی ئەدەبیاتی جیهانیان دەکرد، ئەرسان زوو بە زوو ڕیجا و تەمەنای لە سەلیم دەکرد لەم کات و ساتانەدا من و زەینەبیش نەماندە توانی خۆمان بگرین و دەستمان بە پێکەنین کرد. لە ناکاوەوە سەیرم کرد کە سەلیم لە ژێر چاوەوە سەیری سەلما دەکات. سەیرکردنەکەی ئەرسان ئەم مانایەی پێوە دیار بوو" چ کارێکی تۆ لە سەر ئەم مێزانەدا هەیە خاتوون؟". دواتر دەنگی عوود و تەمبوور بەرز بووەوە، ئەو پیاوە بە تەمەنە قژ نوقرەییە زۆر بە ڕێز و ئیحترامەوە سڵاوێکی لەو کەسانەی کرد کە لە سەر مێزەکەدا دانیشت بوون. باران وتی" هەر هەمووی ژیانی خۆی بۆ کۆکردنەوەی موسکییەکان تەرخان کردووە و ماڵی هەر وەکو کلکسیۆنی بەرد و پلاکە بەردییەکانە" هاوکات لەگەڵ ئەم وتانەی باراندا سەلما وتی" فەرموو لە سەر مێزەکەی ئێمەدا دابنیشە کاك سۆحا". سەلما وتی" کاك سۆحا لەو کەسانەیە کە زۆر کەم قسە دەکات بەڵام چی لە دەستیدا هەبێت زوو بەزوو دەیەوێ لەگەڵ ئەوانی دیکەدا دابەشی بکات".

باران پیاڵەکەی دەستی بەرز کردەوە و وتی" با بۆ ئەو دونیا جوانە و جیاوازەی کاك سۆحا بخۆینەوە". کاك سۆحایش بە شێوەیەکی شەرماوی سڵاوێکی لەو کەسانەی کرد کە دانیشتبوون و زەردە خەنەیەکیشی کرد و سەرەتا بەستەیەك لە بەستەکانی خۆی نەواند و دواتر چەند بەستەیەکیشی لە جەلال گووزەل سەس و ئیتری بۆ مێوانەکان نەواد. کاتێك کە گۆرانییەکی

شادی بۆ هەڵپەڕکێ پێشکێش کرد هیچ کەس لە سەر جێگای خۆیدا هەڵنەستا. کاتێك کە تێگەیشتم کە پۆلیسەکان دەستیان بە سووڕانەوە لە نێو شاردا کردووە ئەو کاتە مێوانەکان وتیان" وردە وردە کاتی ڕۆیشتن هاتووە پێویستە بڕۆین".

کاتێك کە باران دەستی بە دابەش کردنی ئەو کتێبە گچکانەی کرد کە سەبارەت بە ئێش و ئازارەکانی خەڵك نووسی بوون، سوپاس و پێزانینی خۆی پێشکێشی هەر کەس کرد و بە تایبەتیش سەیری ئەرسانی کرد و وتی" زۆر پێویستیمان بە هاوکاری ڕۆشنبیرەکان هەیە". کاتێك کە زەینەب و سەلما پێکەوە قسەیان دەکرد خاتوو ئەڤینیش هات. بە هۆی ئەوەیەوە کە بە باشی لە قسەکانی نێوان زەینەب و سەلما تێ نەگەیشتبوو نەیدەتوانی شتێك بڵێت بۆیە بە سەر لێ شێواوی سەیری کاتژمێرەکەی دەستی دەکرد. لەم کاتوساتانەدا وەهاب هاتو وتی" ژنە بەڕێزەکان شەرەفی بردنەوەی ماڵەوەی خۆتان بدەین بە من با بتانبەمەوە". سەلما وتی" نا سوپاس ئێمە بە پاس دەڕۆینەوە".

لە تەمەنی منداڵیمدا بێجگە لە دیاربەکر، مووسڵ، حەلەب و بەغدا هیچ شوێنێکی دیکەم نەدیتبوو. ژنێڤ ناوەندی دیپلۆماسی نێودەوڵەتی کە لە بناری چیاکانی ئالپ و ژووڕادا دامەزرا بوو مانگا گوانە گەورەکانیشی بە چاوێك سەیری مرۆڤیان دەکرد کە مرۆڤ هەستی دەکرد تەحقیقی لەگەڵدا دەکەن. ماڵە ڕێکو پێکەکانی ژنێڤ و باخچەی گوڵەکان و دیمەنەکانی گوڵە گەورەکە هەر وەکو جەنەتێك بە تامی شوکۆلاتە بوو. شەپۆلەکانی گوڵەکە هەر وەکو خەنجەرێکی پەمبەیی دەیاندا بە کەنارەکانەوە، ڕونە دێ مورسە کە لە ناوەڕاستیدا مترۆ دەڕۆیشت ناوەندی هێزی میکانیزمی بوو. لە نێوجادەکانی ژنێڤ کە لە خۆشەویستی، شوور و شەوق و پارە پڕ بوون، بۆنی جیاوازی وڵاتەکانی دیکە تێکەڵی یەکتر دەبوو. یەکێك لەو شوێنانە کە من تییادا هەستم بە بێگانە بوونی خۆم دەکرد ژنێڤ بوو. کارەبا قاچاخەکان، سرەکانی پارە گواستنەوە، کاتێك کە بەجۆرەیەك کە دەیانەویست لە هەستی تاوانبار بوون خۆیان ڕزگار بکەن سەیریان دەکرد، ئەو ماڵە دوورانەی کە لە مردن دوور بوون بە یەکپارچە دەبوون بە پارچەیەك لە ڕووناکی.

کاتێك کە زاڤین دەستی بۆ من بەرز کردەوە، منیش جانتا گەورەکەی دەستی خۆمم بەرەو زاڤین ڕادەکێشا و وتی" هوپ هوپ" و بەو ددانە سپییانەی خۆیەوە دەستی بە پێکەنین کرد، بۆنی ڤانیلیای لێ دەهات. کاتێك کە من دەستم بە سەیر کردنی ئەو جادە جوانانەی کە ئەوەندە جوان بوون و مرۆڤ لە جوان بوونیان تۆزێك ئازاری دەدیت، دەکرد وتم" هەر شوێنێك

چەند بانکی تێدایە". دوای ئەوەی لە دەور گولەکەدا پیاسەیەکمان کرد، کەوتینە نێو تونێلێك کە بە دارستانی سروشتی دروست کرابوو. لە سەرەتای تونێلەکەدا کاتێك کە پێمان ناوە نێو ئەو کۆلانە سەنگ فەرشەیەوە وا هەستم دەکرد ئەو مالآنەی وەك سڕ و نهێنییەك سەیری ئێمەیان دەکرد، من بیرم لەو کەسانە کردەوە کە لە نێو ئەم مالآنەدا دەژین و بیریشم لە ولآتی خۆم کردەوە. لە دوای بە یەك گەیشتنی دەنگی زەینەب و زاڤین سەری من وای لێهات کە هەستم دەکرد وردە وردە خالّی دەبێت، مرۆڤەکان، سروشت و شت و مەکەکان و بیرکردنەوە...

کاتێك کە زاڤین دەرگای باخچەکەی کردەوە وتی" مالّەکەمان زۆر کۆنە" منیش بە هم هم کردن سەری خۆمم دەسووڕاندەوە لەم کاتە ساتانەدا زەینەب هەستی بەوە کرد کە مێشکی من لە شوێنێکی دیکەدایە.

لە نێو مالّە سەقفە بەرزەکەیاندا تابلۆ و لەوحەی زۆر بە نرخ هەبوو. هاوکات لەگەلّ ئاشنا بوونی سەیر کردنی کتێبەکان، لیوانێك ئاوم بە دەستمەوە گرت و لە سەر قەنافەکەدا دانیشتم. زەینەب ئاماژەیەکی بە باخچەکە کرد و وتی" مەریشمان هەیە".

لە نێو شەپۆلی ئەو تاریکییەیدا کە دەکەوتە نێو ئەو ژوورەی کە هەر هەمووی دیوارەکانی جام بوون خەوێکی گرانیش منی داگرت. لە نێو خەودا رکەبەری کاکم بە ئەسپەکەی لەگەلّ شەمەندەفەر، دایك و باوکم کاتێك کە لە قەراخی گولەکەدا خواردنیان بە ئاژەلّەکان دەدا دەمبینین، ئەو کاتەی کە ئاهەنگی ریتمی رۆحانی کردنەوەی کلێسەکەم بیست لە خەو هەلّستام. زاڤین دەستی بە هەلّگیرساندنی ئەو موومانەی کرد کە لە سەر سفرەکەدا دای نابوون. من زوو بە زوو سەیری ئەو تابلۆیانەم دەکرد کە بە دیوارەکەوە هەلّواسرابوون و خۆم و مێشکی خۆمم گەرم دەکردەوە، شایەد ئەم هەستەی من هەلّوێستێکی مێشکم بووبێت بۆ ئەوەی کە زوو بە زوو بیر و بۆچوونەکانی خۆم ئاشکرا نەکەم. کاتێك کە دەستم بە لێکۆلّینەوە لە سەر ئەو ژنە کرد کە لە نێو بالکۆنی ئەو مالّەی کە لە وێنە رەش و سپییەکەدا دیار بوو و سەیری گولّی دەکرد ، زاڤین وتی" دایکە". منیش وتم " بەلآم هەر وەکو گولّدمانە". زاڤین وتی " ئەو ئانارشیستەی کە بۆ شۆڕش خۆی فرۆشت؟ لەم کاتە ساتانەدا دەنگی زەینەب هات وتی" با خواردنەکان سارد نەبنەوە". زاڤینی لێهاتوو دۆلّمەی بە زەیت و بفتەکی بە بەهاراتی سوئیسی ئامادە کردبوو. کاتێك کە زەینەب وتی" شۆڕش و بفتەك بە بێ خوێن رژاندن نابن" رووی من سوور بووەوە، من زۆر پێم ناخۆش بوو کە زەینەب زۆر بە ئاسانی دەیتوانی هەر هەمووی هەستەکانی من بخوێنێتەوە یا بە کردەوەیەکی خۆی ببێتە هۆکاری گۆڕینی رەنگ و رووی من. کاتێك کە بەستە نەرمەکانی بەتووڤێن بە ئارامی دەکەوتنە نێو مێشکی منەوە، زەینەب باسی

(پەتەر) هاوڕێیەکی  شاعیری زاڤینی بۆ من دەکرد کە لە ئەمریکادا دەژیا. چیرۆکی ژیانی پەتەر کە لە دیاربەکرەوە تا ئەمریکا درێژ ببوو کردیانبوو بە رۆمان و سەرەتای رۆمانەکەیش بەمجۆرە دەست پێدەکات" دیاربەکر: ئەو شوێنەیە کە تورکی، کوردی، ئەرمەنی و عەرەبی تێکەڵی یەکتر بوونە". کاتێك کە زەینەب باسی رۆمانە نوێیەکەی خۆی بە ناوی " دیجلە" ی دەکرد شوور و شەوقی زاڤین کەمی مابوو گوێ من بدرێنێت.

ئەورووپا کە بە سەدان ساڵە کۆتایی بە شەڕ هێناوە، پیوانی ژیان یا ستانداردی جیهانی ژیانی زۆر بەرزە و بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر گرێدراوی یاساکانە. لە زانین و تێگەیشتن لە ماف و ئازادییە تایبەتییەکاندا وێنەی ئەورووپا نییە، بەڵام هەر وەکو سوپایەکی پەککەوتوو و بەربڵاو کراوەیە، مێوە و سەوزەواتی زۆرە بەڵام بێ تام و هیچ بۆنێکیان نییە. ژمارەیەکی زۆر مرۆڤ بەتەنیا لەگەڵ سەگەکانی خۆیاندا پیاسەیان دەکرد، و لەگەڵ خۆیاندا قسەیان دەکرد.... لێرەش خەڵك زۆر حەزی لە زەینەب دەکرد. هاوڕێکانی زەینەب بە مەبەستی دەعوەت کردنی زەینەب بۆ نان خواردن دەستیان بە کێبڕکێ کردبوو. زەینەبیش بە پێکەنینەوە دەیگوت" پەلە مەکەن زۆر دێن و دەچین هێشتا زووە".

بە مەبەستی بەشداری کردن لە کۆنفەرانسی ئاشتی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست سەردانی زۆریخ و مەریخمان کرد، من لە ئاشنا بوون و ئەحواڵ پرسی کردن لەگەڵ مرۆڤەکانی دیکەدا وەڕەز ببووم. کاتێك کە من بارودۆخی پەنابەریم لە ئەورووپادا بە چاوی خۆم بینی ئەو کاتە تێگەیشتم کە مانای پەنابەر بوون چییە. ئەو کەسانەی کە بە ناچاری ماڵ و وڵاتی خۆیانیان بە جێهێشت بوو و روویان لە ئەورووپا کردبوو بە هیچ شێوەیەك نەیاندەتوانی لەگەڵ کۆمەڵگە و داب و نەریتەکانی ئەورووپادا رابێن. لە نێو چاوەکانیان، رەق و کین و ئێش و ئازار و تووڕە بوونێك دیار بوو کە نەیاندەتوانی دەری بېرن. ژمارەی ئەو کەسانەی کە لەگەڵ کولتووری کۆمەڵگەی ئەورووپادا راهاتبوون هەر بە ئەوەندەی پەنجەکانی دەست بوو. کۆمەڵناسی بەناوودەنگی ئەڵمانی بەربارا کە لە سەر ناوی رێکخراوی لێبووردنی نێونەتەوەیی بەشداری کۆنفرانسەکەی کردبوو، بە شێوەیەکی زۆر توند رەخنەی ناراستەی ئەو وڵاتانەی ئەورووپایی دەکرد کە بۆ پاراستنی بەرەژوەندییەکانی خۆیان بازرگانی بە چەك و تەقەمەنییەکان دەکەن. زەینەبیش باسی لە شەڕی تورکیا، هەڵەبجە و لوبنان کرد و وتی" پێویستە پێکەوە تێگەیشتنێکی هاوبەش بهێنینە دی، ئەو کاتەی کە مرۆڤەکان دەمرن و ئێمەیش بە تەنیا دادەنیشین و سەیریان دەکەین ئایا ئەمە ویژدانی مرۆڤایەتییە؟". لە دوای کۆنفرانسەکەدا رۆیشتین بۆ نان خواردن. ئەو کەسانەی کە هەندێك کولتووری ژیانیان هەبوو هەوڵیان دەدا تام و شتی

جیاواز بەو کەسانە بدەن کە لە هەندەرانەوە هاتبوون. بەڵام بە هۆی ئەرزان بوونیانەوە زۆربەی جاران ئێمەیان دەبردە رستۆرانتە هەرێمییەکان. من هیچ حەزم لە کەلەم و سووسیسی بە رەچەتەی سوئیسییەکان نەدەکرد. کۆمەڵناس بەربارا بەو ددانە سەیرو سەمەرانەی خۆیەوە دەستی بە پێکەنین دەکرد و بەبێ ئەوەی رابوەستێت پرسیاری دەپرسی. وتی" داوای لێبووردن دەکەم لە ساڵەکانی ١٩٦٠دا تورکە گوندییە بێ پەروەردەکان روویان لە ئەوروپا بە تایبەتی ئەڵمانیا دەکرد و دواتر لە سەرەتای ساڵەکانی ١٩٨٠یشدا کوردەکان بەمجۆرە دەستیان بە هاتن بۆ ئەوروپا کرد." لەگەڵ بەربارادا باسی گوتە، هەنریك بووێڵ و توماسمانمان کرد. کاتێك کە من وتم توماسمان لە سەردەمی شەڕدا ژیاوە و ئەو رووداوە سەرەکییانەی ژیانی خۆی کردووە بە رۆمان بۆیە من زۆر حەزم لەم جۆرە رۆمانانە نییە و هیچ حەزم لە رۆمانی چیا گەورەکەی ناوبراویش نییە، ئەری یا ئێمە هەمیشە دوایین کەس بووین کە ئێش و ئازارمان دەکێشا و دوایین قسەشیان دەکرد. من سەیری بەربارام کرد کە بە ساڵانە لە ئەوروپادا دەژیت و دەمەویست پێیبڵێم وەرە ئەم شتانە لە من بپرسە، کاتێك کە من ویستم پێی بڵێم بەربارا، بەو دەنگە زەبەلاحەی خۆیەوە وتی" پێویستە کچەکانی ئێمە و ژنەکانی ئێمە وەکو تۆ بن و ژمارەتان زۆر بێت".

زاڤین بە هەر شێوەیەك هەوڵی دەدا کە کاریگەری بکاتە سەر من. بەیانی کاتێك کە لە نێو نوێنگەی خۆمدا دەسووڕامەوە ئەو دەنگانەی کە دەهاتن ئازاری گوێ منیان دەدا. لە بەرز و نزم بوونەوەی دەنگی مۆسیقا و بۆنی قەهوە من شرۆڤەی دوو کاراکتەرم دەکرد کە پێکەوە پەیوەندی فلورتیان هەبێت. کاتێك کە زاڤین دەچوو بۆ کار من دەمەوەیست ببمە تاقانەی زەینەب، بۆیە وەك منداڵە گچکەکان خۆم لووس دەکرد و لە زەینەبم دەپرسی " منت خۆش دەوێ یا زاڤین؟". بەڵام زەینەب بایەخی بەم پرسیارەی من نەدەدا و دەیگوت" دەزانی ژنێڤ شارێکی گچکەیە بەڵام بووەتە مەئواو و مەسکەنی زۆربەی رۆشنیر و رووناکبیرەکانی جیهان". کاتێك کە ئاماژەی بە ناوەکانی رووسۆ، بورگەس، نیچە، ناباکوڤ، ستێفەن زڤەیگ دەکرد، من هیچ وەڵامێکم نەدەدایەوە و ئەو گوڵانەی کە لە سەر جامی عەینەکەکەیدا دیار بوون ئەوانم دەژمارتن. بڕیار بوو بڕۆن بۆ ئاتولیەی وێنەکێشێك. لە نێوان هەورە پارچە کراو بەرزەکاندا هەتاوێکی بێ هێز خۆی نیشاندەدا. کاتێك کە لە نێو ئەو جادانەیدا کە بۆنی عەتریان لێوە دەهات دەڕۆیشتین من تەنیا سەیری ئەو دەمانەم دەکرد کە دەکرانەوە و دادەخران. ئەو کاتەی کە هەر کەس پێغ پێغی دەکرد وشەی سۆرانی، تورکی و عەرەبی لە نێو مێشکی مندا پێکەوە شەڕیان دەکرد....

روونی وێنەکێش بە شێوەیەك دەستی من دەگرت کە وام دەزانی دەیەوێ دەستم بشکێنێت و رووی لە زەینەب کرد. لە دەنگە بەهێز و چاو و سەیرکردنە سەرنجڕاکێشەکانی هێز و متمانە بەخۆ بوونی دیار بوو. من زۆر زوو هەستم بەوە کرد کە روونی پیاوێکی خاوەن هەست و خاوەن دڵێکی دروست و خاوێنە. ئەمە لە کاتێکدایە کە زۆربەی هونەرمەند و رەسامەکان لە خۆ بوون و پەسەند کردنی کەسایەتی خۆیان زۆر دوور بوون.

سەردانی پێشەنگای وێنەکانم لە نێو زانکۆدا کرد. بێدەنگ بوونی ئێمە لە بەرانبەر ئەو وێنانە کە رابردوویان بەرەو داهاتوو بۆ ئێمە دەگێڕایەوە بە مانای کاریگەری کردنی وێنەکان لە سەر ئێمە بوو.

لە نێو کانتینەرەکاندا مامۆستاکان و خوێندکارەکان پێکەوە بوون. پەیوەندییەکانی گەورە و گچکە یا ئامر و مامورر هیچ دیار نەبوون. زۆربەی ئەو کەسانە کە سەردانی ئەم پێشەنگایەیان دەکرد پەنابەر بوون. کاتێك کە زەینەب دەستی بە قسە کردن کرد و روونی لە منی پرسی کە چی دەخۆمەوە ئەو کاتە چاوی من کەوتە نێو چاوی روونییەوە و من چاوی خۆمم هەڵسووڕاند و داوای کاپوچینوم کرد. لە ناکاوەوە من لە خۆم پرسیم چیت بە سەر هاتووە بوویی وەکو ئەو کچانەی کە لە ماڵی تەجاوزدا دەژین و هەست بە غروور ناکەن. لەم کاتە ساتانەدا روونی پرسیاری لێ کردم کە ئەم پێشەنگایە چۆنە؟ من لە سەر جێگاکەی خۆمدا جووڵامەوە و لە نێو چاوە سوورمەلییەکانی روونیدا شتێکم بینی کە تا ئەو کاتە نەمبینیبوو. منیش سەرم لێشوا و نەمزانی چی پێ بڵێم، بۆیە تۆزێك خۆم کۆکردەوە و بە شێوەیەکی جدی و رەسمی راوەستام و وتم" ئەمە شێوازی هەرە باشی نیشاندانی رابردوو بوو، بێگومان زانستی هونەرمەند و رەسامەکان زانستێکی بێ بنەما نییە زانستێکی کۆمەڵایەتی و مێژوویییە و لە مەیش گرینگتر ئەوەیە کە ئەم جۆرە زانستە زۆر بە ئاسانی دەتوانێت بڕواتە نێو جەوهەری هەر شتێکەوە". کاتێك کە من ئەم قسانەم دەکرد خۆشحاڵییەك بە چاوەکانی روونییەوە دیار بوو. لە یەکێك لە رێکخراوەکانی پەنابەراندا بانگی زەینەبیان دەکرد. زەینەب تا درەنگانی شەو تەکست و مەتنی گوتارەکانی ئامادە دەکرد و جار جاریش بیرو رای من و زاڤینی دەپرسی. هێشتا دیار نەبوو کە من لە نێو ئەو زانکۆیەدا دەمێنم یا نا، بۆ راوەستان لە بەرانبەر مامۆستاکاندا پێویستیم بە هێزێکی یەکجار زۆر هەبوو. چالاك بوون و خاوەن کارەکتەر بوون ئەو کاتە هیچ مانایەکی نەبوو. لەم کاتانەدا دەبوایا من چاوەڕێم بکردایا چونکە ماستەرنامەکەم رادەست کردبوو. لەو رۆژەی کە هاتبوومە ژنێڤ هیچ نەمتوانی بوو چەند کاتژمێرێك دابنیشم و بخوێنمەوە. نەخوێندنەوە بۆ من بە مانای نەزان و دواکەوتوو بوون بوو. کاتێك

که بۆشایەتی زەمینەی بۆ بیرورا و فکرە پووچەکانی ئامادە دەکرد و داتا و وردەکارییەکانیش مێشکی منیان سڕ دەکرد من دەکەوتمە نێو ترس و دڵەڕاوکێیەوە. هاوڕێیەتی من و روونی سەرەتا بە ناکۆکی دەستی پێکرد. متمانە بە خۆبوونی روونی ببوو بە هۆکاری ئەوەی کە روونی ببێتە خاوەن کارەکتەرێکی تایبەتی. کاتێك کە من پرسیم " ئایا تۆ نارسیستی؟" بە دەنگێکی باریك وتی" ئایا لەم جیهانەدا کەسێك هەیە کە نارسیست نەبێت؟ و دواتر وتی باش بزانە کە ئەگەر ژێری هەر دڵێکی دروست و کراوە بکۆڵیتەوە ئەو کاتە لە کۆکیدا نارسیست دەردەکەوێت. روونی منی دەعوەتی ئەو پێشەنگایە کرد کە بڕیار بوو لە داهاتوودا لە بەسەل بێکاتەوە. هەر چەند کە دۆستایەتی من و روونی بە هێز دەبوو ئەو کاتە من هەستم بەوە دەکرد کە ناحەقی زۆرم لە زاڤین کردووە. من جار جار وەڵامی پێکەنینەکانی زاڤینم دەدایەوە و قەهوەی بەکەفم بۆی ئامادە دەکرد. وەکو ئەوەی کە بتەوێ شتێك لە کەسێك بپرسی هەوڵم دەدا کە فێری چەندین وشەی ئەرمەنی ببم. لەم کات و ساتانەیشدا زاڤین لەگەڵ خۆیدا گاڵتەی دەکرد و قژە فرفرییەکانی خۆی دەکێشا. کاتێك کە دەیگوت" تۆتۆم کۆللۆك، ئەسۆ کۆللۆك" زەینەب وازی لەو رۆژنامەیە دەهێنا کە دەیخوێندەوە و سەیری منی دەکرد و دەکەنیا.

کاتێك کە دەڕۆیشتین بۆ بەسەل روونی تۆزێك پەشێو بوو. وێنەکانی لە نێو ماشینەکەیدا بەجێ دەکرد. بۆ ماوەیەك هیچ قسەمان نەکرد. من بیرم لەو دەستە وشکانەی دەکردەوە کە بە سوکانەکەوە بوون، کەش و هەوا باش بوو. کاتێك کە پرسی" ئەرێ بۆ چی ئێمە هیچ قسە ناکەین" منیش سەری خۆم سووڕاندەوە وتم" نازانم" کاتێك کە وتی زۆر باشە" تۆ هیچ هاوڕێیەکەت هەیە؟" منیش بە سەهوەوە وتم" لە یەکتر جیا بووینەوە" کاتێك کە ئەمەی بیست دەستی بە پێکەنین کرد و وتی" وریابە سانالێ نەبێت" و دواتر داوای لێبووردنی کرد و تۆزێك جدی بوو. وا بزانم ناشارەزا بوونی من روونی خۆشحاڵ دەکرد. کاتێك کە من وتم" بلووسی هونەرمەند و رەسام، وێنە و مۆسیقای تێکەڵ کردووە و وێنە کێشان بۆ ئەوە وەکو جۆرەیەك لە عیبادەت کردن و گەیشتن بە خوایە" راوەستاو وتی" بلووسی زۆر ناسراو نییە، چۆن دەیناسی هیچ پەیوەندییەکتان پێکەوە هەیە؟" کاتێك کە ئەمەی وت منیش بەو شێوەیە کە گوایا تەنیا تۆ نازانی وتم" چی دەبێت با ببێت مرۆڤ بە تەنیا نیگارکێشی خۆی و مێژوویەکەی خۆیەتی، بەڵام هەڵسووکەوت و ماڵە هەژارانەکەی بلووس سەرنجی منی زۆر راکێشاوە." دواتر زۆر بە خێرایی سەری خۆمم سووڕاندەوە و سەیری دۆڵە سەوزەکەم کرد. لەم کاتەدا وتی" زۆر سەری خۆت پێوە مەئێشێنە و دەستی بە پێکەنین کرد". من لە کاتی

وەڵامدانەوەی ئەم دەنگە کە لە هیچ بارودۆخێکدا متمانە بە خۆ بوونی لە دەست نەدەدا برێك تەنگاو دەبووم. کاتێك کە وتم" مرۆڤ تا ئەو کاتەی نەتوانێ بە سەر ئێش و ئازارەکانیدا زاڵ ببێت ناتوانێت ببێتە مرۆڤێکی تێگەیشتوو" تۆنێکی بە شەفەقەت کەوتە سەر دەنگی روونی و وتی" راستە هەستکردن بە ئێش و ئازارەکان بە مانای دیتنی یەکەمین قوربانی ناخی خۆمانە". منیش دەمەویست ئێش و ئازارەکانی خۆم لە روونیدا ببینم چونکە رووبەڕوو بوونەوەی من لەگەڵ مرۆڤێکی بەهێزدا هیوا و ئاواتی من بوو. بۆ ئەوەی کە هەستی حەز کردن و خۆشەویستی من نەبێتە هەستی رق و کین و بێزار بوون دەبوایا من واز لە ئازادی خۆ بوونم هێنابایا.

کاتێك کە گەیشتینە هۆڵی پێشەنگاکە بە هۆی ئەوەیەوە کە دوا کەوتووبووین برێك خۆیان لە ئێمە تووڕە کرد. روونی لە ساز کردنی پەیوەندی بە هێز و ئاست بەرزدا زۆر شارەزا و لێهاتوو بوو، منیش چاودێری هەڵسووکەوت و جموجوولەکانی روونیم دەکرد و بۆ خۆم وانەم لێ وەردەگرت. بۆ ئەوەی کە مرۆڤ بتوانێت لە رووی رۆحییەوە لە سەر پێی خۆی رابوەستێت ساز کردنی پەیوەندی باش و بە هێز رۆڵێکی یەکجار سەرەکی هەبوو. ئەرێ یا... جەنایەت و مرۆڤ کوشتن تەنیا لە رووی جەستەییەوە نییە لە رووی رۆحیشەوە قۆناخێکە کە دێتە دی و تێپەڕ دەبێت. چەندە گرنگ بوون بۆ ئەوانەی کە ناسنامەی خۆیانیان لە دەست داوە...

روونی لە لا یەکەوە شوێنی تابەلاکانی دەستنیشان دەکرد و لە لایەکی دیکەیشەوە زۆر بە لێهاتوویی گاڵتەی دەکرد. ئەو پیرە ژنەی کە وەکو باڵندە وردەکانی مانگی تەباخ بوو وتی" من دەمەوێ لە سەر شتێك ئیعتراف بکەم، تێنەگەیشتم کە هۆکاری چییە کاتێك کە من کارێك بۆ پەنابەرەکانیش دەکەم گیرۆدەی هەستە رەگەزپەرەستییەکان دەبم؟". روونی وتی" من لەو باوەڕەدام ئەمە ناتوانێت هیچ مانگێك تا کۆتایی مانگ گوزەرانی خۆی بە باشی بکات". من لە لای ئەوان نەمام و برێك دوور کەوتمەوە وکاتێك کە سەیری رەسم و وێنەکانی دیکەم دەکرد هەوڵمدەدا لە نەبوونی ئەو تیشکەی کە هەمیشە بوونی دەبڕی، بیر لە هەمیشەیی بوون بکەمەوە. هاوکات من بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆنە لە دواکەوتوو بوون و کێشەکانی خۆمان رزگارمان ببێت، رزگار بوون لەم کێشانە بە مانای تێپەڕاندنی زۆر شت و قۆناخی جیاواز بوو.

باشترین و خۆشترین زەوقی من نان خواردنی بەیانییان لەگەڵ زەینەبدا بوو. کاتێك کە پەنیرە باشە فەرەنسییەکانمان دەخوارد، کەوتنە نێو رۆحییەتی سەرخۆشییەوە دەبوو بە هۆکاری

ئەوەی کە هەست بە تاوانبار بوونی خۆم بکەم. ئاسوودە بوونی ئابووری هەر بە ئەوەندەی قەیرانی ئابووری دەبوو بە هۆکاری ئەوەی کە مرۆڤ ببێتە قوربانی هەستە ناوخۆییەکانی خۆی، لەم کاتە ساتانەدا کە من بیرم لەم شتانە دەکردەوە هەستم بە ویستی خۆلقاندنی قوربانی و دوژمنەکان دەکرد.

کاتێك کە لە دەوری گوڵەکەدا دەسووڕاینەوە بە زەینەبم وت کە هیچ حەزم لە ژنێڤ نییە و لە نێو مێشکیشمدا جۆرە هەستێك لە بەرانبەر روونیدا هاتوچۆ دەکات. بۆ ئەوەی کە من زۆرتر ئەم مەسەلەیە بۆ زەینەب روون بکەمەوە زەینەب دەستی بە گێڕانەوەی پەیوەندییەکانی خۆی و زاڤینی کرد. لە شوێنێکدا دانیشتن و زەینەب وتی" روونی پیاوێکە کە هەست بە هەبوونی خۆی و هەبوونی جیهان دەکات". هاوکات لە سەرمەوە بەرەو قاچەکانم شەپۆلێکی گەرمایی سەرتاپای منی داگیر کرد و دڵیشم زۆر بە توندی لێ دەدا و سەیری ئاسمانم دەکرد و وتم" ئاسۆی خۆشەویستی ژنێڤ".

دوا نیوەڕۆ روونی تەلەفوونی بۆ کردم و زۆر بە هەیەجان بوو. دواتر لە کافەتریاکەی دوورگەی رووسەئاۆدا یەکترمان بینی. لە ژێر کۆشینی ماشینەکەیدا چەندین رۆژنامە هەبوو. روونی تراشی کردبوو و کراسێکی پرتەقاڵی لە بەرکربوو. چاوەکانی روونی دەیانگوت" ئەم کراسەم بۆ تۆ لە بەر کردووە". روونی خۆی دەیدا بەو دارەیەوە کە لە پشتی منەوە بوو. کاتێك کە داوای قەهوەی کرد ئەو کاتە لە نێو چاوانیدا هەستێك دیار بوو و منیش زۆر حەزم لەو هەستە بوو. دووربینەکەی خۆی دەرهێنا و بەبێ ئەوەی مۆڵەت بگرێت دەستی بە وێنەکێشان کرد و دواتر وتی" من تیرۆریستم" کاتێك کە ئەمەی وت من دەستم بە پێکەنین کرد. بۆ هەر شت بەرنامەیەکی زۆر رێکوپێکی ئامادە کردبوو. دوای ئەوەی کە سەردانی مۆزەخانەکان و باخچەی ئاژەڵان و باڵاخانەی نەتەوەیەکگرتووەکانمان کرد چووینە رستۆرانتی ئیتالیاییەکان و لەوێش پیتزامان خوارد. کاتێك کە باسمان لە ئەدەبیاتی جیهان و سیاسەت دەکرد لەوە تێگەیشتم کە ئەو رق و کینەی کە خەڵکە بوومییەکانی ئەو دەڤەرانە نیشانی بیانییەکانی دەدەن گرێدراوی رق و کینی ئەوان لە بەرانبەر خۆیاندایە. لە بارەی ئەو کەسانەیەوە کە حەزیان لە ئازار دانی ئەوانی دیکە دەکرد خاوەن یەك بیروڕا بوون و پێمان وابوو کە ئەمجۆرە کەسانە خاوەن هیچ جۆرە کەسایەتییەك نین. من هیچ هەستم بە تێپەڕ بوونی دوو مانگ نەکرد. هەستی ئەوەی کە گوایا پێشتر لەگەڵ مرۆڤەکانی ئەم شارەدا ژیانم کردووە سەرتا پای منی داگیر

کردبوو. کاتێك کە سەبارەت بە هۆکاری ئەم هەستانە پرسیارم لە خۆم دەپرسی جارجار دەمگوت مومکینە بە هۆی تەنیا بوون ، یا بە هۆی ئێش و ئازارەکانمەوە تووشی ئەم هەستانە بووبم، بە هیچ شێوەیەك تێ نەدەگەیشتم و نەمدەتوانی تێبگەم.....

کاتێك کە لەگەڵ روونیدا بەرەو شاری کۆن دەڕۆیشتین و سەیری شتە عەنتیکەکانمان دەکرد دەستمان بە پێشبڕکێ بۆ پیوانی جوانکاری و رێکوپێکی شتەکان دەکرد. من لەم پێشبڕکێیەدا لە گەیشتن بە روونی تەنگاو دەبووم، توورە بوونی خۆم لەم وەزعە بە زۆرتر کردنی نێوانی خۆم و روونی دەردەبڕی. بەڵام روونی هەر وەکو ئەوەی کە هیچ شتێك نەبووبێت هەڵسووکەوتی دەکرد و دەیگوت" ئەمە تایبەتمەندییەکە کە ژیانی تەنیایی لەم چەند ساڵەدا بە منی بەخشیوە، دواتر وتی" ماڵم لەم گەڕەکە نزیکەیە، زۆر بە باشی چای لێدەنێم". هەستێکی زۆر خۆش باڵی بە سەرمندا کێشا و هەر وەکو منداڵێکی ساوا برینەکانی منی سارێژ دەکرد. دواتر روونی وتی" ژمارەی ٧٦٣٢و خۆی خوار کردەوە و دەستی بە ئایفوونی دەرگاکەوە نا و دەرگاکە کرایەوە. سەیرکردنە وێڵ و پەشێوەکانی من گوایا زۆر بە دڵی روونی بوون. کاتێك کە وتم" ئاسانسورەکە زۆر تەسکە" دەستی بە پێکەنین کرد و وتی" تەسك بوونی ئەم ئاسانسورە بۆ لە یەکتر نزیك کردنەوەی مرۆڤەکانە". کاتێك کە ئەم وتانەی روونیم بیست هەر هەمووی لەشم گەرم بوو.

ئەو شتانە کە روونی بۆ منی ناردبوون زۆر بە وردبینییەوە سەیرم دەکردن و دەمخوێندنەوە، زۆر دەمەویست لە روونی تێبگەم و نزیکی ببمەوە و حەزی لێ بکەم. دڵی من هەر وەکو ئەورووپا لە سەردەمی رێنسانسدا بوو و ئەویش لە نێو خۆیدا رێنسانسی دەست پێکرد بوو. لە یەکێك لە کارتەکانی خۆیدا کە بۆ منی ناردبوو نووسیبوو" تۆ مرۆڤێکی سەرنجڕاکێش و ئوریانتاڵی". کاتێك کە من دەستم بە لێکۆڵینەوە کردن لە سەر ئەم دەست نووسەی روونی کرد زەینەبیش لەوەڵامەوە دەستی بە پێکەنین کرد و وتی" خۆشەویستی بەبێ ئەوەی کە بارودۆخی مرۆڤ رەچاو بکات و بە بێ ئەوەی گوێ بداتە ترس و دڵەڕاوکێیەکانی مرۆڤ خۆی لە سەر مرۆڤدا فەرز دەکات. ئەمجارە شوور و هەیەجانی من بە هیچ شێوەیەك نەدەبوو بە هۆکاری ئەوەی کە من خۆم بە تاوانبار بزانم یا هەست بە تاوانبار بوونی خۆم بکەم. هەر چۆنە کە ئەو مرۆڤانەی کە ئێش و ئازاری هاوبەشیان نەبوو و بەشداری لە خۆپیشاندانەکانیان نەدەکرد بە خائین ناو دەبران، هەر بەمجۆرە ئەو شتانەی کە لە رابردوودا روویان دابوو لە بیرم دەبردنەوە. کاتێك کە من ئەم شتانەی رابردووم لە بیر دەبردەوە لە نێو زەرداوی ئێش و ئازارەکاندا دایکم و باوکم و کاکمم دەدیتن.

زەینەب و زاڤین سەرەڕای ئەوەی کە زۆر بە وردبینییەوە سەیری ڕووداو و پێشکەوتنە هونەرییەکانیان دەکرد، هاوکات زۆربەی جارانیش لەگەڵ سیاسەتمەدارە ناسراوەکانیشدا دادەنیشتن. کاتێك کە منیش بە بێدەنگی لە نێو پێستی خۆمدا تەنیا سەیری ئەوانم دەکرد و نە جگەرە و نە ڤیسکیم دەخواردەوە، هەر بۆیە ئەو جۆرە دانیشتنانە بۆ من زۆر سەیر بوون و مێوانەکانیش وا هەستیان دەکرد کە من کەسێکی دواکەوتوومە کە گیرۆدەی داب ونەریتی کۆن و شتە تابوکان بوومەتەوە. کاتێك کە دەنگی زەینەب بە زمانی فەرەنسەی کەوتە گوێی من ئەو کاتە منیش بۆ خۆم لە نێو وشە بییانییەکاندا هاتوچۆم دەکرد.

کاتێك کە من پشتم بە خۆم دەکرد هەستم بە بێگانە بوونی زاڤین دەکرد و زۆر رقم لە هەڵسوکەوتە نەرم و ماقووڵانەکەی دەهات. هەر وەکو کوڕی ئەو دایکەی کە دەیەوێ لە بەرانبەر مێردەکەی خۆیدا خۆی بەهێز بکات، منیش بە زەینەبم دەگوت" بۆ ئەوەی کە بیروڕا و بۆچوونەکانی من دووری بیروڕا و بۆچوونەکانی تۆ نەبنەوە و بۆ ئەوەی کە هەر دووکمان لە یەکتر دانەبڕێن بێجگە لەوەی کە لە بەرانبەر زاڤیندا خۆم هۆشیار بکەمەوە هیچ شتێکی دیکە لە دەستمدا دەرنایێت". کاتێك کە زاڤین بۆ چەند مانگێك سەفەری ئەمریکای کرد من زۆر خۆشحاڵ بووم. ئەو کاتەی کە خواحافیزی لەگەڵ مندا کرد وا نیشانیدەدا کە سەیر بکە ئەوا لە داخی تۆدا دەڕۆم.

کاتێك کە زەینەب چۆنیەتی ئامادە کردنی ماسی بە سەمموونی نیشانی من دەدا زوو بە زوو مولکییەی بە بیری خۆی دەهێنایەوە. بە ڕاستی دڵمان هەم بۆ مولکییە و هەم بۆ هەڵسووکەوتی ئەکرم زۆر تەنگ ببوو و زۆر بیری ئەوانمان دەکردەوە. لە بەرەبەیانییەکانی ژنێڤدا کە بۆنی شوکولات و گولاویان لێوە دەهات من لە سەر ئەو قەنافانەی کە سەیری باخچەکەیان دەکرد دادەنیشتم و گۆ بیستی ئەو دەنگ و هاوارە جۆراوجۆرانەم دەکرد کە دەهاتن و هەست و بیرەوەرییەکانی منیش دەگەیشتنە ئاستی لووتکەی خۆیان و منیش وا هەستم دەکرد کە لە ناوەڕاستی بەنداوێکی رووخاودامە... چیرۆکی وڵاتی من چ جۆرە چیرۆکێك بوو.....

کاتێك کە بۆم دەرکەوت کە ناتوانیم لە نێو زانکۆدا بمێنمەوە هەر هەمووی پەیوەندییەکانی خۆمم بڕی و دەستم بە سەردانی بورسە جۆراوجۆرەکان و دیتنەوەی ڕێگای مانەوە لە ژنێڤم کرد. دوایین شەو لەگەڵ روونیدا بووم. کاتێك کە لە دوورگەی رووسسوئاودا بینیم زۆر پەشێو بوو و بە منی وت" یەکەمین مرۆڤی سەرنجڕاکێشی کە تا ئێستا ناسیومە". کاتێك کە پرسیم بۆ چی سەرنجڕاکێشم؟" چاوەکانمان ئەوەندە بە هێز تێکەڵی یەکتر بوون کە من نوقمی هەستێکی زۆر جیاواز بووم کە ناتوانم بە هیچ شێوەیەك ئەو هەستە بنووسمەوە. ئەو کاتەی کە

به مەبەستی هەڵهاتن لە چاوەکانی روونی دەستم بە لێگەڕان لە نێو جانتاکەمدا کرد روونی بە دەنگێکی بەرز دەستی بە پێکەنین کرد و وتی" هەڵستین". من نەمدەزانی چی بکەم و نەمدەتوانی بجووڵێمەوە بەراستی وزەی بەهێزی روونی کاریگەرییەکی یەکجار زۆری لە سەر من کردبوو. کاتێك کە ئەو رۆژە دەستمان بە سەفەرێك کرد و گۆیبستی مۆسیقای ئەفغانیم کرد کە تا ئێستا هیچ نەمبیستبوو، باران هەر وەکو مرۆڤێکی شێت لە جامی ماشینەکەی دەدا و هەر دووکمانیش بێدەنگ بووین. من سەیری دەستی روونیم کرد زۆر حەزم دەکرد ئەو دەستانە دەستی من بگرن. روونی دەستی بە پێکەنین کرد و منیش پرسیم کە ناوی ژنەکەت لە وڵاتی خۆتدا چییە؟ روونی بەبێ ئەوەی کە هیچ رەنگ و روخساری خۆی و جدیەتی خۆی بگۆڕێ وتی" ناوی کەڤییە". وتی حەیف بۆ کەڤی و حەیف بۆ تۆیش. کاتێك کە گەیشتینە لەوزان وتی" ئەمە هۆتێلی بەناو ریڤاژە ئەو هۆتێلەیە کە هەر هەمووی دیالۆگ و دانووستاندنە مێژووییەکان لێرەدا بەڕێوە دەچن". کە چووینە ژوورەوە لەگەڵ یەکێك لە ئەندامانی پرسگەی هۆتێلەکەدا دەستی بە گاڵتە کردن کرد. دواتر کاتێك کە لە سەر ئەو دەرەجانەی کە بە فەرشی سوور داپۆشرابوون بە سەر دەکەوتین من لە نێو خۆمدا دەمگوت" داخو چەند کەس لە سەر ئەم دەرەجانەدا هاتوچۆیان کردبێت، داخو چەند بریاری گرنگ لێرەدا گیرا بن". هۆتێل چۆڵ و بێدەنگ بوو، زۆر بە ئاسانی لە نێو هۆتێلدا دەسووڕامەوە و سەبارەت بە تابەلاکانی سەر دیوار و چۆنیەتی دروستکردنی ئەو هۆتێلە زانیاریم وەردەگرت. لە نێو رستۆرانتەکەدا دەنگی قاپ و گارسۆنەکان دەهات، خواردنیان ئامادە دەکرد. روونی دەرگای هۆڵەکەی کردەوە و وتی" سەیری ئێرە بکە". لە ژوورێکی کۆندا بۆنی شت و مەکی کۆن پەردە قەدیفەکان دەهات. شت و مەکەکان هەر وەکو ئەو گیانلەبەرانەی کە نهێنییەکانی مێژوویان لە نێو خۆیاندا هەڵگرتبێت راوەستا بوون. منیش لە ناخی خۆمدا وتم" ئاخ ئەمە چ ئاسوودە بوونێکە". لە ترسی ئەوە کە دەستگیر دەکرێن چاوی من هەمیشە لە سەر دەرگا بوو. دەرگاکەی داخست، شەوە زەنگ و باسەفا بوو. کاتێك کە من وتم " با بڕۆین" روونی هەر وەکی شێرێك کە زنجیری خۆی بریبێت منی بە باوەش گرت ئەو کاتە سەرم گێژ بوو و قووڕگیشم وشك بوو. بەو دەستە وشك و بە هێزانەی خۆیەوە سەر و رووی منی دەماڵی، دواتر دەمی نا نێو دەمی منەوە، منیش سەرم سوڕما بوو کە رووبەڕووی چ کارەساتێك بوومەتەوە. من هەر دەمگوت چ دەبێت با ببێت هەڵستە با بڕۆین دەمان بینن. روونی هیچ گۆیبستی منی نەدەکرد، بۆنێکی تایبەتی هەبوو، من لە تابلۆ و گلۆپ و مێز و کورسییەکان شەرمم دەکرد. کاتێك کە بە هێمنی

دەرگاکە کرایەوە و دەنگی پێکەنینمان بیست پێکەوە دەرکەوتین. من سەیرێکی ئاوێنەکەم کرد و دەمەویست هەڵبێم. لێوەکانی من وایان لێ هاتبوو کە مرۆڤ دەیگوت مێشە هەنگوینییەکان هێرشیان کردوونەتە سەر. لە کاتی دابەزین لە پەیژەکاندا من دەست و قوورگی خۆمم دەگرت و روونیش دەکەنییا.

ئایا من دەمتوانی بوو بە هۆی ئەو سەیر کردنە قووڵانەی روونییەوە رابردووی خۆم لە بیر ببەمەوە؟

دوو رۆژ دواتر زەینەب چاوپێکەوتنێکی سیاسی خۆی کردە بیانوو و لەگەڵمدا نەهاتە باڵەفرخانە، بێگومان هەر دووکمان ئاگامان لەم یارییە گچکەیە هەبوو. هەست و ئاواتەکانی من تێکەڵاو ببوون. لە بەرانبەر ئەم زانا بوونە کە دەبوو بە هۆکاری دابڕینی قاچەکانم لە سەر زەویی بێدەنگ دەمام. کاتێك کە من بیرم لەوە کردەوە کە نێوانێکی کورت و گچکە لە نێوان خۆم و ئەو کەسانەی کە منیان خۆش دەوێت دروست بکەم هەستم بەوە دەکرد کە شتی زۆر لە نێو ئەم پێلانەی مندا شاراوەتەوە. لەم کاتەساتانەدا روونی پرسیاری کرد " ئایا لەوە پەشیمانی کە منت ناسیوە؟" منیش زۆر بە دڵ سەیرم کرد و بە دڵ وتم" نا پەشیمان نیم". کاتێك کە لە نێو باڵەفرەکەدا بیرم لە روونی دەکردەوە دەلەرزیام، چاوەکانم داخست و هەستم بەوە کرد کە بەرەو جیهانێکی رەشەوە دەڕۆم دەستم بە گریان کرد. ...

یەکەمین چەژنی سەری ساڵ کە لە ژنێڤ بەسەرم برد بە هیچ شێوەیەك لە بیرم نەدەچووەوە. ئەو لافاوەی مرۆڤەکان کە لە نێو کۆڵانەکان و لە هەر چواردەوری گولەکەدا رژابوو.... لە نێو بالکۆنی زونالّدا سەیری نمایشی گوللە هەوایییەکانمان دەکرد. رونالّد سەرەتا بەو هەڵویستانەی کە لە ناکاوەوە نیشانی دەدان هەر وەکو مرۆڤێکی سەرکەش بوو، زۆر بە هەست و رۆمانسیش بوو. ژنەکەی کە جار جار چاوی خۆی دادەخست و هاواری دەکرد دەیگوت" ئێمە تۆزێك رۆمانسین بەڵام تۆزێکیش وشکین".

کاتێك کە گەڕامەوە ئەستەنبووڵ دەنگەکان و رەنگەکان بۆ من مانا و واتایەکی دیکەیان هەبوو. هەر دەنگێك کە دەکەوتە گوێم دەبوو بە هۆکاری ئەوەی کە من بیری دەنگی روونیم بکەمەوە. شەوی دەنا بە سەر رۆژەوە و کاری دەکرد و هەمیشە هەوڵی دەدا کە من فێری پێکەنین بکات. رۆژێکیان بەیانی زوو تەلەفوونی بۆ کردم و وتی" دەلیلا ئێستا لە نێو شەمەندەفەردام و لە دۆڵی پوودا تێپەڕ دەبم و ئەم دۆڵە بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت بە ئەبوەندەی دڵی من خاوەن بەرهەم بێت". زۆربەی جاران بە هۆی قسە کردنی زۆر درێژ لە رێگای تەلەفوونەوە بەبێ خەو دەماین. بۆش بوونی کۆتایی قسەکانی خۆمانیش بە شێوەیەکی

ناڕاستەوخۆ دەردەبڕی و بە ماچ کردنی یەکتر لە لەوزان دەکەنیاین. کاتێك کە وتم " بە مەبەستی بەشداری کردن لە سەمپۆزسیۆنی ئەدەبیاتی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەرۆمە شاری وان" ئەو کاتە بڕیارماندا کە لەوێ یەکتر ببینین. من زۆر بە هەیەجان و بە شەوق بووم و بە روونیم وت" پێویستە سێ رۆژ بەر لە دەست پێکردنی سەمپۆزسیۆنەکە یەکتر ببینین".

بەهارێکی دواکەوتووبوو، ناچار بووم بە باڵەفڕ بچمە ئەرزرووم و لەوێشەوە بە پاس بچمە وان. لە رابردوودا جارێك لەگەڵ زەینەب سەردانی وانم کردبوو و شەوێك لەوێ مابووینەوە و دواتر چووبووین بۆ دەڤەری هەکاری. من هیچ شتێك بێجگە لەو ماسییانەی کە لە ماڵی زەردەشت کە بە هۆی چالاکی سیاسییەوە ١٦ ساڵ زیندانی کرابوو خواردبوومان هیچ شتێکی دیکەم بە بیر نە دەهاتەوە.

ئەرزرووم زۆر سارد بوو و بەفرێکی کەمیش باری بوو. روخساری مرۆڤەکان سوور و سەریانیش داپۆشرا بوو. لە شیرینی فرۆشییەکی گچکەدا برێك شیرینی و چایەکم خواردەوە. کاتێك کە مرۆڤەکان شیرینییەکەیان دەخستە ژێر زمانی خۆیانەوە و بە خۆرخۆر چایان دەخواردەوە لە قسە کردنیان بە زمانی تورکی زۆر کەم تێدەگەیشتم. هەر هەمووی وشەکان بە حەرفی چ کۆتاییان پێ دەهات. سەری خۆم دانابوو سەر جامی پاسەکەوە و لە شۆفێرەکە پرسیارم کرد" ئەرێ لە باشقالایەوە تێپەڕ دەبین؟" شۆفێر وتی" برازام لەوێ دێتە خوارێ؟" من بێدەنگ مام، ئەو گوندانەی کە دوور بوون و هەژارییان بە بیری من دەهێنایەوە یەك لە دوای یەك دەکەوتنە بەرچاوم. کە چاوم بە تابلۆی باشقالا کەوت زۆر بە وردبینییەوە سەیرم کرد. ئەو کاتە ئەو کەسانە بە بیرم دەهاتنەوە کە دەیانبردن بەرەو پیری مەرگ و کوشتنەوە، ئەو مرۆڤانە ئالتوون و شت و مەکی بە نرخی خۆیانیان لە ژێر خاکدا حەشار دەدایەوە، ئەو کەسانەی کە بە دەستی خۆیانیان بۆ خۆیان قەبریان هەڵدەکۆڵا، ئەو مرۆڤانەی کە ددانی مردووەکانیان دەشکاند و لە نێو زکی ئەواندا بە دوای شتی بەنرخدا دەگەڕیان، ئەو کچە جوانانەی کە لە قافڵە و کۆمە قەرەباڵغەکاندا جیا دەکرانەوە، هەر هەمووی ئەوانە یەك لە دوای یەك بە بیرم دەهاتنەوە. کاتێك کە گەیشتمە وان ببوو بە شەو. گاراژ و تەرمینالی شارە سنوورییەکان زۆر جیاواز بوون. ئەو گاراژانەی کە برێك رووناك بوون، وەکو دوایین شوێن ئاماژەیان پێ دەکرا. من هیچ حەزم لەو بێدەنگییە نەبوو کە بێ کەسی منی بە بیری من دەهێنایەوە. کاتێك کە چاوم بە روونی کەوت کە لە نێو تاکسییەکەدا دابەزی بە خێرایی چووم بە روویەوە. بەو هەستەی کە من ژنێکی ترسنۆك نیم باوەشم بە رووناییەوە کرد. هەر وەکو ئەوەی کە بتوانێ ناخی من بخوێنێتەوە

دەستی بە پێکەنین کرد. لە گوڵ فرۆشەکەی بەر دەرگای هۆتێل دوو چڵ نێرگزم کڕی، بۆنی بەهار و پەردە قەدیفەکان ژوورەکەیان پڕ کردبوو. ئاسوودەبوونێکی یەکجار زۆر بە منەوە دیار بوو. رۆونی سەری سوڕ مابوو و بەو هەڵسوکەوتە منداڵانەی من دەکەنییا و لێوی خۆی گاز دەگرت و هەڵسوکەوتە ئاساییەکەی منی بە وردبینییەوە هەڵدەسەنگاند. وردە وردە من دەمەویست فێری پەیوەندی جنسی ببم. بە قسە کردن سەبارەت بە ئەدەبیات و سیاسەت و گوزەرانی خەڵك تا بەرەبەیان نەنووستین کاتێك کە هەتاو لە پشتی پەردە شەرابییەکەوە دەکەوتە نێو ژوورەکەوە و سەمفۆنییای ژیان جموجوڵی دەدا بە ژیان، من سەیری چرچەکانی رووی روونیم دەکرد، ئەو شتەی کە دەگوترا تەنیا و تەنیا خۆشەویستی بوو و بیرم لەوە دەکردەوە کە خۆشەویستی قۆناخێکە بۆ حەزلەیکترکردن.

هیچ نەمانزانی کە ئەو رۆژە چۆن تێپەڕ بوو. وان بەو دار و درەخت و جادانەی خۆیەوە هەر وەکو شارێکی نویٚ یا بەکار (مەبەست ئەوەیە کە سیمای شار جوان و دڵگیر بووە.وە) بوو. ئەو بۆنە نمارەی گیا و سەوزەوات مرۆڤی سەرخۆش دەکرد، بناری چیاکان، لە بەربڵاوەکانی قەراخی گۆل، بەردە گەورەکان و دار و درەختەکان هەر هەموویان لە دوای ئەو بارانە بەهێزەی کە دەباری دەدرەخشانەوە. لەو رستۆرانتە سادەییە کە پێیان دەگوت رستۆرانتی شاری کۆن نانی بەیانیمان خوارد، بێجگە لە تام و چێژی ئەو نانە، سەمیمی بوون و رووراست بوونی مرۆڤەکانیش لە رادەبەدەر بوو و سەرنجی منی رادەکێشا. فەرش فرۆش و گلێم فرۆشەکان جێگا و شوێنی خۆیانیان دەزانی. ئەوان بەو رووناکییانە و ئەو بۆنە خۆشەی میسك کە لە دووکانەکانیاندا بڵاویان دەکردەوە ئەتومسفەرێکی زۆر گونجاویان دەرەوخساند. ئەوانەش کە لە تەمبورر و زورنایان دەدا ببوون وەکو بەشێك لە دیمەنی شار. کاتێك کە باسی سەرکردەی قارەمانی ئورارتوکان و قراڵیچە سەمیرامیزیان دەکرد بێهۆش دەبووین. (مەبەست لە قراڵیچە ژنە شاە یا ئەو ژنەیە کە لە سەر تەختی حوکمداریدا دادەنیشێت. وە). ئەو منداڵانەی کە لە بەر دەرگای قەڵای شاری واندا راوەستا بوون بۆ ئەوەی کە ببنە وەکو رابەر یا رێنیشاندەر هەر وەکو گەنە بە مرۆڤەوە دەلکیان و دەستی مرۆڤیان دەگرت. کاتێك کە لووتی خۆیانیان هەڵدەکێشا دەیانگوت" زانیاری زۆرتر کەلکی نییە". کاتێك کە وێنەی ئەو دەروێشەم دەکێشا کە لە نێو قەڵادا هەڵبەست و مەولوودی دەخوێند ئەو دەروێشە کە تەمەنی نزیکەی ٦٠ ساڵان بوو دەیگوت" حەرارەت لە کوێیە ئەو نە سجدەگایە، کەرامەت لە سەری مرۆڤە نە لە تاجی مرۆڤ، بە دوای چیدا دەگەڕێت لە نێو خۆتا بگەڕێ، ئەو شتەی کە بە دوایدا دەگەڕێی نە لە

مەککە، نە لە حەج و نە لە قودسە". یەکێك لە منداڵەکان وتی" کاکە ئێوە گوێ بەو هەڵبەست و مولوودیانەی ئەم کابرای مەدەن، بۆ میت کاردەکات".

کاتێك کە گەڕاینەوە بۆ هۆتێل بە زەوق و شەوقێکی گەورەوە دەستمان بە راموسانی یەکتر و شەڕە بالیف کرد. روونی بەو شێوە سحرئامێزانەی خۆیەوە منی لە سەر یەك قاچی خۆیدا بەرز دەکردەوە و منیش هەر وەکو کاتی منداڵی هاوارم دەکرد، زۆزانا زۆزانا. (مەبەست لە زۆزانا کوێستان یا ئەو شوێنەیە کە کۆچەرەکان لەهاویناندا روویان تێدەکەن.وە)

جارجار لەگەڵ دۆستە هاوبەشەکانی زەینەب و روونی پێکەوە دادەنیشتین، من زۆر دەمەویست بزانم کە هاورێکانی روونی سەبارەت بە من چۆن بیر دەکەنەوە. روونی ئەوەند ڕووراست و سادە بوو کاتێك کە بە وردبینییەوە باسی داتاکانی هەر شتی دەکرد من پێ مەغروور دەبووم. ئەوانە کە پەنابەر نەبوون زۆرتر ئازاد و خاوەن متمانە بوون. ئەم متمانە دەبوو بە هۆکاری ئەوەی کە هەڵسوکەوتیان برێك نەرم و شیرین بێت. کاتێك کە جارجار لە ژێر ئەم سادە بوون و نەرم و نیا بوونەدا رۆحێکی زەنەفوبیك خۆی نیشاندەدا و ئێش و ئازارێکی دەخستە نێو دڵمانەوە، ئێمە دەمانگوت پێویستە زۆرتر زانا و هۆشیار ببین و فێری شتی زۆرتر ببین. هەر وەکو ئەوەی کە خاوەن چەندین تایبەتمەندی بوون کە نەماندەتوانی لە بیریان ببەینەوە هەر بەم شێوەیەش دەمانزانی کە بێجگە لە فێر بوون و زانا بوون هیچ رێگایەکی دیکە لە بەردەماندا نییە. لە چاوی هەندێك کەسدا ئێمە بیانی بووین و لەو داگیرکەرانە بووین کە مافی ئەوەمان نەبوو لێرە بژین.

ئێمەش وردە وردە فێری وردە حەسابە ئابوورییەکانی نێو ژن و مێرد، پارە دانی چەندین ئەندامی یەك ماڵبات لە نێو چایخانەکاندا بەو شێوەیە کە هەر کەس پارەی چای خۆی دەدا دەبووین. ئەو هەڵسوکەوتانەی کە یەکێك شتێکی دەخواردەوە و داوای لێبووردنی لە ئەوی دیکە دەکرد و دەیگوت بەشم ناکات بۆیە پێت نادەم لە لای ئێمە زۆر شتێکی سەرنجراکێش بوو. ئێمە لەو کەسانە بووین کە شتێکی بەجۆرەمان نەدەخوارد و خۆراگریمان دەکرد. کاتێك کە شتی هەرە باشمان دەدا بە مێوانەکانمان زۆر راحەت و ئاسوودە دەبووین. ئەرێ یا دایکیشم بەشی هەرە باشی مریشکە برژاوەکانی دەدا بە باوك و کاکم. ... ئاخ ئەو ژنە بێچارانە کە بە پاشماوەکانی مێردەکانیان تێر دەبوون....

کاتێك کە من بەشداریم لەو کۆڕ و کۆبوونەوانە دەکرد کە لە نێو ناوەندە کولتووری ، یا ماڵەکانی خەلکدا ساز دەکران، برێك بێتاقەتی و بێزار بوونم دەردەچوو، ئەو کەسانەی کە گوندەکانی خۆیانیان چۆڵ کردبوو و هیچ خوێندن و نووسینەوەشیان نەدەزانی هەر وەکو

ئاپۆڕایەکی زۆر گەورە بوون لە نێو شاردا. ئەو کارو چالاکییانەی کە بە دڵ و گیان دەستیان پێ کردبوو بۆیان نەمابوون و وردە وردە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ گوند، باخ و بێستانەکانیشیان دەپچڕا، ئەو دەستانە کە لە نێو گوندا یا ئاویان دەکێشا یا لە نێو بێستان و باخەکاندا سەرقاڵی بەرهەم هێنان بوون لە نێو شاردا وشك و بەبێ بەرهەم بوون، بۆیە یا بەیانی تا ئێوارە لە نێو شاردا بۆ خۆیان دەسووڕانەوە یا وەکو سالیانگوز لە نێو خۆیاندا خۆیانیان حەپس دەکرد.

لە کاتی نەورۆز و یا لە کاتی فیستیڤاڵ و ئاهەنگەکاندا کۆبوونەوەی جەماوەر بە مانای بەهێزتر کردنی بەرەی سیاسی بوو، متمانە نەکردن بە شتێك کە هەدەف و ئارمانجی تۆ نەبێت شتێکی زۆر نەخۆش و قیزەونە. زۆر بە ئاسانی فێری سەیران کردن ببووین. کاتێك کە ئێمەی هاووڵاتییانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە کاتی دەعوەت و ئاهەنگەکانی خۆماندا بەو پەڕی زەوق و سەلیقەوە خواردنە تایبەتییەکانی خۆمانمان ئامادە دەکرد هاوکات رۆژی ئاهەنگ گێڕانیش تا شەو بە هەڵپەڕکێ و وتنەوەی گۆرانی و شایلۆغان خۆمانمان سەرقاڵ دەکرد. کاتێك کە ئەو ژنانە کە سەرکۆڵمەکانی خۆیانیان وەکو شەکرە سێو دەڕازاندەوە و دەست و گەردنی خۆیانیان پڕ دەکرد لە جەواهێرات و مەمك و قاچی خۆیانیان دە لەرزاند ئەو کاتە من زۆرتر هەستم بە بن دەستی خۆمان دەکرد. زۆر رقم لەو پیاوانە دەهات کە بە مانگانەی کەمی پەنابەری شەو و رۆژ لە نێو چایخانە و کافەکاندا دەبوون و کاتێکیش کە دەردەکەوتن دەم و چاو و سمبێڵەکانی خۆیانیان دەسڕییەوە، بەڕاستی من زۆر رقم لەم جۆرە پیاوانە بوو. محەمەد کە تەمەنی ٦٨ ساڵ بوو لەگەڵ هاوسەرەکەی نەوال خانم لە رووی کولتووری ژیان کردنەوە زۆر جیاواز بوون و فەرقی زۆریان لەگەڵ یەکتردا هەبوو. من تەنیا لەو ئاهەنگ و شاییانەی کە لە ماڵی ئەواندا دەگێڕان کەیفم دەهات و زەوقم لێ وەردەگرتن. محەمەد ئەو کاتەی کە ژنە جوان و رێکوپێکەکانی دەدیت بە هیچ شێوەیەك کۆنترۆڵی خۆی لە دەست نەدەدا و دەیگوت" ژنانی ئێمە هەر وەکو ئەو فریشتانەن کە خەیاڵیان پێوە دەکەین". خاتوو نەواڵیش بە هۆی ئەو متمانەیەوە کە بە مێردەکەی هەبوو لەو پەڕی خۆشەویستی و رێز و ئیحترامدا دەژییا. نەواڵ دەیگوت" کاتێك کە یەکەمجار محەمەدم بینی عاشقی بووم، بەڵام دەترسیام کە محەمەد هەست بە عاشق بوونی من بکات و هاوکات زۆر ترسم لەوە بوو کە لەگەڵ محەمەددا دوو بە دوو دابنیشین و لەم بارەیەوە قسە بکەین". کاتێك کە ئەو شووتییەی کە ئامادەی کردبوو سەرەتا بردی بۆ مێردەکەی و دواتر هێنای بۆ من رەنگ و روخساری من سوور بووەوە و هەر وەکو ئەوەی کە تاوانێکم کردبێت لە خۆم بێزار بووم و چاوەکانیشم بە ئیسرار بە دوای روونیدا دەگەڕان. روونی لە

دەرەوەی باخچەکەدا لەگەڵ ڕۆژنامەنووسێکی ئێرانی پیاسەی دەکرد، باوەڕ بکە کاتێك کە لە لای منیشدا دادەنیشت من هەر بیرم لێ دەکردەوە.

ئەو شەڕە کە بە هیچ شێوەیەك نەماندەتوانی ناوێکی بۆ بدۆزینەوە زەرەرێکی یەکجار زۆری دابوو بە خەڵکی دەڤەرەکە. ئەو کەسانە کە دەیانەویست بە قاچاخ روو لە ئەورووپا بکەن هەر جۆرە مەترسییەکیان دەدا بەر چاو و بە ڕێ دەکەوتن و باسی ئەوەیان دەکرد کە بە چەندین ڕۆژ برسی بوونە و لە نێو دەریاکاندا لەگەڵ شەپۆلە زەبەلاحە بێ ئەمانەکانی ئاودا شەڕیان کردووە، یا بە هەزار حاڵ خۆیان لە دەستی چەتەکانی مەرگ و قاچاخچییەکانی مرۆڤدا رزگارکردووە. لە ڕاستیدا هەر مرۆڤێك شارێك، گوندێك یا ناوچەیەك بوو، کاتێك کە ڕانەهاتن دەبوو بە بیر کردنەوەیەکی قووڵ و بەهێز یا ڕق و کین، ئێش و ئازارەکانی سەردەمی کوودەتا سەربازییەکەش کە کاریگەرییەکی تایبەتییان هەبوو بە بیری مرۆڤ دەهاتەوە. ئەو مرۆڤانەی کە بە هەڵوەشاندنەوەی یەکیەتی سۆڤییەت و دیواری بەرلین ڕووبەڕووی گۆڕانکاری زۆر نیجابی ببوونەوە بە هیچ شێوەیەك نەیاندەویست کە ئەم بەبا چوونەی خەیاڵەکانی خۆیانیان دووبارە ببیننەوە. ئەو کەسانەی کە بە هۆی یاساکانەوە قەدەغە کرابوون سەرەڕای گۆڕینی یاسا قەدەغەکارەکانیش چی دیکە نەیاندەویست بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان. ئەوانەیش کە بە هۆی پەیوەندییەکانی خۆیان بە پارتییەوە نەیاندەتوانی بگەڕێنەوە هەمیشە باسی بیرەوەرییەکانی خۆیانیان دەکرد، چۆنە شەڕیان کردووە، چۆنە بریندار بوونە و چۆنە خراونەتە گرتووخانەوە.... ڕق و کینەی ئەوان لە دژی دەسەڵات ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زۆتر دەبوو، کاتێك کە دەیان زانی ئەو دەسەڵاتە ئامادە نییە گۆڕانکاری بکات، بیریان لە گەڕانەوەی خۆ و هەستە تێکەڵاو کراوەکانی خۆیانیان دەکردەوە و وا هەستیان دەکرد کە لە لایەن کاتەوە دەورپێچ کراون، هەر بۆیە حەزیان دەکرد هەمیشە قاچاخ بن و نەتوانن بگەڕێنەوە. کاتێك کە شەڕ گۆڕ بوو و جەنایەتە بکەر نادیارەکانیش پەرەیان سەندبوو، هەر هەمووی ناوەند و ڕێکخراوەکان پڕ ببوون لەو مرۆڤانەی کە رایان کردبوو. لە کاتی ڕاگەیاندنی ئاگربەستەکانیشدا هەر هەمووی ئەو هەست و ئارەزووانەی کە نهێنی بوون دەردەکەوتنە سەر ئاو. مانای بێ باوەڕی و ڕانەهاتنی پەنابەری پەسەند کردنی حوکمی ئەوانی دیکە بوو. لە شەوی حەفلە و ئاهەنگەکاندا یا لە کاتی سەردانی سیاسەتمەدارانی وڵاتی خۆمان بۆ وڵاتە بیانییەکان ، یا لە کاتی سازدانی هەر جۆرە ئاهەنگ و فیستیڤاڵێکدا، خەڵك زۆر بە هەستیاری و بەو

پەری خۆش زەوقییەوە خواردنی ئامادە دەکرد و بە شایی و هەڵپەرکێ کۆتایی بە بەرنامەکانیش دەهات. هونەرمەند و نووسەرەکان کاتێك کە باسیان لە هونەر و ئەدەبیات دەکرد زۆر بە ئەستەم دەیانتوانی کە ئەو جەماوەرە کەڕ و لاڵە تێبگەینن، بۆیە هەر هەمووی قسە و باسەکان جارێکی دیکە دەگەڕانەوە بۆ سەر بن دەستی، شەڕ و هەژاری. ئەگەر ئەدەبیات و هونەریش نەبووبایا ئەم کارە هەر دەکرا. چونکە ئەو کەسانەی کە لە ناوچە شاخاوییەکانەوە هاتبوون رۆشنبیر و هونەرمەندەکانیان بە ترسنۆك و بێ جەسارەت لە قەڵەم دەدا.

چەند جارێکیش ئێمە جەماعەتی هەڤاڵانمان دەعوەت کرد و باشترین شتمان ئامادە و پێشکەشمان کردن. کاتێك کە بیرم لەو رۆژانە دەکردەوە کە ساوەری بەبێ روونمان دەخوارد و بۆ ئەوەی کە شەکر بەشمان بکات زۆر بە کەمی شەکرمان مەسەرف دەکرد چاوەکانم پڕ دەبوون، چونکە هێشتا کۆتایی بە شەڕ نە هاتبوو و حکوومەت ئابلووقەی ئەرزاق و خواردەمەنی لە بەرانبەر گوند و ناوچەکاندا پەیڕەو دەکرد. بەڵام ئێمەش بەبێ ئەوەی کە بیر لەو گوندییانە بکەینەوە کە خواردنیان نییە، باشترین خواردنمان دەخوارد و قسەمان دەکرد. کاتێك کە زاڤین گەڕایەوە دەستمان بە سازدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ نەتەوەکانی دیکە کرد. لەگەڵ ئەو هەڤاڵانە کە شەڕیان کردبوو و بریندار ببوون و لە نێو رێکخراوەکاندا سەرقاڵی دەرمانکردنی خۆیان بوون سەبارەت بە شەڕ و مەسەلەکانی دیکە وتووێژمان دەکرد، بەڕاستی ئێمە هیچ لە گفتوگۆ کردن لەگەڵ هەڤاڵان یا ئەو کەسانەی کە خۆیانیان بە باشی پەروەردە کرد بوو تێر نەدەبووین. زۆربەی جاران تا درەنگانی شەو وتووێژمان دەکرد و دواتر لە تاریکی و درەنگانی شەودا رووبەڕووی ترس و خەیاڵە بە با چووەکانی خۆمان دەبووینەوە.

بەیانییان کاتێك کە تیشکی خۆر لە نێوان دارە بەرزە شکۆمەندەکاندا دەکەوتە نێو گوڵەوە من دەستم بە پیاسە کردن دەکرد و ئەو رۆژانە دەهاتنەوە بیرم کە منداڵ بووین و بەردمان بۆ ناو رووبار فڕێدەدا. کاتێك کە بێدەنگ و من بۆتی گوڵەکەمان هەڵدەکێشا بێدەنگ دەبووین. رابردووم دەبووە بە نهێنییەك کە باسی لێوە نەدەکرا. ئەرێ رابردوو و داهاتوو لە نێو یەکتردا بوون و بە یەکەوە پەیوەندییان هەبوو. دواتر مردن و چەندین وشە وەکو لە ناوچوون و نەمان خۆیانیان لە نێو چاوەکانی مندا کۆدەکردەوە. ئەو جادانە کە بۆنی گوڵیان لێوەدەهات و ژیانی لووکس ، باش منی هان دەدا کە خیانەت بە رابردووی خۆم بکەم و راستی خۆم لە بیر ببەمەوە. دەبوایا من ئێش و ئازارەکانی خۆم دەربڕیبا یا نووسیبا،

چونکە کۆکردنەوەی ئەو هەموو ئێش و ئازارە لە ناخمدا دەبوو بە هۆکاری دەست پێکردنی بیانی بوونی من لە خۆم، من دەم زانی کە ئیتاعەت کردن و هیچ بوون لەم جۆرە قۆناخانەدا خۆی بە سەر مرۆڤدا دەسەپێنێت.

کاتێك کە چوومە ئاتولیەکەی روونی هەر وەکو ڤیکتوریا بەژن و باڵی خۆم نیشاندەدا و راست رادەوەستام. زۆر حەزم بە گاڵتە کردن و پێکەنین دەکرد. بەڵام پێکەنین دوور بوو، چونکە روونی لە سەر مێزی ئاتولیەکەیدا لە نێو سەیر کردن و وردبوونەوە لە سەر رەنگەکاندا بزر ببوو و هیچ هەستی بە هاتنی من نەدەکرد. کاتێك کە وەکو جاران لە دەزگای قەهوەکەی قەهوەیەکم بۆ خۆم داگرت و دەستم بە خواردنەوەی کرد برێك لێوەکانمی سووتاند. تەنیا زۆر زانین تێری نەدەکرد، شتی گرنگ خولقاندن و پێشکێش کردن بوو. هەر شت سەیری منی دەکرد و منیش دەمەویست روونی واز لە نیگارکێشان و رەسم کێشان بهێنێت و سەیری من بکات. دەبوایا بووبام بە تاقانەی روونی. من وا بیرم دەکردەوە کە پێویستە نهێنییەکانی عەقڵی زامداری خۆم وردە وردە ئاشکرا بکەم. لەم کاتە ساتانەدا قاچێکی من سڕ ببوو و من هیچ هەستم پێ نەدەکرد، لە ناکاوەوە چەند هاوڕێـیەکی روونی هاتن و هێشتا هەر قاچی من سڕ بوو. من مانا و واتەم دەدا بە هەر قسە و هەڵسوکەوتێکی ئەو هاوڕێیانەی روونی، بەڵام زمانە فەرەنسییە ناتەمامەکەی من بۆ تێگەیاندنی ئەو هاوڕێیانە تێری نەدەکرد، بۆیە پەنام بۆ زمانی ئیشارەت و هەڵسوکەوت برد. جارجار روونی بە کورتی ناوەرۆکی ئەو شتانە کە باسیان دەکردن بۆ منی دەگێڕایەوە. سەبارەت بەوەی کە ئەگەر مرۆڤ نەتوانێت لەگەڵ ئەوانی دیکەدا پەیوەندی ساز بکات ئەو کاتە ژیانی تایبەتی زۆر لاواز و هەژار دەبێت یەك بیروڕامان هەبوو. ئەو کەسانە کە تەنیا لە نێو پێستی خۆیاندان و لەگەڵ هیچ کەسێکدا پەیوەندییان نییە، چاوەڕێی رێکەوت و چارەنووسیان دەکرد و بۆ ئەوەی ئەوانی دیکە بکەنە حەیران و شەیدای خۆیان دەستیان بە خوێندنەوەی دوعا دەکرد و بە هۆی ترسی گرێدراو بوونەوە لە پەیوەندییەکانی خۆیاندا قۆناخی پێکەوە بوونێکی بێ پایانیان ئاڵۆز دەکرد و بەبێ ئەنجام دەهێشت. کاتێك کە ئێمە ئەمجۆرە قسانەمان دەکرد جارجار من لەنێو خۆمدا رووبەڕووی ناکۆکی دەبوومەوە. و دەنگێك لە ناخی مندا دەپرسی" ئێوە چینە؟ تۆ چی؟" ئاسوودە بوونی ژنەکان لەگەڵ روونیدا دەبووە بە هۆکاری تووڕە بوونی من و کاتێك کە من لە سەر سنووری حەسادەت و شك و گوماندا هاتوچۆم دەکرد بێجگە لە پێکەنین هیچ رێگاچارەیەکی دیکەی من لە بەرانبەر ئەو دەنگە نەرم و نیایانەی روونیدا نەبوو. کە دەستم بە پێکەنین دەکرد لێوەکانی

من هەر وەکو تەلێکی ئاڵۆز و تووڕە لەیەکتریان دەدا. لە ناخی خۆمدا لەگەڵ ماریانا، کلاریسا، روناڵد، ئیپەك، هەورا و بارزاندا شەرم دەکرد چونکە دەمەویست لە بەر چاوی روونیدا تەنیا من باش و جوان بم. بە مەبەستی بەهێز کردنی زمانی فەرەنسی تا نیوەشەوان کارم دەکرد و لە سەر بابەتی سیاسی و هونەرییەکان بیرم دەکردەوە. باوکی کلاریسا خەڵکی شیلی و دایکیشی فەرەنسی بوو. چاوەکانی بە رەنگی ئاوبوون و کاتێك کە روونی پێ وتم کلاریسا لەزبییەنە (مەبەست ئەو ژنانەیە کە لەگەڵ ژنانی دیکەدا پەیوەندی جنسی ساز دەکەن. وە) من چاوی خۆم لە روونی دوور کردەوە و سەیری کلاریسام کرد و بەو شێوەیە کە بڵێ " ها کلاریسا من تۆ باش دەناسم" زەردە خەنەیەکی گچکەم کرد. بە مەبەستی ئەوی کە خۆم عەفوو بکەم برێك دەستم بە سەری ئەو سەگەیەوە کێشا کە لە باوەشیدا بوو. روناڵد زۆر بە باشی کەمانی لێدەدا و هەمیشە تێدەکۆشا کە ناتەمامیی و کەموکورتییەکانی کەسایەتی خۆی تەواو بکات، هیچ گۆشتی ئاژەڵانیشی نەدەخوارد. چاوە گچکە و نزیکەکانی پڕ بوون لە خۆشەویستی و هیوا و گەشبینی. کاتێك کە هەوڵی دەدا قاچەکانی خۆی جوت بکات ئەو کاتە هەر دوو قاچی بە شێوەی V را دەوەستییان. کاتێك کە بە مەبەستی لێدان کەمانەکەی دەستی خستە ژێر چەناکەی خۆیەوە دەستی بە کۆخین کرد و وتی" سووڵ رەمی سووڵ رەمی" دواتر دەستەکانی دەبوون وەکو باڵندەیەك کە باڵ دەگرێت. ئەوندە بە باشی لێدەدا و لە سەر خۆی دەچوو کە جار جار فرمێسك لە چاوەکانییەوە دەهاتە خوارەوە. هاوکات برینەکانی منیش دەکولیانەوە و دەنگی ئەو کەمانە دەبوو بە مرۆڤێك کە لە نێو دۆڵی دڵی مندا دەستی بە شین و رۆرۆ دەکرد.

ماریانا کچێکی کورتە باڵای ئیتالیایی، زۆر بێدەنگ و مەغروور بوو. برێك شێت و شەیدای کارە هونەرییەکانی روونی ببوو. کاتێك کە من قسەکانی نێوان روونی و ماریانام دەبیست هەستم بەوە دەکرد کە گوایا ئەوانە بە ساڵانە پێکەوە گەورە بوونە. ماریانا هیچ خۆی نزیکی من نەدەکرد و منیش هۆکاری ئەمەم بۆ ئەوە دەگەڕاندەوە کە لە وڵاتی رونسانسەوە هاتووە و خۆی لە سەر ئێمە گەورە دەکات. هەر کات کە دەرفەتی هەبوویایا باسی رۆشنبیرە راستینەکانی دەکرد و وشەکانی دانتە، کیمابوە، گیوتو و پەتراج بە هیچ شێوەیەك لە سەر زمانی دانەدەکەوتن. هەورا لەوانە بوو کە لە ساڵی ١٩٧٠کاندا روویان لە ئەورووپا کردبوو، بەرهەڵستکارێکی سەرنجراکیش و بەو رۆحە ماکیاڤلیستییانەی خۆیەوە لە دژی هەر شتێك دەردەکەوت و هاوکات دەیگوت ئەو پارت و رێکخراوانەی کە خۆیان لە پشتی کۆمەڵگەوە

حەشار داوەتەوە سەرچاوەی نایەکسانی و نابەرابەرین. دواتر دەستی بە گلەیی لە تەنیا بوون دەکرد و کاتێك کە دەیگوت" لەعنەت لەم شارەستانییەتە بێت، لەعنەت لەم ئەورووپایە بێت" دڵی بۆ خۆی دەسووتا. چاوەکانی زووتر لەکاتی خۆیدا چرچ ببوون و هیچ متمانەیەکی بە پیاوەکان نەمابوو و دەیگوت" ئەوان؟ دۆستیان بۆیان هەنگوینە و دوژمنی سەری منن". هەر چەندە رق و کینەی لە دەسەڵات دەبووەوە بەڵام زۆر بە باشی لەگەڵ دەسەڵاتدا را دەهات. ئەو شتانە و ئەو رووداوانەی کە بە سەریدا هاتبوون هەر هەموویان کاریگەرییان لە سەر رەنگ و دەنگی هەورا کردبوو. ئیپەك و بەرزان زۆر مرۆڤی ناشیاو و ئازار دەر بوون. ئیپەك کچی پارلەمانتارێکی پێشووی ئانکارا بوو. بێجگە لە شەرم نەکردن هەڵسوکەوتێکی دیکە کە سەرنجی رادەکێشا فۆبی (جۆرێکی خۆپەرست بوونە. وە) بوونی بوو. کاتێك کە چاوم بە ئیپەك دەکەوت ئەو قسەیەی خاتوو ژۆلییا کریستەڤ دەهاتە بیرم کە دەیگوت" شەرم نەکردن جۆرەیەکە لە قەیرانی نارسیزتیکە". هەمیشە لە نێو جل و بەرگە گران بەهاکاندا خۆی نیشان دەدا و دەیگوت" من ئیپەکم و بەجۆرە کە دەم بینی پێویستە بەجۆرەیش دان بە هەبوونی مندا بنێی و پەیوەندییەکانی من و مرۆڤەکانی دەوروبەرم بۆ من هیچ بایەخێکیان نییە. من زۆر رقم لەم کچە دەهات کە پارەی باوکی دەخوارد و فیزی دەکرد. کاتێك کە بە پێکەنینە شۆخ و شەنگەکانییەوە دەستی بە قسە کردن لەگەڵ روونیدا دەکرد منیش نەم دەتوانی لەسەر خۆم حاکم بم و دەستم بە پێکەنین دەکرد و بەرەو ئاشپەزخانەکەوە دەڕۆیشتم و دەستم بە کۆکردنەوەی ئەو قاپ و شتانە دەکرد کە وێنەی قارەمانە کۆنەکانی ئێرانیان پێوە بوو، ئەم وێنانە سەفەرەکەی من بۆ ئێرانیان بە بیرم دەهێنایەوە. بەراستی قەیرانی پێکەنین دەستی پێ دەکرد و ئەو شتانە کە گوترا بوون هەر هەموویان فەرامۆش دەکران. ئیپەك لەو کەسانە نەبوو کە ئابلووقە لە سەر رۆژ و کاتی خۆیدا بنێت و هەمیشە وا نیشانیدەدا کە بەو هێزە ئابوورییەی خۆیەوە دەتوانێت هەر شتێك بکات، هەر بۆیە زۆر شێت و شەیدای هاوڕێتی لەگەڵ خراپترین مرۆڤدا بوو و هەمیشەش باسی ئەجۆرە مرۆڤانەی دەکرد، چونکە پێویستی بەوە هەبوو کە سەرنجی ئەجۆرە مرۆڤانە بۆ لای خۆی رابکێشێت.

نێوانیان لەگەڵ بارزاندا زۆر خۆش بوو، بارزان چاوی دایکی خۆی بوو. لە کاتی پێشکەش کردنی زانیاری و راو کردنی کچ و ژناندا زۆر بە شێوەیەکی شارەزایانە هەڵسوکەوتی دەکرد. بارزان خەڵکی هکاری بوو، زۆر حەزی لە پارە و هێزی ئابووری و شیانی مرۆڤ دەکرد بۆیە بە هیچ شێوەیەك سڵاوی لەو مرۆڤە بێ شیانانە نەدەکرد. بارزان بەرگری لە بێ رەحم بوون دەکرد

و دەیگوت" کاتێك کە ژمارەی مرۆڤە خراپەکان زۆر ببێت ئەو کاتە بۆ ئەوەی کە مرۆڤە باشەکانیش بتوانن خۆیان بپارێزن ناچار دەبن کە هاوکات لەگەڵ خراپەکاندا لە ئامادەباشیدا بن". چەندین ناوی جۆراوجۆری هەبوو. بارزان کە دەرفەتی قسە کردنی بە هیچ کەس نەدەدا لە بەرانبەر زەینەبدا بێدەنگ دەبوو. لەو رێز و ئیحترامەش کە لە زەینەبی دەگرت منیش بڕێك دەبووم بە شەریك.

کاتێك کە ئاتولیە چۆڵ دەبوو روونی باوەشی بە منەوە دەکرد و ماچی دەکردم و داوای لێبووردنی لێ دەکردم. منیش سەرەتا وەکو پشیلەیەکی ماندوو مرمرم دەکرد و دواتر لە نێو دەستەکانی روونیدا هێور دەبوومەوە. لە بەرانبەر ئەزموونی روونیدا من هێشتاکە وەکو ئەو کەسانە بووم کە لە قۆناخی ناوەندیدا عاشق دەبوون. ئەم ناشارەزا بوونەی من زۆر بە دڵی روونی بوو و دەیگوت" دەزانی کە مرۆڤ لە کۆتاییدا بۆ لای ئەو کەسانە غار دەدا کە نزیکی خۆیەتین". کاتێك کە زەینەب بە مەبەستی سەردانی زاڤین دەڕۆیشت بۆ ئەمریکا سیسم دەبردە نێو ماڵی گچکەوەوە و کاتێك کە دەنگی سووڕانەوەی کلیدەکانم لە نێو قفڵەکاندا دەبیست هەر وەکو منداڵ لە خۆشیدا شێت دەبووم. بەر لەوەی کە ئەو پاڵتویەی کە بۆنی هەوای ساردی لێوە دەهات دەربێنێت پێ دەگوتم " وەرە با شەڕ بکەین" و لەو شوێنە کە رادەوەستان خۆمان درێژ دەکرد. لە دوای هەر راموسانێك ئێشێکی گەورە رووی لە من دەکرد و وردە وردە ئێشی سەرم گرانتر دەبوو و ئەو بارانە زەردە و بۆنی خەردەڵ بە بیرم دەهاتەوە...

هەمیشە لە کۆتاییەکانی حەفتەدا سەفەرمان دەکرد. لە نێو ئەو دارە بەرزە و دارستانە گەورانەدا، بۆنی شەوات و سووتاندنی دارستانەکان، گوند و شارە خاپوور کراوەکەی خۆمان بە بیرمان دەهێنایەوە.

من ئیتر فێری ریتمی کڵێسا، دەنگی شەمەندەفەر، حووتە حووتی سەگەکان و ئەو کەسانەی کە بۆ خۆیان لە نێو خۆیاندا خۆرخۆریان دەکرد ببووم. کاتێك کە هەر شار یا هەر دەڤەرێك شتێکی دیکەی نیشانی ئێمە دەدا، ئەو کاتەش ئێمە لەگەڵ ئەو ناسنامەی خۆمان کە نەماندەتوانی ئیفادەی بکەین لە نێو تەنیاییدا بۆ خۆمان بێدەنگ دەبووین. ئەو وڵاتانە کە ئێستا بوونە وەکو پارچەیەك لە جەنەت کێ دەزانێت کە چەندە شەڕ و کوشت و کوشتاریان بە خۆیانەوە بینی بوو. ئەم شارەی لیون کەم خۆڕاگری کرد، کەم بوو بە شاهێدی شەڕە خوێناوییەکان، بە راستی بۆنی خەڵووزی برونو دەهات....

کاتێك کە وردە پارچەکانی گەڵای دارەکان دەکەوتە سەر سەری رِوونی، من بە دەستی خۆم ئەو وردەگەڵایانەم لا دەبرد، هەر کات کە روونی حەزی لە گاڵتە کردن ببایا تۆزێك بێدەنگ دەبوو و گوێ خۆی خاوێن دەکردەوە و بە هاوارێکی پڕ لە خۆشەویستی دەیگوت " تۆ شێتی" و دەستی بە پێکەنین دەکرد. رۆژ لە دوای رۆژ خۆشەویستی نێوان من و روونی بەهێزتر دەبوو ئەو کاتە گرێدراو بوونی من بە زەینەب دەبوو بە رێز و ئیحترام بۆ زەینەب، لە راستیدا من پێویستیم بە سەربەخۆیی و تێکەڵ بوون لەگەڵ ئەوانی دیکەدا هەبوو. بێگومان ئەم پەیداویستییە لە نێو ژیانی کرداریدا رێگای خۆی دەزانێت و شتی هەرە راستیش هەر ئەمەیە.

بە هۆی ئەوەیەوە کە زەینەب زوو بە زوو بە مەبەستی بەشداری کردن لە کۆنگرە و کۆنفرانسە جۆراوجۆرەکان سەردانی ئەم لا و ئەو لای دەکرد من هیچ زەینەبم نەدەبینی و زۆر بۆی بێ ئارام دەبووم، بە هۆی ئەو پەروەردە و شتەباشانەیەوە کە منی فێر کردبوو، من خۆم بە قەرزاری زەینەب دەزانی. بۆ هەر شوێنێك کە رۆیشتبایا تەلەفونی بۆ من دەکرد و بەو هەڵسوکەوتە نەرم ونیانەی خۆیەوە هەوڵی دەدا دنیای رۆحی من بناسێت، بەجۆرە کاتێك کە بە یەکتر دەمانگوت" ئەلەو" ئیتر پێویست نەدەبوو زۆر قسە بکەین چون لە یەکتر و مەبەستی یەکتر بە باشی تێدەگەیشتین، من ئیتر منداڵێکی گچکە نەبووم بۆ زەینەب، بەڵکو هاوخەم، هاوکار و دۆستیی بووم.

نەماندەتوانی بە هیچ شێوەیەك سەردانی ماڵی گەل نەکەین. ئێمە لەو خول و دەورانەی کە بۆ پەروەردە کردنی ئەو ژنانە کە خوێندەوارییان نەبوو کرابوونەوە بەشداریمان دەکرد و تا رادەیەکیش هاوکاری ئەو ژنانەمان دەکرد. شێوەی جل پۆشینیان، شێوەی قسە کردن و پێکەنینیان بە گشتی یەکسان بوو. پیاوەکان هەمیشە چاکەتی سپی و پانتۆڵی بێ رەنگی قەدیفەیان دەکردە بەر و ژنەکانیش جلی گوڵداری رەنگاورەنگ. ریتم و تۆنی قسە کردنیشیان هەر وەکو یەك بوو. بەبێ ئەوەی کە ئێمەیش هیچ هەست بکەین، وەکو ئەوان دەستمان کرد بوو بە بەکار هێنانی وشەکانی وەکو" دەزانی هەڤاڵ، با راستییەکەت پێ بڵێم هەڤاڵ". لە نێو هەر ماڵێکدا گۆشەیەکی تایبەتی بە گڵێم و پووش و شتە هەرێمییەکانی دیکە و ئەو نامە و شتانەی کە لە گرتووخانەکانەوە ناردرابوون هەبوو، بێجگە لەمەیش گۆشەیەکی تایبەتی بۆ شەهیدانیش هەبوو کە بە وێنەی شەهیدان خەملێندرا بوو. ناوەرۆکی زۆربەی قسەکان بیرەوەرییەکانی سەر شاخ و سەردەمی گرتووخانە بوو. هەر کەس ناچار و محتاجی یەکتر بوو، ژیانی پەنابەری هەر چەندە ئیمکاناتی جیاوازیش بدابایا بە مرۆڤ، بەڵام هیچ کەس لەم ژیانە

رازی نەبوو. کاتێك کە بیر کردنەوە و هیچ بوون دەبوون بە عەزاب و ئازار، پەنایان بۆ رابردوو و تایبەتمەندییە رزگارکەرەکانی رابردوو دەبرد. لە نێو رووداوە نوێیەکاندا، کات و شوێن (زەمان و مەکان) تێکەڵی یەکتر دەبوون. ئەم تێکەڵ بوونەیش یا دەبوو بە هۆکاری، رەخنە گرتن و مۆرکر کردن یا دەبوو بە حەز کردنێکی لە رادەبەدر. ئەو ئەرزاق و خواردەمەنییانەی کە لە وڵاتەوە دەهاتن هیوا و ئاواتی هەر کەس بوون. کاتێك کە ئەو خواردنە هەرێمییانەی کە ئامادەیان کردبوون پێشکێشی یەکتریان دەکردن هەر هەموویان هەستیان بە شوور و شەوقێکی زۆر باش دەکرد و قسە کردنیش لەم کاتە ساتانەدا هەر سەبارەت بە بارودۆخی وڵات دەستی پێ دەکرد. هەندێکیان دەیانگوت، ئەوانەی کە خاوەن پەروەردە و کارێکی باشن، بارودۆخیان باشە، بەڵام هێشتاکە ئاستی نزمی پەروەردە و گوشاری سیاسی وای کردووە کە بارودۆخ بە گشتی خراپ بێت. دواتر هەندێکی دیکەیشیان دەیانگوت، پێویستە ئێمە هەوڵ بۆ باشتر کردنی بارودۆخی خۆمان بدەین، دایك و باوکانی ئێمە نەیانتوانی ژیانێکی باش بۆ ئێمە دابین بکەن، با ئێمە ژیانێکی باش بۆ منداڵەکانمان دابین بکەین، ئێستا چونکە ناتوانین وەکو ئەوان بە باشی بە زمانی فەرەنسی، ئەڵمانی یا ئینگلیزی قسە بکەین پێمان دەکەنن و بە هۆی نەزانی ئێمەوە شەرم دەیانگرێت.

ئەو رەنگ و رووە زەرد و رەشانە کە هەر وەکو پلاتین قژەکانی خۆیانیان رەنگ کردبوو، زۆربەی هەرە زۆریان گیرۆدەی ماددە بێهۆشکەرەکان ببوون و شەو و رۆژ لە نێو دیسکۆتەکاندا بوون. دایك و باوکانیش دەیانەویست کە منداڵەکانی خۆیانیان بە پەروەردەیەکی باشی سیاسی گەورە بکەن. زۆربەی جاران لە دانیشتنەکانی شەوانەی ماڵی گەلدا، وتووێژ و بەرنامەکانی پەروەردە دەبوون بە پۆلێك بۆ قسە کردن و مشتومڕی بێ کۆتایی، فلان کەس حەزی لە خۆشکی ژنی خۆیەتی، فلان پیاو لەگەڵ ژنێکی بیانیدا پەیوەندی هەیە، فلان ژن لەگەڵ پیاوێکی بیانیدا خۆشەویستی دەکات، کچی فلان کەس دەیەوەیست لەگەڵ کابرایەکی بیانیدا ژیانی هاوسەری پێك بهێنیت و خانەوادەکەی هەڕەشەی کوشتنیان لێ کردووە. ئەم جۆرە قسانەی هەر شەو لە نێو ماڵی گەلدا دووبارە دەکرانەوە. ئەو ژنانەی کە خاوەن جەسارەت بوون یا پەنایان بۆ رێکخراوەکانی ژنان دەبرد و یا بۆ هەمیشە خۆیان لە شوێنێکی دیکە بزر دەکرد. ئەو پیاوانەش کە قاچاخ بوون و نەیان دەتوانی بگەڕێنەوە بۆ وڵات، سەیری کاسێتی دەعوەتەکان و ئاهەنگەکانی بووك گواستنەوەیان دەکرد و یەکێك لە کچەکانیان پەسەند دەکرد و بە رێگای تەلەفوونەوە خۆشەویستی خۆیان بۆ یەکتر دەردەبڕی و دواتریش ژیانی هاوسەرییان پێك

دەهێنا. لە شەوی خەنەبەنداندا هیچ کەس وازی لە داب و نەریتە کۆنەکان نەدەهێنا و هەر جاریش چەند شتی دیکەیان پێوە دەکردن. ئەو کەسانەی کە زۆر سەرمایەدار بوون و دەعوەتێکی باشیان دەگێڕا، ئەو دەعوەتە بە ساڵان باسی لێوە دەکرا. ڕێورەسمێکی پێشکێش کردنی هەدییەکان ڕێورەسمێکی یەکجار سەرسوڕهێنەر بوو، ئەو ژنانەی کە قاچ و قولی خۆیانیان ڕووت کردبووەوە میکرۆفۆنەکەیان دەگرتە دەستەوە و هاواریان دەکرد، باوکی بووك دەستبەنی حەسیر، دایکی بووك دەستبەندی بۆرما... ئەم ڕێورەسمەکە بە ڕاستی دەبوو وەکو چیرۆکە کۆمیدییەکان. کاتێك کە دەستیان بە خوێندنەوەی ئەو تەلەگرافانە دەکرد کە لە گوتەبوورگ، گوتەنگەن و بوخۆمدا هاتبوون بە هۆی هەڵە خوێندنەوەی پەیامەکان دەکۆخیان و داوای لێبووردنیان لە ئامادە بووان دەکرد.

ئەو ڕەق و کینە کە لە بەرانبەر دەسەڵات لە ناخی مندا سەری هەڵدابوو دەتوانرا، لەگەڵ خۆشەویستی من بۆ دایکم باوك و کاکم و زەینەب بەراورد بکرێت. مەبەستم ئەوەیە کە من چەندە لە زینەب، دایك، باوك و کاکم حەزم دەکرد هەر ئەوەندەش ڕقم لە دەسەڵات دەبوویەوە. ئەم حەز کردنەی من لە زینەب و کەس و کارەکانم دەرفەتی نەدەدا کە تاریکییەکەی ناخی من، قووتم بدات. هەستی ڕۆحی و عاتیفی منیش لە لایەن ڕوونییەوە ببوو وەکو ڕەنگێکی پەمبەیی بۆم. بە شەوان کاتێك کە لە ژێر دەورپێچی ڕووناکییەکاندا سەیری ئەو سێبەرانەم دەکرد کە دەکەوتنە نێو گولەکەوە، ئەو بەساڵا چووانە کە لە نێو ئاسوودەیی و بێدەنگیدا بوون، ئەوانەی کە بۆ ئازادی مردنی خۆیانیان کڕی بوو و ئەوانەی کە لە پاشەوە مابوون بە بیرم دەهاتنەوە و دەمگوت" وڵاتی بە ساڵا چووان ! ئایا ئەمە ڕێکەوت و چارەنووسی من بوو؟ دواتر من بە دەنگێکی پڕ لە ماتەمینی بۆ خۆم هاوارم دەکرد. کاتێك کە لە نێو ڕستۆرانتە لووکسەکاندا چاومان بەو پیاوە باڵا بەرزە ڕەشانە دەکەوت، ڕوونی پیانی دەگوت بخۆین، ئەوەندە بخۆین تا بخنکێین.

لە بەرە بەیانییە پڕ لە هەوا خۆشەکانی ژنێڤدا زۆربەی جاران یا بە دەنگی زەینەب یا بە ماچ کردنی ڕوونی هۆشیار دەبوومەوە و کاتێك کە ئەو باڵندانە کە لە سەر دارەکانەوە دادەنیشتنەوە و دەستیان بە جیڕ جیڕ دەکرد منیش لە نێو سەوزایەتی ڕۆمانی خۆمدا نوقم دەبووم. من زۆر بە باشی فێری شکەشتنی شاخ و بۆنی قارچك و بۆنی پیسی خاك ببووم، کاتێکیش کە سەردانی پارکەکانم دەکرد، دەنگە دەنگی ئەو فاحیشە باڵابەرزە لەش ڕووتانە و ئەو ریزارڤاتیفە تەڕانەی کە لە ژێر پێمدا دەخزیان منیان زۆر تووڕە دەکرد. ئەو کاتەی کە

شەپۆلەکانی دەریا بە ئارامی و هێمنی خۆیانیان بە بەردەکانەوە دەدا چەندین هەست و بیر کردنەوەی تێکەڵ مێشکی منیان داگیر دەکرد، ئێش و ئازار و خۆشەویستیش پێکەوە گوشاریان دەخستە سەر مێشك و رۆحی منەوە و منیش لەم کاتە ساتانەدا بیرم لە سەرنج راکێش و ئەستەم بوونی ژیان دەکردەوە. کاتێك کە سەردانی ماڵی گەلیشم دەکرد، گفتوگۆ و مشت ومڕە گەرمەکانی نێو ماڵی گەلیش هەر وەکو شەپەزللەیەکی خۆی بە روخساری مندا دەدا. من زۆر بە ئاسانی لەگەڵ گەریلاکاندا پێك دەهاتم، چونکە سەبارەت بە زۆربەی شتەکان خاوەن یەك بیروبۆچوون بووین. زانا بوونی گەریلاکان و هەستی چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەوانی دیکە و هەستی رێز گرتن لە بیروڕاکانی دیکە لە لایەن گەریلاکانەوە شتێکی زۆر باش و ئیجابی بوو. بە بێ هیچ شەرت و مەرجێك گەریلاکان زۆر رێز و ئیحترامی زەینەبیان دەگرت و منیش لەم رێز و ئیحترامانەدا بێ بەش نەدەبووم. هەڤاڵ عوسمان کە خەڵکی دەرسیم بوو جارێکیان بە بێ ئەوەی کە دەست بە پێکەنین بکات وتی" مامۆستا زەینەب ئەگەر کورد بووبایا ئەوەندە رێزی لێ نەدەگیرا".

جیابوونەوە لە شاخ و رووکردنە شارەکانەوە هەر وەکو ئەوە بوو کە ماسییەك لە دەریادا جیا ببێتەوە و بکەوێتە نێو وشکاییەوە. ئەو تەنیاییانەی گەریلاکان کە تا ئێستا ناوی لێ نەنراوە و ئەو گەریلایانەی کە بوونەتە وەکو پارچەیەك لە ناسنامەی خەڵك، بە هیچ شێوەیەك لەو متمانە و ئیمانەی خۆیان کە بە راستییەکان و مافەکانی خۆیانەوە هەیانبوو وەرەز نەدەبوون و لە نێو کۆڵانەکانی ئەورووپادا گەڵای داران لە وەرزی پایزدا هاتوچۆیان نەدەکرد. هەر چەندە کە بێ خەوی لە نێو چاوەکانیانەوەی دیار بوو بەڵام لە گفتوگۆکردن لە سەر مێژوو مەتۆلۆژی، ئەدەبیات، تۆتەم (مەبەست ئەو خوداوەندانەیە کە لە سەردەمانی پێشوودا لە لایەن هۆزەکانەوە وەکو خوا عیبادەتیان بۆ کراوە، یا خوداوەندی هۆزەکانە. وە) و تابۆکاندا هیچ تێر نەدەبوون. بە راستی من هیچ لە گفتوگۆ کردن لەگەڵ سەید و^ دەلیل و سەکینە و دیلاندا کە هیچ بایەخێکیان بە خۆشەویستی پلاتۆنیك نەدەدا تێر نەدەبووم. هەبوونی ئەوان کە هەبوونێکی بێ ریا و بەبێ فرتو فیڵ بوو، هەریەك وەکو جیهانێکی دیکەی جیاواز بوو. بە هۆی متمانەی ئەوان لە بەرانبەر زەینەبدا، منیش توانیم کە لە نزیکەوە ئەوان بناسم. سەیدو بە هۆی بریندار بوونییەوە نەیدەتوانی لە سەر ویلچەیر (کورسی خاوەن تایە یا ئەو کورسییە کە مرۆڤە زەلیلەکان بەکاری دەهێنن.وە)دا دابەزێت. هاوکات سەیدو رۆژنامەوانێك بوو کە لە وڵاتدا رووبەرووی هێرشی هێزەکانی دەوڵەت ببووتەوە. سەیدو هەمیشە دەیگوت" ئەگەر ئەو

ڕۆژە بێت کە بتوانم لە سەر قاچ و پێی خۆم ڕابوەستم، بەبێ پشوودان بە سەد هەزاران کیلۆمەترە پیاسە دەکەم. دەلیل کە بۆ خۆی ئەندازیاری مەکینە بوو، دایك و باوکیشی مامۆستا بوون، دەلیل بە هۆی جەستە و ڕەنگ و ڕوویەوە برێك وەکو دانیشتوانی ئەوروپا بوو. سەکینە خۆش قسە و خۆش گاڵتە بوو. کاتێك کە دەلیل دەستی بە لێدانی گیتار دەکرد سەکینەیش بە دەنگی خۆی هاوکاری دەلیلی دەکرد. دیلان هیچ قسەی نەدەکرد و هەمیشە بێدەنگ بوو، کاتێك کە سەیری ئەو چاوانەم دەکرد کە بە هەزاران نهێنییان لە نێو خۆیاندا حەشاردابووەوە تۆزێك لە هەڵسوکەوتی دیلان بێزار دەبووم.

جارێکیان سەردانی ماڵی هەواڵانم لە بەرانبەری دارستانەکەدا کرد، دارە تەڕەکان و گوڵ و گیاکانی نێو باخچەی ماڵەکە، ماڵی سەردەمی خوێندکار بوونی منی بە بیرم هێنایەوە. کتێبەکانی نێو ماڵ، وێنە جۆراوجۆرەکان و وتە ماناداڕەکان کە بە دیواری ماڵەکەوە هەڵواسرابوون مرۆڤیان دەبرد بۆ جیهانێکی دیکەی زۆر جیاواز. لە یەکێك لە ژوورەکاندا وتەیەکی زۆر باش نووسرابوو" ئەو زانا بوونە کە لە ناخی تۆدا گەورە نەبێت هیچ سوودێکی بۆ تۆ نییە".

لە نێوان ئەو نووسەرانەی کە پەنابەر بوون و بەڕێوەبەرەکانی ماڵی گەلدا هەمیشە ناکۆکی هەبوو. زۆربەی بەڕێوەبەرەکان خاوەن ئاستێکی نزم و کەم لە زانیاری بوون و کاتێکیش کە ئەم زانیارییە کەمانەیان تێکەڵی هەست و غرووری فەودالی خۆیان دەکرد بەراستی ئەو کاتە مرۆڤ نەیدەتوانی لەگەڵیاندا وتووێژ بکات. بۆیە نووسەرەکان هەر چۆنە بایەخیان بە تێڕوانینە ماوە بەسەرچووەکانی ئەوان نەدەدا هەر بەمجۆرەش نەیاندەویست کە لێیان تێبگەن. هاوکات بەڕێوەبەرەکانیش نووسەر و ڕۆشنبیرەکانیان بە بێ نرخ و قیمەت کردنی نرخەکان تاوانبار دەکرد و دەیانگوت هیچ ناتوانن خۆیان لە بەرامبەر یەك ڕەخنە ڕابگرن و بە چاوی تام و چێژێك سەیری ئەدەبیات و هونەر دەکەن. ئەوان وەکو ئەو مێشەی سەر ئەسپانن کە ئاو تێکەڵی ئاشی کۆڵاوی ئێمە دەکەن.

ئەو کاتە ئەوانەی کە هەر شتێکیان دابوو بە لایەکەوە سەربەنیست دەکران، ئەوانەی کە برێك لە ڕووی سیاسییەوە تێگەیشتیتر بوون خۆیان نە لە مزگەفت دوور دەکردەوە و نە لە کڵیسا. ئەو کۆمیتانە کە بە مەبەستی چارەسەر کردنی ناکۆکییەکانی نێوان خانەوادە و هۆزەکاندا دامەزرابوون، زۆربەی جاران هاوکاری ئەوانەیان دەکرد کە ڕووبەڕووی کێشە یا قەیرانێك دەبوونەوە. چونکە لە نێو ئەم جۆرە کۆمیتانەدا نە بایەخێك بە زانستی کۆمەڵناسی و دەروونناسی و یاساکانی دەوڵەت دەدرا و نە بۆ چارەسەر کردنی هیچ کێشە و قەیرانێکیش یاسا

و دادگاکانی دەوڵەت بە سەر دەکرانەوە. تۆڵە سەندنەوەی ئەو ژنانە کە لە وڵاتی خۆیاندا لە دەست مێردەکانیانەوە لێدانیان دەخوارد ببوو بە هۆکاری سەرهەڵدانێکی بەرفراوان. ئەو پیاوانە کە نەیاندەتوانی ئەم شتانە قەبووڵ بکەن یا دەستیان بە پەیڕەو کردنی توند و تیژی لە دژی ژنان دەکرد یا بە ناچاری لەگەڵ ژنێکی بیانیدا ژیانی هاوسەرییان پێکدەهێنا. ئەو پیاوانە کە لە نێو ماڵی خۆیاندا هاواریان دەکرد و دەسەڵاتی خۆیانیان فەرز دەکرد لە لای ژنە بیانییەکاندا هەر وەکو ئەو پشیلانەی کە شێریان رژاندبێت بێدەنگ دەبوون و دەبوون بە پیاوێکی باش بۆ ماڵ و خێزانی خۆیان. من هیچ نەمدەتوانی ئەم شتە قەبووڵ بکەم، چونکە ئەم جۆرە پیاوانە زۆر رێز و ئیحترامی ژنە ئەوروپاییەکانیان دەگرت و لە بەرانبەریدا زۆرترین بێ ئیحترامی و بێ رێزییان بە ژنانی وڵاتی من دەکرد. ئەو پیاوانەی کە لە بەر ترسی ژنە ئەوروپاییەکان دەستیان بە هەر کارێك دەکرد و بەڵام بۆ ژنانی وڵاتی خۆیان وشەی زۆر قیزەون و بێ رێزیان بەکار دەهێنا لە بەر چاوی من کەوتبوون و منیش زۆر رقم لێیان دەبوویەوە. هیچ فەرق و جیاوازییەك لە نێوان نەخوێندەوار و مرۆڤە زاناکاندا نەبوو. ئەوانەی کە هەر رۆژ هاوار و پرۆپاگەندەی مارکسیزم و یەکسانییان دەکرد لە راستیدا لە هەڵسوکەوتی خۆیان لەگەڵ ژنەکاندا دەمامکێکی زۆر گەورەیان دەکردە سەری خۆیانەوە. کاتێك کە ئەم جۆرە پیاوانە رەخنەی ژنەکانیان رەچاو دەکرد هاوکات هەوڵی ئەوەشیان دەدا کە دڵی ژنە رۆشنبیر و تێگەیشتووەکانیش بۆ لای خۆیان رابکێشن. جارێکیان کاتێك کە یەکێك لە چەپڕەوە کۆنەکان هاتبوو بۆ ماڵی گەل، سەکینە کە هەستی بە مەبەستی ئەم کابرایە کرد وتی" باشە زۆر باشە بەڵام ئەمە چ رۆمانسییکە یەعقووب.... ئایا هاوسەرەکەت دەرفەتی ئەوت پێ دەدا کە لەگەڵ ژنێکی دیکەدا پەیوەندیت هەبێت؟". کاتێك کە سەکینە ئەم پرسیارەی پرسی، ئەجنە لە سەر و روو و دەموچاوی کابرای چەپڕەوی دا و وتی" ژنی من بە هیچ شێوەیەك شتێکی بەمجۆرە ناکات". شانۆگەرە هۆشیارە عاقڵە، بەو جۆرەی کە بڵێ " هەی ساختەکار ماشینەکەت لەوێ لا بدە" سەیری کابرای چەپڕەوی کرد و دواتر دەستی بە ئامادەکارییەکانی خۆی بۆ پێشکێش کردنی شانۆ کرد. ئەوانەی کە ئیدیعای مارکسیست بوونیان دەکرد هەر یەکە و یاریزانێك زۆر باش بوون. (مەبەست ئەکتەرە. وە) کاتێك کە ئێمە رەخنەمان لە پیاوەکان دەکرد، یەعقووبیش لە وەڵامی رەخنەکانی ئێمەدا دەیگوت" من لەو پیاوانە نیم" و دەستی بە بڵاوکردنەوەی شتەکان بە سەر ژناندا دەکرد. یەعقووب زۆر بە باشی دەیزانی زمانی نەزاکەت و سادەیی بەکار بهێنێت چونکە دەیزانی ئەمە خاڵێکی زۆر لاوازی هەر هەمووی ژنانە. جارێکیش یەعقووب هەوڵیدا خۆی

نزیکی من بکاتەوە. سەرەڕای ئەوەی کە تەمەنی لە من گەورەتر بوو بەڵام کاتێك کە لەگەڵ مندا قسەی دەکرد دەلەرزیا و چاوەکانیشی ترسیان پێوە دیار بوو، بە تایبەتی کاتێك کە دەیەوەیست لە لای مندا دابنیشێت. بە تایبەتی کاتێك کە خاتوو ئویا ئەو هاوسەرەی کە ئێش و ئازار و مەینەتییەکانی ساڵانی زیندان بە روخسارییەوە دیار بوو، لەگەڵ یەعقووبدا سەردانی ماڵی گەلی دەکرد، یەعقووب بەو جۆرەی کە گاڵتە بە ئویا بکات دەستی بە پێکەنین دەکرد. ئاخ من لەم کاتە ساتانەدا چەندە رقم لە یەعقووب دەبۆوە! من بە چاوی خۆم سەیری خاتوو ئویام دەکرد و لە ناخی خۆمدا پێم دەگوت" رێز و ئیحترامی من بۆ تۆ هەیە خاتوو ئویا" یەعقووب گەوادێکی سیاسی و دامەزرێنەرێکی ساختەی پرولەتەریا و نەیاری ژنان بوو. زیاتر لەوەیش ئەگەر لێپرسینەوەیەکی باشی لەگەڵدا کرابایا بێگومان فاشیستیش دەردەچوو. ئەوانەی کە سەردانی ماڵی گەلیان دەکرد ناچار بوون کە بە باشی یەکتر بناسن و زانیاری باش سەبارەت بە یەکتر کۆ بکەنەوە و پەیوەندییەکی باشیانیش لەگەڵ یەکتردا هەبێت. من زوو لەگەڵ ئەم رێورەسمانەدا راهاتبووم، رێوەرەسمێکی تایبەتی بوو. ئایا دەکرا وەکو دەسەڵات کۆمەڵگایەك لە دەرەوەی دەسەڵات دابمەزرایا؟ ئایا ئەم جۆرە بیر کردنەوە کە لە نێو ئێمەدا پەرەی سەندبوو ،دەبوو بە هۆکاری لاواز بوونی رق و کینەی ئێمە لە دژی دەسەڵات؟ هەر چەندە رق و کینەیشمان لە دەسەڵات بووبایا بەڵام بە جۆرەیەکیش دەبوایا پەیوەندیمان لەگەڵ دەسەڵاتدا ساز بکردایا. کاتێك کە بیروڕاکانی نێو مرۆڤ دەبوون بە شەڕ و پێکدادان لە نێو مێشکی مرۆڤدا، دەبوایا سەری خۆمان بۆ ئەو هەبوونەی کە ناسنامەی ئێمەی بەرەو نەمان دەبرد خوار بکردبایا، لە نێو گۆلی سەردانەواندندا چشتێکی قیزەون هەیە حەشار درابوویەوە. لە کات و ساتێکی بەمجۆرەدا من لە ژێر ئەو بیروڕا جیاوازانەدا کە رەنگ و روخساری خۆیانیان دەگۆڕا نوقم دەبووم، و هەر شت واتا و مانای خۆی لە دەست دەدا و لە سەر تاپای دەبوو بە تاوان. ئەو کاتە منیش هاوارم دەکرد کە کاشکە ئەوەندەم نەزانیبایا و هەستم بەم شتانە نەکردبایا. لەو لای زەمین لەرزەکەی ناخی دڵمەوە، هەست و حسەکانی خۆم دەخستە گەڕ و بیرکردنەوە بە مانای لێپرسینەوە و گوێبیست کردن بوو. لە شەوانی ماڵی گەلدا کە پڕ بوون لە بۆنی چای، قەهوە و بەهاراتی جۆراوجۆر، خۆم لە نێوان ئەو ژن و پیاوانە دا دەدیت کە بە مەرگی یەکتر سوێندیان دەخوارد و لە مەرگی یەکتریش بێزار بوون، ئەو کەمینانەی کە ژنەکان بۆ یەکتر دایان دەنان و ئەو شەڕەی دەسەڵات کە پیاوەکان لە دژی یەکتر دەیانکرد، ئەو جوانانەی کە بە هۆی خۆشەویستییەوە بە یەکترەوە گرێدرا بوون، ئەو دایکانە کە منداڵەکانی

خۆیانیان لووس دەکرد، ئەو ژنانە کە هەوڵیان دەدا دەسەڵاتی دژی ئەو پیاوانە کە ستەمیان لێ دەکەن بەهێزتر بکەن، هیچ لە فەرقی ئەوەدا نەبوون کە نێوانی هەبوون و نەبوونیان درێژتر کردووە، ئەو ژنانەی کە ترس و دڵەڕاوکێکانیان ببوون بە دەسەڵاتێکی جەستەیی، هیچ ئاگاداری ئەوە نەبوون کە ئێش و ئازاری ئەو راستییانە دەکێشن کە بوونە بە ترسی بێ بنەما. هەر بەو جۆرە کە لە نێو کولتوور و داب و نەریتەکی بەرتەسك و دیار و نەگۆڕدا هاتبوون، هەر بەمجۆرەش بە پەروەردەیەکی بە شێوەی جەماعەتی لە نێو ئەو راستییە موتڵەق و بە بێ گۆڕانکارییانەدا لە نێو ئەتمۆسفەرێکی سەر داخراودا مابوونەوە و لەم بارەیەوە هیچ هەستیان بە خۆیان نەدەکرد و بارودۆخەکەشیان هەڵنەدەسەنگاند. ئەمە لە کاتێکدایە کە راستی زۆرینە و بێ کۆتایی بوو. و واقیعیەتیش کاتێك دەستی پێ دەکرد کە راستییەکان کۆتاییان پێ دەهات. بەڵام هیچ کەس هێز و توانای ئەوەی نەبوو کە چەند هەنگاوێك بەرەو ئەم سەرەتایەوە بنێت. لەو پەنابەرانەی کە لە هەر چوار لای جیهانەوە هاتبوون شتی زۆرتر لەو کتێبانە کە دەمخوێندنەوە فێر دەبووم. هەر بەو جۆرەی کە واقیعیەت بەرهەمی مێشکی یەك مرۆڤ نەبوو، هەر بەمجۆرەش بیرم لەوە دەکردەوە کە بۆ تێگەیشتن لە راستییەکان پێویستە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە لە راستییەکان تێدەگەن ژیان بکەم.

کاتێك کە زەینەب دەستی بە لێکۆڵینەوە لە سەر مەتۆلۆژیای ژن کرد ئەو کاتە بە هیچ شێوەیەك لە نێو کتێبخانەکاندا دەرنەدەچوو و من زۆر بیری زەینەبم دەکردەوە. ئەو کاتەی کە بڕێك ترسم لە سەرخۆبوونی ژنێك بە تەنیا هەبوو، هەمیشە دەمەویست وەکو منداڵ لە نێو باوەشی زەینەبدا بم. من ئیتر کۆرپەڵە گچکەیەکی زەینەب نەبووم بەڵکو ببووم بە هاوکار و هاوڕێی زەینەب، بەڵام من هیچ هەستم بەمە نەدەکرد. خۆشەویستییەکی من لە بەرانبەر روونیدا بە هیچ شێوەیەك نەیدەتوانی ئاستی خۆشەویستییەکەی من لە بەرانبەر زەینەبدا تێپەڕ بکات. من دەمزانی کە بۆچی زەینەب سەبارەت بە خۆشەویستی من و روونی هیچ شتێك لە من ناپرسێت. زەینەب دەیەوەیست من ببم بە خاوەن هێزێك کە بتوانم باری ئێش و ئازارەکانی خۆم پێ هەڵبگرم. زەینەب هیچ حەزی لە گۆشەگیری و تەنیایی نەبوو، کاتێکیش کە خۆشەویستی دەکرد بە هیچ شێوەیەك بە یەکجاری خۆی رادەستی خۆشەویستی نەکرد و بە مەبەستی هەڵبژێنەر بوون هەوڵی دەدا کە ژیانی هاوبەش و ژیانی هاوسەری بکاتە قۆناخێك بۆ بەرهەم هێنان.

له شه‌وه ته‌ماوییه‌كانی ژنێڤدا كاتێك كه‌ روونی له‌ نێو ئاتولیه‌كه‌ی خۆیدا نوقمی ره‌نگه‌كان ببوو منیش سه‌رقاڵی فێربوونی زمانی فه‌ره‌نسی بووم. ده‌بوایا من ئه‌و تراژدیایه‌ی دابرانم له‌ ناخی خۆمدا به‌ خێو بكردبایا، به‌ پێچه‌وانه‌وه‌ هیچ بوون سه‌رتاپای منی داگیر ده‌كرد. كاتێك كه‌ گزه‌ گزی مه‌كینه‌ی قه‌هوه‌ و ده‌نگه‌ ده‌نگی ماشینه‌كان و زه‌نگی شه‌و تێكه‌ڵی یه‌كتر ده‌بوون و ده‌ستكاری هه‌سته‌ په‌شێوه‌كانی منیان ده‌كرد، من هه‌ستم به‌ غه‌ریب بوون و ئه‌و شتانه‌ی كه‌ له‌ بیرم نه‌كردبوون و یا هه‌ستم به‌ فه‌رامۆش كردنیان كردبوو به‌ یه‌كجاری ده‌بوون وه‌كو تۆپێكی به‌رف. له‌م كاته‌ ساتانه‌دا منیش ده‌پرسیم كه‌ ئایا فێربوونی زمان یا زانان بوون چه‌ سوودێكی هه‌یه‌. دواتر له‌و مه‌كینه‌یه‌ كه‌ تێدا قه‌هوه‌كه‌ ده‌كولاً تووره‌ ده‌بووم و بۆ ئه‌و سه‌بر و سه‌بوورییه‌ بێ كۆتاییه‌ی روونیش سه‌رم سوڕ ده‌ما و دواتریش كه‌ ده‌وری گریانم هاتبوو هاوارم ده‌كرد" هه‌ی خۆ په‌ره‌ست، هه‌ی خۆپه‌ره‌ست". له‌م كاته‌دا روونیش به‌و تێڕوانینه‌ی خۆیه‌وه‌ كه‌ له‌ دنیای ده‌ره‌وه‌دا دابڕابوو و ده‌ستی به‌ ماچ كردنی من ده‌كرد و ده‌یگوت" كچه‌ شێته‌" و ده‌كه‌نیبیا. منیش هه‌ر وه‌كو منداڵه‌ گچكه‌كان ده‌ستم به‌ گریان ده‌كرد و فرمێسك و ئاوی لووتی خۆم به‌ كراسه‌ نوێیه‌كه‌ی به‌رم خاوێن ده‌كرده‌وه‌، كه‌ روونی گوتی" دایكی منیش جارجار به‌م شێوه‌یه‌ لووتی خۆی خاوێن ده‌كرده‌وه‌ ده‌ستمان به‌ پێكه‌نین ده‌كرد. به‌و ده‌سته‌ به‌ هێز و وشكانه‌ی خۆی سه‌ر و ملی منی ده‌شێلا و جار جاریش ماچێكی له‌ قاچی من ده‌كرد. ئه‌وه‌نده‌ متمانه‌ی به‌ خۆی هه‌بوو كه‌ به‌ هه‌ڵسوكه‌وتی خۆی ده‌یه‌ویست بڵێت كه‌ " ئه‌م ده‌سته‌ وشكانه‌ی من باش ده‌زانن كه‌ چۆنه‌ حه‌زت لێ بكه‌ن". بێگومان كاتێك كه‌ له‌م مه‌به‌سته‌ تێده‌گه‌یشتم ده‌ستم به‌ پێكه‌نین ده‌كرد. شه‌وێك دوو كارتۆن مۆزی په‌نجه‌یی هێنابوو و به‌ شوور و هه‌یه‌جانێكی یه‌كجار زۆر باسی داگیركردنی باڵاخانه‌ی نه‌ته‌وه‌یه‌كگرتووه‌كانی له‌ لایه‌ن هاورێكانییه‌وه‌ ده‌كرد و مۆزی ده‌خوارد. من چاییم ئاماده‌ كردبوو و كاتێك كه‌ ویستم له‌ نێو سه‌وڵدانه‌كه‌دا (سه‌لاجه‌) شتێك بێنم وتی" من تێر بوومه‌وه‌ و پێویسته‌ تا به‌هار تابه‌لاكانم ته‌واو بكه‌م". دوای ئه‌م وتانه‌ یه‌كسه‌ر چووه‌ته‌ سه‌ر مێزه‌كه‌وه‌ و منیش له‌ نێو سه‌رسوڕماییدا هه‌ر وا سه‌یرم ده‌كرد. یه‌ك مۆزیشی نه‌هێشتبوو. جارێكی دیكه‌ من ده‌ستم به‌ هاوار كردن كرد " هه‌ی خۆ په‌رست، هه‌ی خۆپه‌ره‌ست". ئا به‌ راستی له‌ ژێر هه‌ندێك شتی زۆر گچكه‌دا واقیعیه‌تی زۆر گه‌وره‌ ده‌شاردرێته‌وه‌؟... من برێك بۆ خۆم دڵخۆر بووم. بیرم له‌ باوكم ده‌كرده‌وه‌ كه‌ هه‌میشه‌ باشترین شتی بۆ دایكم ده‌هێنا. جارێكیان له‌ به‌غداوه‌ مێوانێكمان بۆ هاتبوو و له‌گه‌ڵ خۆیدا پاقلاوا و كۆلای هێنا بوو، باوكیشم بۆ ئه‌وه‌ی كه‌ ئێمه‌ تێر بخۆین وتی" حه‌زم له‌م جۆره‌ شتانه‌ نییه‌، به‌ هۆی ئه‌وه‌یه‌وه‌ كه‌ ئێمه‌ له‌ مه‌به‌ستی

باوکم تێدەگەیشتین هیچ زۆرمان لە باوکم نەدەکرد کە بخوات. لە هەڵسوکەوت و کۆخ کۆخینەکانی من روونی تێگەیشتبوو کە شتێك رووی داوە. کاتێك کە روونی پرسی" چییە چیت بووە؟" منیش هەر دوو لنگی خۆم دا بە زەوییا و بە دەنگێکی پڕ لە ماتەمینی وتم" بێجگە لە خۆت و وێنەکانت بیر لە هیچ شتێکی دیکە ناکەیتەوە، یەك موژت بۆ من نەهێلایەوە". کاتێك کە روونی وتی" ماوەیەکی زۆرە بە تەنیا دەژیم و هیچ هەستم بەم شتانە نەکردووە بۆیە داوای لێبووردنت لێ دەکەم". منیش تۆزێك خۆم هێمنتر کردەوە. روونی قسەی راستی دەکرد و پیاوێکی پاك بوو. باسی پێکهنانی ژیانی هاوسەری خۆی لەگەڵ یەکێك لە خزمەکانی خۆی بە زۆری دایك و باوك کرد و وتی" راستە پیاو بووم ئەو کاتە بەڵام ئەوەندە هێزم نەبوو کە ئەم جۆرە ژیانە پەسند نەکەم، خوا دەیزانی چۆنە لە لایەن خانەوادە و مەلا و خزم و کەس و کارەکانەوە دەورپێچ کرابووم، بۆیە تەنیا چارەم ئەوە بوو کە بێم بۆ ئەورووپا". روونی لە درێژەی وتەکانیدا وتی" کاتێك کە ئێوارەیەکی درەنگ چوومەوە ماڵەوە، لە بەردەرگای ماڵمان دەهۆڵ و زوڕنایان لێدەدا و جەماوەرێکی زۆریش کەیف و شاییان دەکرد، لە دەهۆڵچییەکەم پرسی چییە، دەهۆڵچی لە دەوری خۆی سووڕایەوە و دواتر یەکێك لە نێو جەماوەرەکەدا هاتوو دەستی منی گرت و منی بردە نێو ژوورێکەوە، کە سەیرم کرد بووکی دەست و پەنجە بە خەنە برێك تووڕەیە و دەڵێ" پێتەوە دیارە کە حەزت لە من نییە". کاتێك کە بارانێکی بەهێز دەباری و خۆی بە پەنجەرەی ژوورەکەوە دەدا، بووکیش رابوو و سۆبەکەی پێخست و منیش هەر وێنەم دەکێشا، ئەو کاتە جاهێڵ بووم، هێشتا منێ ژنم نەدیتبوو، چەند مانگی سەرەتایی بەجۆرە تێپەڕ بوون کە چاوم کردەوە یەکساڵ بە سەر ئەم مەسەلەیەدا تێپەڕیوە و دواتر هاتم بۆ ئەورووپا... ئەو کاتەی کە روونی باسی لە سێ منداڵەکەی خۆی دەکرد من وام دەزانی کە باسی هاوڕێکانی خۆی دەکات. روونی لەگەڵ سێ یا چوار ژندا ژیانی هاوسەری پێك هێنابوو، یەکەمینیان لە گوند و لە خزمەکانی خۆی بوو. لە نێو ماڵی گەلدا پەیوەندی نهێنیشی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا ساز کردبوو. روونی خۆی دەڵێ" یا نەمتوانی سەرکەوتن بە دەستەوە بهێنم یا حەزم لە پێکهێنانی ژیانی هاوسەری نەبوو". دواتر لەگەڵ چەند کچی ئیتالی و فەرەنسیشی بە بێ هیچ جۆرە خۆشەویستییەك پەیوەندیم ساز کردووە. روونی دەڵێ" من لەم کچە ئیتالی و فەرەنسییانە زۆر شت فێر بووم بەڵام نازانم هۆکارەکەی چییە کە ناتوانم لەگەڵیاندا بگونجم، ئەوان زۆر گرێدراوی یاسا و بە بێ هەستی رۆمانسینە، بۆیە ئێمە پیاوەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بۆ ئەوان هەر وەکو ئەسپی زاو و زینە.

ڕۆشەن کە یەکێك لە خاوەن کارە کۆنەکانی ڕوونی بووە، شەوێکیان بە مەبەستی قسە کردن لەگەڵ ڕوونیدا تەلەفۆنی کردووە و لە دەنگە پەشێواوەکەیدا دیار بوو کە چەندین هەستی جیاوازی لە نێو خۆیدا بە خێو کردووە. ڕوونی وتی، دوای یەکەمین جار کە دەستمان بە قسە کردن کرد زوو بە زوو ڕۆشەن تەلەفۆنی بۆ دەکردم. هەر جار بەو تۆنە جیاوازانەی دەنگەکانیەوە هەستی بەوە کردووە کە یەکێکە لەو ژنانە کە دەیەوێ تەلەفۆنەکە زوو دابخات. ڕوونیش بە هیچ شێوەیەك نەیتوانی بوو لە سەر ڕۆحی خۆیدا زاڵ ببێت. ڕوونی سەرەڕای ئاستی بەرزی زانا بوونی خۆی، بەڵام بە هۆی ئەوەیەوە کە زوو فریوی ئەو کەسانەی دەخوارد کە بە دوای شتی پڕ و پووچدا بوون، هیچ هەستی بەم ناکۆکییە گەورەیە نەکردووە. هەر چەندە چاوەکانی ڕوونی سەیری منیان دەکرد بەڵام ڕۆحی ڕوونی وای دەسەلماند کە ڕوونی شێت و شەیدای ڕۆشەنە. ڕوونی جارێکی دیکە وتی" ئەم شەو ئەو ژنە شێتە جارێکی دیکە تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی بە هیچ شێوەیەك وازم لێ ناهێنێت". کاتێك کە ڕوونی ئەم قسانەی دەگێڕایەوە بە لا چاوەوە سەیری منی دەکرد. من بە باشی ڕوونیم نەدەناسی، بۆیە بە پێی ئەو شتانەی کە ڕوونی باسی دەکردن منیش هەوڵم دەدا ڕۆح و دەروونی ڕوونی بە باشی بناسم. ئەمە لە کاتێکدایە کە ڕوونی هەمیشە هەوڵی ئەوەی دەدا کە باسی ئەو ژنانە بکات کە عاشقی بوونە. من هیچ لەو کەسانە کە بە شێوەیەکی یەك لایەنە حەزیان لە یەکێکی دیکە دەکرد تێنەدەگەیشتم. ئاوات و خۆشەویستیش خۆشەویستیان لێ دەکەوتەوە. ڕوونی چەند نامەیەکی ڕۆشەنی نیشانی من دا. لەو وشە و ڕستانەی کە ڕۆشەن بەکاری هێنابوون تێگەیشتنم لەوەی کە ڕۆشەن ژنێکی ماجەرا پەرەست و ژنێکە کە بۆ خۆشەویستی برسییە هیچ ئەستەم نەبوو. ئایا لە دەوری خۆیدا سووڕانەوە و پێچەوانە کردنی شتەکان بۆ مرۆڤ ڕێگا چارە بوو؟ بەڕاستی زۆر من پێم ناخۆش بوو کە هاوجنسێکی من ئەوەندە خۆی بۆ پیاوێك سووك و بەبێ نرخ بکات. جار جار ڕوونی دەیگوت" ئەم ژنانە چەندە سادە و برسی خۆشەویستین". لەم کاتە ساتانەدا من برێك تووڕە دەبووم و دەمگوت" ئێستا ڕاستی هەست و جۆری بیر کردنەوەی تۆ ئەوەیە". من زۆربەی جاران لەوە پەشیمان دەبوومەوە کە بە ڕوونیم دەگوت تۆ پیاوێکی زانا و تێگەیشتوویی. هۆکار و سەبەبی هەر شت وردە وردە بۆ من ڕوون دەبوویەوە. جیا کردنەوەی ئەم شتانە وردە وردە تەنیاییەکی تایبەت بە خۆی دەخوڵقاند. ئەم جۆرە نێوانانە و جیابوونەوانە بۆ خۆیان جۆرە هاوسەنگی و گەشبینی و بەرگری کردن لە خۆ بوو بەبێ ئەوەی کە مرۆڤ تووڕە ببێت، بێگومان ئەمەش کارێکی ئاسان نییە بۆ مرۆڤ. لە بەرانبەر ئەم وتانەی ڕوونیدا کە ڕوونی بۆ خۆی هیچ

هەستی بە مانا و واتای ئەوان نەدەکرد، جار جار بێدەنگ دەبووم و جار جاریش بە مەبەستی ڕەت کردنەوەی ئەم وتانە هەڵوێستم دەنواند و جار جاریش دەستم بە پێکەنین دەکرد. ڕوونی هیچ واتەیەکی نەدەدا بە هەڵسوکەوتە گۆڕاوەکانی من و دەیگوت" هەر وەکو مانگی شوباتی جار دەگری و جاریش دەکەنی".

بە هیچ شێوەیەك نەمانتوانی ڕابردووی هەزاران ساڵە و ڕاستییەکانی خۆمان کۆ بکەینەوە. ئایا قووت دانی واقیعیەتەکان لە لایەن ئەو کەسانەوە کە کاری ڕاستیان کردووە بە مانای ڕزگار بوونم لە زانابوونی ویژدانی بوو؟ بارانی زەرد، بۆنی خەردەڵ و ئەو چاوانەی ئەوانەی کە لە دواوە مابوون و وردە وردە گەورە دەبوون...

کاتێك کە تانسیۆنی زەینەب بەرز دەبووەوە، دەیگوت، وردە وردە پێویستە خۆمان بۆ هەر شتێك ئامادە بکەین و ئەم کارانەی بەردەستمان تەواو بکەین. زاڤین سەرقاڵی ئەو ناوەندەی بوو کە لە کالیفورنیادا دایمەزراندبوو و هەر شەو بۆ ماوەی چەندین کاتژمێر باسی ئەو کارانەی دەکرد کە ئەنجامی دابوون. کاتێك کە لە سەر کومپیوتەرەکەی خۆیدا سەرقاڵی دۆزینەوەی کرێکار بوو و دەستی بۆ من بەرز دەکردەوە ئەو ددانە گەورانەی کە لە نێو دەمیدا جێگایان نەدەبووەوە بۆ من زۆر سەرنجڕاکێش بوون.

وەکو هەر جار کاتێك کە لە درەنگانی شەودا بە هێمنی دەرگاکەم دەکردەوە زەینەب بە ئەنقەست دەستی بە کۆخین دەکرد یا لە سەر قەنافەکاندا دەجوولایەوە. زۆربەی جارانیش لە سەر مێزەکەی خۆیدا دانیشتبوو. قژەکانی بە یەکجاری گرژ ببوون و کاتێك کە دەیزانی من هەستم بەم بارودۆخەی ئەو کردووە سەری خۆی دەخوراند و دەستێکی بە لووتی خۆیدا دەکێشا و دەکەنییا. من دەچووم بۆ حەمام و لەبەر ئاوێنەی حەمامەکەدا سەیری دەم وچاوی خۆمم دەکرد تا بزانم هیچ نیشانەیەك لە ڕامووسانی پێوە دیارە، چونکە من شەرمم دەکرد کە زەینەب بزانێت لەگەڵ ڕوونیدا ڕامووسان دەکەین. جارجاریش بە مێکیاژ کردن نیشانەکانی ڕامووسانم لە سەر لێوەکانی خۆم حەشار دەدایەوە و بە هەر دوو دەستی خۆم کراسەکەی خۆمم دەکێشا و نەمدەزانی چی لە دەستەکانم بکەم، بۆیە زوو دەستم بە لێنانی چای سەوز دەکرد و سەبارەت بە ڕووداوەکانی وڵات گفتوگۆم دەست پێ دەکرد. شەڕ ڕاناوەستێت و مردنەکانیش کۆتاییان پێ نایێت.

لە کۆتایی حەفتەکان لەگەڵ ڕوونیدا دەڕۆیشتین بۆ شاخەکان. ئەو کاتەی کە لە نێو دارستانە نماوی و شەپۆلەکانی تەم و لە بەرچاوی دۆڵەکانەوە لە ئەورازەکە بە سەر دەکەوتین ئەو

کاتە سەفەری دەرروونی منیش دەستی پێ دەکرد و سەیری ئەو نەخشەیەم دەکرد کە بۆ رۆژی داهاتوو ئامادە کرابوو. بیرمان لە هێڵەکانی نێو نەخشەکە دەکرد چاومان دادەخست و یەکترمان لە بیر دەبردەوە. لە نێو تەم و دوومانی ئەو شاخانەدا، خوداوەندە خاوەن دەمامکەکانی شاخی ئیدا وکافم دەبینین و دواتریش دەمگوت" سەر ئەرد و زەویی". دەبووم بە بەرد، رووبار و دار و تەم. لەم کاتە ساتانەدا خۆم لە هەر شت خاوێن دەکردەوە و وەکو تەم سووك دەبووم. کاتێك کە لە ترسا بە سەر خۆم دەهاتمەوە باوەشم بە روونییەوە دەکرد و بۆنی روونیم هەڵدەکێشا. کە باڵندەکانیش باڵایان دەگرت و منیش نوقمی سەردەمی منداڵی خۆم دەبووم و داوای راوەستاندنی کات و زەمانم دەکرد.

وەرزی پایز لە ژنێڤ وەرزێکی زۆر جیاواز بوو. بنارە زەردە ماتەمبارەکانی ڤان گوس و مونەت زەنگیان لێ دەدا و کاتێك کە بۆنی قارچك و گەڵاکان بەرەو قەراخی نێشەکانەوە دەڕۆیشت هەر شت بە هەڵسوکەوتێکی تایبەتی دەجووڵایەوە. ئەو کاتەی کە لە سێبەری دار و لە نێو هەوری گەڵاکاندا پیاسەم دەکرد باڵندەکانیش لە سەر سەرمانەوە جیڕ جیڕیان دەکرد. کاتێك کە دوو شاخەوان لە لاماندا تێپەڕ بوون و سڵاوێکی گەرمیان لێ کردین، ئەو کاتە لە ئاسماندا باران دەچۆڕا و ئێمەش بەرەو پردەکەوە بەرێ کەوتین. هەورە تریشقە گچکەکانیش دەستیان پێ کرد. بە یەکجاری بیرم لەو شەمەندەفەرە کردەوە کە وەکو ئەسپێك تێپەڕ دەبوو و هەر هەمووی نهێنییەکانی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. ئێمە بە تەنیا نەبووین و سروشت چاودێری ئێمەی دەکرد. ئەو کاتە من بە روونیم وت" بۆنی ئەم شاخە غەریبە زۆر بە باشی بۆنی ئێمە دەناسێت". ئەو دۆڵە کە بە رەنگە جیاوازەکان خەملێندرابوو و چوار دەوری ماڵەکان کە بە گوڵ و دار رازابوویەوە چەندە دیمەنێکی خۆش و سەرنج راکێش بوو. ماڵەکانی لانسارەکە هەر وەکو رابردوو باسی چیرۆکی قارەمانەکانیان دەکرد. لە نێو ئەم لانسارەدا سیری بیانی و داری گەورە و زەبەلاح هەبوونی خۆیانیان بە سەر هەر شتێکی دیکەدا فەرز دەکرد. روونی زۆر بە توندی دەستی منی گرت و وتی" ئەوەتا جەنابی فرانك و خاتوو دورا دانیشتنە دەمەوێ تۆ بە ئەوان بناسێنم. و دواتر روونی وتی" دەتوانم رۆژێکی دیکە ئاگادارتان بکەمەوە و بێن بۆ سەردانتان؟". منیش لەم کاتە ساتانەدا لووتی خۆم بە سەر قوولەکانی کراسەکەی خۆم خاوێن کردەوە و وتم" دایکی تۆیش هەر بەجۆرە لووتی خۆی خاوێن دەکردەوە". پێکەوە دەستمان بە پێکەنین کرد و کاتێك کە روونی وتی" ئەی خوداوەندی ماتەمینی بە راستی کێشان و هەڵگرتنی دەرد و باری تۆیش زۆر کارێکی ئەستەمە" ئەو کاتە منیش هەر وەکو منداڵ تووڕە بووم. لەم کاتە ساتانەدا دەنگی دەرگا هات و یەکێك بە فەرەنسی وتی" کێیە؟" روونیش

وتی" میوانی خوایە". پەردە قەهوەییەکە بە هێمنی لا درا و پیاوێکی روو چرچ کاتێك کە رووونی بینی بە خۆشحاڵییەوە هاتە دەرەوە و وتی" تەڕ بووینە فەرموون ژوورەوە". لە نێو ماڵەکەدا بۆنی دار دەهات و ئەو گڕ و شەپۆلانەی ئاگر کە لە نێو شۆمینەکەدا دیار بوون لە سەر دیوارەکاندا یەکیان دەگرتەوە. کاتێك کە خاوەن ماڵ وتی" ژنەکەم نەخۆشە، بەڵام کاتێك ئێوە ببینێت زۆر کەیف خۆش دەبێت" روونیش وتی" ئێمە زۆربەی جاران پیاسە دەکەین، نامانەوێ هیچ ئاسوودە بوونی ئێوە تێك بدەین". لە نێو ئەو ژوورەیدا کە سەیری دۆڵەکەی دەکرد لە سەر قەرەوێڵەیەکی برنجیدا جەستەیەکی باریك و نازك دەجووڵایەوە. بە سیمایەکی خۆش و بە پێکەنینەوە وتی" بە خێر بێن". جەنابی فرانك وتی ئەم دورا هاوسەری من و بوتانێکچییە و منیش بۆخۆم مێژوو ناسم و دەستی بە پێکەنین کرد و وتی" ئیتر هیچ جۆرە نیشانەیەك لە ڤاکینگەکان، خاچپەرستەکان و پرۆسییەکان و مەغوولەکان نەماوە". جەنابی فرانك هەر وەکو ئەو ئەکتەرانە بوو کە سەرقاڵی نیمایش کردن بن، زۆر بە کەیف و جۆش بوو. وتی بۆ ئێمە قەهوە ئامادە دەکات. خاتوو دورایش هەوڵی دەدا لە سەر قەرەوێڵەکەدا هەڵستێت و وتی" زوو بە زوو ناخۆش ناکەوم و دەرمان و مەرهەمی من ئەم شاخانەن، ئەو شرووبانەی کە ئامادەم کردبوون هیچ کاریگەرییەکیان نەکرد بەڵام ئەمرۆ تۆزێك هەست دەکەم باشترم". کاتێك کە دەستمان بە خواردنەوەی قەهوە و چایە گیاییەکان کرد جەنابی فرانك لە نێو قووڵایی مێژوودا نوقم بوو. فرانك ئەوەندە نوقم ببوو کە خاتوو دورا زۆر بە نەرم و نیانییەوە فرانکی ئاگادار کردەوە و وتی" فرانك لە لای تۆ خوێندکارەکانت دانەنیشتنە وابزانم بیر لە قوتابخانە دەکەیەوە". فرانکیش بێدەنگ بوو وتی" راست دەکەی هەی فریشتەی قژ نۆقرەییم". کاتێك کە دەمانویست بڕۆین خاتوو دورا وتی" هەمیشە بێن و سەردانمان بکەن و پێکەوە سەیران دەکەین".

هەر دووکمان خاوەن یەك هەست و نێش و ئازار بووین و لە نێو یەکتردا بووین، بەڵام لە یەکتر جیا بووین. نیشانەی هەرە سەرەکی بێتاقەت بوون و هەست بە دڵگران بوون کردن لە نێوان ژن و مێرددا بەدی دەکرا. هەستی ئەوەی کە من بەجۆرە لەگەڵ خۆمدا شەڕ ناکەم لە راستیدا هەست و ویستی من بۆ هەبوونی من بوو. لە شانۆی بەلەکەکاندا ژنەکان تەنیا خەیاڵەت بوون، ئەو کەسانە کە سڵاویان لە سەیرچییەکان نەدەکرد کاتێك کە هەستیان بە سەرنەکەوتن دەکرد دەستیان بە گریان دەکرد ، ئەمەش هەستێکی زۆر خراپ و نالەبار بوو.

کاتێك کە زەینەب بە مەبەستی سەردانی زاڤین چوو بۆ ئەمریکا من و روونیش چووین بۆ رۆما. بەر لەوەی کە برۆم بۆ رۆما گەڕامەوە ئەستەنبوڵ و هەر هەمووی پەیوەندییەکانی خۆم

لەگەڵ زانکۆدا پچڕاند. ئەو چاوانە کە لە نێو ژوورەکاند سەیری منیان دەکرد زۆربەی هەرە زۆریان نەناسراو وسارد بوون و بڕێکی دیکەیشیان زۆر فێڵباز و نادروست بوون. راستەوخۆ بۆ لای مولکییە و ئەکرەم بەریێ کەوتم و مولکییە بە هۆی ئەوەیەوە کە توانی بووی بە سەر نەخۆشییەکەیدا زاڵ ببێت زۆر کەیف خۆش و گەشبین بوو. ئەو شەوە هەر باسی رابردوو و رووداوەکانی رابردوومان دەکرد و ئەکرەم دەیگوت مرۆڤ چەندە بە تەمەن دەبێت هەر ئەوەندە دەبێتە خاوەن هەست و عاتیفە. کاتێك کە من و ئەکرەم دەمانگوت وردە وردە دەبین بەو ئاپۆڕایە کە ناتوانێت بە ئاسانی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا پەیوەندی ساز بکات، مولکییەش بە دەست مەمکەکانی خۆیەوە کە مەستەکتومی کرابوون بێزار دەبوو و دەیگوت یەکیان وەکو گردەیە و ئەوی دیکەشیان وەکو دۆڵە. ئەو وشانەی کە لە کاتی جوانیدا بەکارم دەهێنان وەکو، مردن چییە، لە تەمەنی چەند ساڵیدا، بە راستی زۆر ئەرزانە، هیچ پێویستییان بە شرۆڤە کردن نەبوو ترس و رەشبینیش تۆزێك بە مانای هەژاری بوو.

ئەم شارە گەورە کە ببوو بە ماواو و مەسکەنی شۆڕشگێڕە ئەوروپاییەکان و مرۆڤە قاچاخەکانی دیکە، لە کاتی ئێواران و ئاواچوونی هەتاودا خاوەن دیمەنێکی زۆر سەیر و سەرنج راکێش بوو. شەرابی سپی و شەپۆلەکانی گولەکە و عەشقە نووستووەکان بە هیچ شێوەیەك بە ئاگا نەدەهاتنەوە. چەند رۆژێك دوای ئەوەی کە ئێمە لە رۆماوە گەڕاینەوە زەینەبیش هاتەوە، زۆر پەشێو و بێدەنگ ببوو. من زۆر حەزم دەکرد کە پیاسە کردنەکەی من و زەینەب درێژتر ببێت چونکە وا بیرم دەکردەوە کە ئەگەر پیاسە کردنەکەمان درێژتر ببێت رەنگە زەینەب تۆزێك زۆرتر قسە بکات و هۆکاری پەشێو بوونی خۆی بۆ من روون بکاتەوە. بۆ بە کۆتا هێنانی لێکۆڵینەوەکەی خۆی (متۆلۆژیای ژن) زۆر کاری دەکرد و هەندێك جاریش بە هۆی کارکردنییەوە نان خواردنی لە بیر دەکرد. منیش روونیم لەگەڵ وێنەکانیدا بە تەنیا دەهێشت و یەك سەر بەرەو ماڵەوە دەڕۆیشتم. کاتێك کە زەینەب چاوی بە من دەکەوت زەردە خەنەیەك بە روخسارییەوە دیار دەبوو و دەستی بە خوێندنەوەی دواین رستە دەکرد کە نووسی بوو. لەگەڵ زەینەبدا بە بێ ئەوەی کە ئەو رەشەبا بەناو و دەنگانەی ژنێڤ رەچاو بکەین دەستمان بە پیاسە کردن دەکرد. رەشەباکان دەنگی ئێمەیان بزر دەکرد و مارتییەکانش خۆیان دەخستە نێو گولەکەوە. کاتێك کە زەینەب دەیگوت" بێجگە لە نووسینی رۆشنبیر و نووسەرێك تەنیا یەك جیاوازی دیکە لە نێوان رۆشنبیر و مرۆڤەکانی دیکەی کۆمەڵگادا هەیە و ئەویش تەنیا بوونی نووسەر و رۆشنبیرەکانە، و ئەو رۆشنبیرانەش کە لە نێو بارودۆخی پەنابەریدا دەنووسن، مرۆڤی

سەردەمی خۆیان نین"  دەنگی زەینەب جارجار کز دەبوو و جارجاریش بەرز دەبوویەوە. کاتێك کە کەش و هەوا لە بار بووبایا پێکەوە بەرەو کوێستان و دارستانەکان بەرێ دەکەوتین و بۆنی ئەو گیایانەی کە تێر ئاو ببوون و بۆنی سنۆبەری نێودارستانەکانمان هەڵدەکێشا. زەینەب جار جار بە هۆی ئەو ئێش و ئازارەی قاچەکانییەوە پێویستی بە گۆپاڵ (داری دەست .وە) دەبوو. لە سەر گیا تەڕ و زەوییە تەڕەکاندا دادەنیشتین و پشتمان دەدا سەر پشتی یەکتر و ئێمەش تۆزێك تەڕ دەبووین. لە ناکاوەوە وا هەستم کرد کە لە نێو بۆشایەتییەك دامە و زنجیرەی شاخەکانی ئالپ بۆم ببوو وەکو شاخەکانی قراچی لای خۆمان. ریتمی ئەو ئاهەنگە رۆحانییانە هەر وەکو دەنگی بانگ بوو لە نێو گوێ مندا و جارێکی دیکە بارانی ئێش و ئازار رووی لە من دەکرد و منیش باوەشم بە زەینەبەوە دەکرد و وا هەستم دەکرد کە کاتژمێری لە کار کەوتووم.

ماوەیەکی درێژ بوو کە بێکار بووم و دواتر لە سایەی پەیوەندییە بەرفراوانەکانی روونییەوە لە نێو زانکۆی ژنێڤدا وەکو مامۆستایەك دەستم بە وانە وتنەوە کرد. کاتێك کە دەمویست رۆحی بۆشایەتی لە خۆم دوور بکەمەوە ئەو کاتە غروروری من جارێکی دیکە سەری هەڵدەدا و ئەمەیش بێجگە لە کەم بوونەوەی ئاستی متمانە بە خۆ کردن هیچ شتێکی دیکە نەبوو. ئەوانەی کە زۆر حەزیان لە وانەکانی من دەکرد زۆربەی هەرە زۆریان خەڵکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەمریکای لاتین بوون. هەر چەند کە لە ئەستەنبووڵدا زۆر ئاسوودە و کەیف خۆش بووم، بەڵام لە ژنێڤ هیچ هەستم بە ئارامی و ئاسوودەیی نەدەکرد. بەبێ ئەوەی کە لە سەر کورسییەکەی خۆمدا هەڵستم دەستم بە قسە کردن و وانە وتنەوە دەکرد. باسی ئەوەمان دەکرد کە ئەگەر کەسێك لە فەلسەفەی رینسانس و فاوست تێ نەگات بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت لە ماناو واتەی رونسانس تێ بگات. کارلۆس کە خەڵکی مەکسیك بوو لە کاتی وانە وتنەوەدا زۆر حەزی دەکرد کە من تەنگاو بکات. هێنانەوە بیری زانست و زانیارییە جۆراوجۆرەکانی خۆم دەبوو بە جۆرە هێزێك بۆ من. کارلۆسیش کاتێك کە چاوەکانی خۆی کز دەکرد و دەستی بە زەنجیرەی یەخەیەوە دەکرد بەو جۆرەی کە خۆی خۆی پەسەند کردبێت دەیگوت" ئێمە هەر باسی شارستانییەت دەکەین ئایا ئەو کۆمەڵگایانە کە لەم قۆناخانەدا تێپەڕ بوونە و هیچ هەست و ئارەزوویەکی ژیان کردنیان تێیادا نەماوە بەرەو نەمانەوە ناچن؟" منیش خۆم هۆشیار دەکردەوە و دەمگوت بە سەبر و سەبوور بە.

لە وەڵامی کارلۆسدا وتم" هەر هەمووی کولتوور و شارستانییەتەکان خاوەن سێ قۆناخی منداڵی و جوانی و پیر بوونن" کارلۆس لە بەرانبەر مندا وتی" من نامەوێ ئەو نرخانەی

کولتووری خۆم کە پێیان دەڵێن دواکەوتوونە لە دەست بدەم من زۆر بیری ئەو نرخە کولتوورییانەی خۆم دەکەمەوە". من لە سەر کورسییەکەمدا رابووم و پەنجەکانم بە یەکەوە بەست" بێگومان لە ژێر هەر جۆرە بیر کردنەوەیەکدا جۆرەیەك زانابوونی دیکە هەیە کە پێویستی بە گفتوگۆ کردن نییە، بەڵام ئایا کاتێك کە هەستمان کرد کە ناتوانین نرخەکانی دیکە بە دەستەوە بهێنین ئایا ئەمە نابێتە هۆکاری هەست کردن بە بێ نرخ کردنی نرخە کولتوورییەکان؟" کارلۆسیش لێوەکانی خۆی کە وەکو قفڵ بوون شۆڕکردەوە و بەو جۆرەی کە بڵێ راستە سەری خۆی داخست.

مانگی تەباخ بوو، شەپۆلەکانی گوڵ بەرفراوانتر دەبوون و ئەو وێنانە کە وەکو ئەستێرەکان بوون دەدرەخشانەوە، نیوەرۆیش جەژنی هەمجنس بازەکان بوو. سەیر و سەمەرەترین پێشەنگای نەقش و نگارەکانی جەستەی مرۆڤ کە هیچ بایەخێکیان بە هیچ جۆرە یاسایەك نەدەدا دەستی پێ دەکرد. کاتێك کە لە نێو ئەو فوارە یا لە نێو ئەو پێشەنگایەدا کە لە قەراخەکانی گولەکەدا دەستی پێکرد بوو دەسووڕامەوە بۆنی چەندین کولتووری جیاوازم هەڵدەکێشا و لەگەڵ روونیدا سواری بەلەم بووین و دەستمان بە خواردنی گەنمەشامی کرد، ئەم جارە هەر وەکو منداڵەکان سەفامان کرد. روونی لە ناکاوەوە بیری لە شتێك کردەوە و وتی" زوو دەچمە ئاتولیە و دێمەوە". روونی لەم کاتە ساتانەدا تووشی دڵەڕاوکێیەکی بە بێ مانا ببوو و دەیگوت" نەرێ حەنەفی ئاوەکەمان بەستووە، مەکینەکەی قەهوەمان کوژاندووەتەوە، تۆتووکەمان لە کارەبا دەرهێناوە، دەرگاکەمان داخستووە". لە پاڵ ئەم هەموو دڵەڕاوکێیەی روونیدا نەهێنانەوەی نان بۆ ماڵەوە لە لایەن روونییەوە شتێکی زۆر ئازاردەر و ناخۆش بوو. روونی هۆکاری ئەم تایبەتمەندییانەی خۆی دەزانی بەڵام بە هیچ شێوەیەك نەیدەتوانی چارەسەری بکات. مرۆڤەکانی وڵاتێك کە فێری هەژاری و برسێتی ببوون هەر هەموویان وەکو یەك بوون. لەوبەری گولەکەوە لە نێو دار سنۆبەرەکاندا و لە ژێر شەپۆلی تەمدا سەیری ئەوبەری گولەکەم دەکرد. کاتێك کە سەیری جلە باریك و تەسکەکانی ژنە عەرەبەکان و لێوە پڕ لە سووراو سپیاو و نەعلە دراوەکانیانم دەکرد لە نێو خۆمدا دەمگوت " ئەمە چە جۆرە ترشییەکی کاهوو و لاهانەیە؟ ئەمە چە جلوە و پەرهێزێکە؟". کاتێك کە کزە با ساردەکە دەیدا بە دەم و چاومدا من بیری سەردەمی منداڵی خۆم دەکردەوە و قەرەوێڵە پڕ لە تۆز و ئەو شەوانەی کە دەنگ بێژەکان کۆ دەبوونەوە و دەستیان بە گۆرانی گوتن دەکرد و پلاو و برنجە پەردەییەکان و ئەو بەرەبەیانیانەی جەژنان کە زۆر حەزمان لە گۆشت دەکرد دەهاتنەوە بیرم و منیش دەمگوت" ئاخ هەڵەبجە لە

کویَ و ژنێڤ لە کویَ؟" کاتێك کە من بیرم لە هەڵەبجە و ژیانی خۆشی کوردەواریم دەکردەوە وشە کوردییەکان یەك لە دوای یەك دەهاتنەوە سەر زمانم، لەم کاتە ساتانەدا دوو پیاو بە زمانی فەرەنسی سڵاویان لیَ کردم و لەو لامەوە دانیشتن. زمانم بڕێك راوەستا و سەرم سوڕما و تەنیا توانیم بڵێم ئوکەی (باشە). یەکێکیان سمبێلی هەبوو ئەوی دیکەیان بیَ سمبێل بوو. منیش بە هەیەجانێکەوە رابووم و وتم" سڵاو کاکە گیان". ئەو کاتە ئێمە باسی چیمان کرد هیچ گرنگ نییە، بەڵام ئەو شتەی کە بوو بە هۆکاری چاوپێکەوتنی ئێمە تەنیا و تەنیا ئێش و ئازاری هەڵەبجە بوو. ئەوەی کە سمبێلی هەبوو کابرایەکی کاکەیی و بە زمانی هەورامی قسەی دەکرد و ئەوی دیکە بیَ سمبێلەکە ناوی چیا بوو. وردە وردە هەوا تاریك دەبوو. کاتێك کە من بە چاوی خۆم بە دوای روونیدا دەگەرام پێیانم وت کە چاوەڕیَ هاوڕێکەم دەکەم. کاتێك کە دەنگی یەکترمان دەبیست دەکەوتینە نێو هەستێکەوە کە وامان دەزانی لە کاتی ئاهەنگەکانی ئەحمەدئاوا و بالومبودا یەکترمان ناسیوە. کاتێك کە وتم " ئەگەر کاکم مابایا ئێستا لە تەمەنی ئێوەدا بوو" روونیش بە خێرایی بەرەو ئێمەوە دەهات. روونی سەری سوڕمابوو لە وشەی کوردی، فەرەنسی و تورکی. کاتێك کە چیا وتی من لە هامبوورگ دادەنیشم و بە مەبەستی سەردان هاتوومە ژنێڤ روونی وردە وردە دەستی بە شك و گومان کرد و منیش هیچ هۆکاری ئەم بارودۆخەی روونیم نەدەزانی. دەم زانی کاتێك کە لەم رووەوە ببمەخاوەن زانیاری زیاتر ئەو کاتە قۆناخی تێپەڕ بوون لە هەستە بیَ پایانەکان دەست پێدەکات. چیا کارتێکی خۆی پێشکێشی من و روونی کرد و کەیف خۆشی خۆی بۆ یەکتر ناسینمان دەربڕی و لەگەڵ ئێمەدا خواخافیزی کرد، من نەمتوانی هیچ واتەیەك بدەم بە هەڵسوکەوتەکانی روونی. روونی بە بیَ مەیلییەوە وتی" با برۆن قەهوەیەکی بخۆینەوە". کاتێك کە لە بالکۆنی هیلتۆندا چاوەروانی قەهوەکانمان دەکرد لە روونیم پرسی " چیتە بۆ وات لیَ هاتووە؟" بە بیَ ئەوەی سەیری من بکات وتی هیچ شتێکم نییە و لە نێو دەفتەرەکەی خۆیدا دەستی بە وێنە کێشان کرد. من هیچ ماناو واتەیەکم نەدەدا بەم هەڵسوکەوتانە، روونی ئەو وێنەی گۆلە کە کێشای بوو دای بە کچە گارسۆنەکە و کچەگارسۆنەکەیش دەمی خۆی تا بناگویَ خۆی کردەوە وتی" میسیو مرسی". ئەمە یەکەمین جار بوو کە هەڵسوکەوتێکی بەمجۆرەم لە روونی دەدیت. ئایا بە ئەوەندەی ئەوەی کە بەخیلی لەو کچە گارسۆنە بەرم لاواز بووم؟ بە راستی لە دۆزینەوەی وەڵام بۆ ئەم پرسیارەدا زۆر تەنگاو دەبووم. تا ئەو کاتەی کە گەڕاینەوە بۆ ئاتولیە هیچ قسەیەکمان پێکەوە نەکرد. روونی چاوی خۆی بەست و دەمی خۆی کردەوە" لەگەڵ کەسانێکدا کە

نایانناسیێ، نازانی کینه پیاسه دەکەی، بۆ کێ یا بۆ چی؟ هەی کچە ناکادەمیسییەنەکە مەگەر من بەرازم؟ " کاتێك کە ئەم قسانەم لە روونی بیست وتم" هیچ پێت نایێت وەکو پیاوە دواکەوتووەکان خۆت تووڕە بکەی" روونی وتی تووڕە بوونی من لە حەسادەت و بەخیل بوون نییە بەڵکو لە ساف و سادە بوونی تۆیە، عرف و عادەتێکی یەکتر ناسینیش هەیە، کێی، خەڵکی کوێی و ناوت چییە؟ روونی لە درێژەی قسەکانیدا دەیگوت ئەم جۆرە سادە بوونە هیچ بە تۆیەوە نایێت. ئێمە نەمانتوانی لەم گفتوگۆیە هیچ و پووچانەدا ئەنجامێك بگرین. روونی کاتێك کە تووڕە دەبوو بێجگە لەوەی کە کەسایەتی بە گشتی دەگۆڕدرا، لە جیاتی ئەوەی کە لە سەر بنەمای مەنتیق و عەقڵدا قسە بکات بە پێ هەستە دەروونییەکانی خۆی هەڵسوکەوتی دەکرد. روونی منداڵێك بوو کە بە هۆی غرووری کۆنی فئودالییەتییەوە ببوو گوللەی هار.

کاتێك کە لە درەنگانی شەودا لە ئاتولییە دەرچووین بە تووڕە بوونەوە وتی" حەزت نییە لەگەڵ مندا ژیان بکەی، دەزانم تاقانەکەت کێیە" لەم کاتەدا منیش زۆر بە توندی قاچی خۆم لە زەوییدا و هاوارم کرد" بۆ چی حەز بکەم، هەر چەندە پەیوەندی عاتیفیشت لەگەڵیدا نەمابێت بەڵام ئەو ژنەی کە لە وڵاتدا بە رەسمی نیکاحی تۆ کراوە، ئەوە چییە چی پێ دەڵێی؟ سوپاسگوزار بە کە بەم حاڵەوە تۆم پەسەند کردی" بە توندی دەرگاکەم پێوەدا و لە نێو جادەکانیشدا هیچ کەسێك نەبوو، کاتێك کە دوو پیاوی ئەلکوللی لە بن دیوارەکاندا دەنگێکیان دەر دەهێنا کە هیچ کەس لێیان تێ نەدەگەیشت، باران و تاوەکانی باران ئەو کەش و هەوا رووناکەیان کون دەکرد و خۆیان بە زەوییدا دەدا. هیچ بۆم گرنگ نە بوو کە لە بەر ئەم بارانەدا تەڕ دەبم، مێشکم تێکەڵ ببوو و لە ناخمدا هەستێکی بە هێز بوون وردە وردە گۆڕ دەبوو و دەیگوت" ژیان ئەمەیە" سەر و رووی خۆم بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و دەمویست بە باشی تەڕ ببم، لە نێو کۆڵانەکاندا پیاسەم دەکرد بەڵام هیچ نەگریام.

کاتێك کە گەیشتمە ماڵەوە لە هەر هەموو لای جەستەمدا ئاو دەچۆڕا، ئەو کاتەی کە بە سەر پەنجەی قاچەکانمدا بەرەو ژوورەکەمەوە دەڕۆیشتم لە بۆنی پیپەکەدا زانیم کە زاڤین گەڕاوەتەوە. لە نێو هۆڵەکەدا لەگەڵ زەینەب پێکەوە خۆیان درێژ کردبوو و سەیری فیلمیان دەکرد. زاڤین کاتێك کە منی دیت وتی" چییە چیت بە سەردا هاتووە کەوتوویتە نێو گولەوە" چاوی زەینەب هەر لە سەر من بوو وتی" زوو خۆت بگۆڕە نەخۆش دەکەوی" لەم کاتە ساتانەدا لە وشەی " دەزانم تاقانەی تۆ کێیە" کە روونی پێ گوتبووم تێگەیشتم. کاتێك کە چوومە

ژوورەکەی خۆمەوە هیچ نە نووستم، rووونی زۆر بە ناحەقی و نا ماقوولانە هەڵسوکەوتی کرد.
من زۆر حەزم لەو دنیا پڕ لە ماتەمینەی rووونی دەکرد کە هیچ کات نەیدەتوانی بەو دەنگە بەرزانەی خۆیەوە دەری بپڕێت. هەر دووکمان تەنیا و ڕۆحی هەردووکمانیش برینداربوو، بۆیە ئێمە ناچاری یەکتر بووین.

بەیانی کاتێك کە لە نێو هەر چوار وەرزی ڤیڤالیدا هەڵستام لە نێو دەرزەکانی نێو پانژۆرەکەدا تیشکێکی نەرمی هەتاو دەهاتە ژوورەوە. کاتژمێر بڕێکی باش بە پێشەوە چوو بوو. ڕوونی چەندین جار تەلەفۆنی بۆم کردبوو. بە هۆی ئەو خەیاڵانەیەوە کە دەمدیتن ئەو ڕۆژە زۆر لە سەر خۆم و بە جۆش بووم. لە نێو تاریکی شەودا من و ڕوونی دەستی یەکترمان گرتبوو و پیاسەمان دەکرد و لە ناکاوەوە گوڵێکی سپی پڕ لە شیر لە پێشمانەوە خۆی نیشاندا، لەگەڵ ڕوونیدا دەچووینە نێو گولەکەوە و تۆزێك گاڵتەمان دەکرد و دەردەکەوتین. گەرمایی گوڵەکە بە دڵی ئێمە بوو و ڕوونی دەیگوت" ئاگات لە خۆت بێت بەڵکو قووڵتر بێت" هیچ کۆتایی بەمجۆرە خەون و خەیاڵانە نەدەهات و منیش مێشکی خۆم زۆر بە گوڵی شیر، گەرم بوون و سارد بوونی گوڵەکەوە سەرقاڵ دەکرد. گوڵی شیر زانست و زانا بوونی من بوو، گەرمی و ساردی گوڵ پەیوەندییەکانی من و ڕوونی بوو قووڵ بوونیشی وا بزانم بە مانای بۆشایەتی یا چۆنیەتی ئاشنا بوونی ئێمە بوو. کاتێك کە جارێکی دیکە چاوی خۆم داخست و دەمویست بخەوم، زاڤین بانگی کردم" هەی خاتوو خەوین بێ زەحمەت فەرموو نان ئامادەیە". کاتێك کە هاتمە خوارەوە زەینەبم دیت لە نێو جلە قەزیفەکانی خۆیدا ئەو شتانەی دەخوێندەوە کە نووسی بوون. کاتێك کە لە دواوە باوەشم بە زەینەبەوە کرد ئەو کاتە هەستم بە مهر و خۆشەویستی جەستەی زەینەب کرد. زەینەب وتی" دوێنێ شەو زۆر تەڕ ببووی" زەینەب وا خۆی نیشاندا کە ئەگەر هۆکاری تەڕ بوونی خۆم بۆی باس نەکەم ئەو هەر دەزانی بۆ تەڕ بوومە. بە هۆی ئەوەیەوە کە درەنگ لە خەو هەڵستابووم بڕێك شەرمم دەکرد و بە زاڤینم وت" من هیلکە و تەماتەکە ئامادە دەکەم" زاڤینیش بە شێوەیەکی لاقرتی ئاسا وتی" نا نا من ئامادەی دەکەم"

ژنێڤ هەر وەك کچێکی لە خۆبایی بوو، تەم لە نێو گۆلەکەدا هاتوچۆی دەکرد، دەنگەکانیش تێکەڵ و درێژتر دەبوون، لە کاتی ئاوابوونی هەتاودا تیشکە ڕەنگاوڕەنگەکانی هەتاو تێکەڵی یەکتر دەبوون و بانکەکانیش لە نێو تاریکییەکی ڕەنگاوڕەنگدا دەدرەخشانەوە. من دەمزانی تاریکی و زەنگی شەو واقیعیەتێکە کە تا کۆتایی تەمەنم ناتوانم لێ ڕزگار ببم. وشە جیاوازەکان خۆیان زوو بە زوو تێکەڵی ڕیتمی فونوتیکی زمانی من دەکرد. کاتێك کە من

بە زمانی زگماکی یا زمانی دایکی خۆم هەستم بە هەبوونی خۆم کرد ئەو کاتە بیانی بوونی من برێك زۆرتر و قوولتر ببوو. کاتێك کە ئەو دەنگە نەبیسراوانەی نێو ناخم دەهاتنە سەر زمانم بە خۆم دەمگوت" راستی و واقیعیەت شتێکە کە زۆر بە ئاسانی بە چاو نابینرێت. من بە باشی دەمزانی کە تەنیا رێگای باش بۆ لە بیر بردنەوەی ئێش و ئازارەکانم ئەوەیە کە ناوێکیان لێ بکەم و بیانناسم. تەنیا شتێك کە دەتوانی زوو بە زوو من لە ئێش و ئازارەکان رزگار بکات نووسین بوو. کاتێك کە دەستم بە نووسینەوەی بیرەوەرییە رۆژانەکانی خۆمم کرد هەوڵمدەدا کە چیرۆکی ژیانی من بە شێوەیەکی راستەوخۆ کاریگەری لە سەر ئەم بیرەوەرییە نوێیانە نەکات، بەڵام هەمیشە و هەر کات هەر شت بۆ من پاشماوەی جەنازە، گازی خەردەڵ و رووباری ترس بوو.

کاتێك کە زاڤین و زەینەبمان بەرێ کردن بۆ ئەمریکا لە نێو چاوەکانی روونیدا خۆشحاڵییەکی نادیار خۆی نیشاندەدا. بۆ ئەوەی کە کەس هەست بەم خۆشحاڵییەی روونی نەکات، روونی زۆر جموجووڵ و قسەی دەکرد و بە بێ مانا دەکەنیا و هەر وەکو ئەوەی کە شتێکی لە بیر کردبێت لە نێو رارایی بوونێکدا بوو. زاڤینیش بە هۆی نەزاکەتەوە دەیگوت" هەم هەم" مانای ئەم هەم هەمەی زاڤین دان نان بە هەڵسوکەوتی روونی بوو، بێگومان زاڤین تەنیا بە هۆی نەزاکەت و داب و نەرییتەکانەوە ئەم شتەی دەکرد. لەم کاتە ساتانەدا مێشکی زاڤین لە شوێنێکی دیکەدا بوو. منیش وەکو پشیلە خۆم خزاندبوو نێو باوەشی زەینەبەوە و ئارمانجم ئەوە بوو کە زەینەب بۆ ماوەیەکی دیکە کە لێم دوور دەکەوتەوە وزە و هێزم پێ بدات. زەینەب جار جار خۆی لە من دوور دەکردەوە و منیش لەو شەفەقەت و میهرەبانییەی زەینەب زۆر بە باشی تێدەگەیشتم. زەینەب زۆر بە گەرمی کتێبە نوێیەکەی خۆی کە ناوی متۆلۆژیای ژن بوو بە باشی خستبووە نێوان هەر دوو دەستی خۆیەوە و بە منی وت" من نەمتوانی ئەم شوێنە بۆشانە پڕ بکەمەوە باری تۆ لە جیاتی من پڕیان بکەوە" کاتێك کە منیش سەرقاڵی پڕ کردنەوەی پاسپۆرتی زەینەب بووم لووتم سۆڵاوەوە. (ئاو لە لووتیدا هاتە خوارەوە. وە) و منیش هەوڵم دەدا هێزی هەر هەمووی جەستەی خۆم بکەمە یەك و زەینەبیش لە لای شانی خۆیەوە سەیری منی کرد و کۆخیا. روونیش لەم چاوەڕوان کردنەدا بێزار بووە و زوو بە زوو سەیری کاتژمێرەکەی دەستی دەکرد. ئەرێ هۆکاری ئەو هەستە پڕوپووچانەی من لە بەرانبەر زاڤین و هینەکانی روونی لە بەرامبەر زەینەبدا چی بوو؟ نە تایبەتمەندییە کولتوورییەکانی مرۆڤ، نە عورف و عادات و تەقالیدی شوێنی ژیان کردنی مرۆڤ و نە کار و

پیشەی مرۆڤە هیچ کامیان نەیاندەتوانی ببن بە بەرسڤێك بۆ ئەم پرسە. بەراستی مرۆڤ چە جۆرە هەبوونێکی سەرنجڕاکێشە!

لە کاتی نەبوونی زەینەبدا من نوقمی هەستی ناتەواو بوون و بێکەسی دەبووم. کاتێك کە بیرم لەوە دەکردەوە کە رۆژێکی دیکە دێت و جارێکی دیکە یەکتر بە باوەش دەگرینەوە، زۆر بە توندی خۆم دیلی هەستەکانم دەکرد و بە چاوی گومانەوە سەیری ئەو ژیانەم دەکرد کە زۆر لە ئاستێکی بەرزدا ستاندارد و پیوانی ژیان کردنی پێ دابووم. ڕاڕایی بوون و زامدار بوونی دڵی من کە هیچ کات کۆتایی پێ نەدەهات جارێکی دیکە سەر لە نوێیەوە دەستی بە ئازار دانی من دەکرد. کاتێك کە هیچ شتێك لە دەرەوەی مێژوو نەبوو و منیش وەکو دادوەرێك سەیری مێژووم دەکرد وام دەزانی کە لە بەرانبەر کەسێکدا مەیدانم گرتووە و ئەویش بێگانە بوونی خۆم بوو.... بێگانەی... ئایا هیچ کۆمەڵگایەك هەیە کە هەست بە بێگانەکانی نێوخۆی نەکات؟ کاتێك کە گێرۆدەی لافاوی هەست و بیروبۆچوونە جۆراوجۆرەکان دەبووم بە توندی دەستم بە خۆڕاگری دەکرد و بیرم لەوە دەکردەوە کە هەر وەکو گەڵای پایز بڵاو بووینەوە، بۆیە پێویستە جارێکی دیکە بێینەوە لای یەکتر. لە کاتی ئەم هەوڵدانانەدا من بە چاوی خۆم ئەو ماوەیەی نێوانی خۆمان کە ماوەیەکی کاتی بوو دەمدیت. جار جاریش دامان بە بەبێ رەحم بوون و بێ کەس بوونی خۆماندا دەنا و زۆر دڵمان بۆ خۆمان دەسووتا. بە گوێرەی ئەوانە کە لە سەر گردەکانەوە سەیریان دەکرد، ئێمە: ئەو کەسانە بووین کە لە نێو ئۆپێرادا چاوی خۆیانیان دادەخست. ئەوانە لەم جۆرە سەیرکردنانەی خۆیاندا هێزیان وەردەگرت. ئەو هەستەی کە ئەوانی بەهێز دەکرد تەنیا بەزەیی هاتنەوەی ئەوان بە وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بوو. ئایا مرۆڤ خۆی لە نێو بێگانەکاندا دەناسێ یا بێگانەکانی لە نێو خۆیدا دەناسێ؟

کاتێك کە پەیوەندییەکانی نێوان من و رۆونی بەهێزتر بوون ئەو کاتە ژمارەی ئەو کەسانە کە دەهاتن بۆ ئاتۆلیە کەم بوویەوە. هیچ کات نەماندەویست کە پێکەوە بوونی ئێمە ببێتە پەیوەندییەکی ناخۆش و بە ئێش و ئازار. بێجگە لە هەوڵدانێکی زانستی و چاوەڕوان کراو دەمانەویست کە هاوسەنگییەکیش لە نێو پەیوەندییەکانماندا هەبێت.

مانگی کانوونی یەکەم بوو، جادەکان و پردەکان و قەراخەکانی گوّل هەر هەموویان لە نێو رووناکییەکی زۆربە هێزدا بوون. بە دەنگی ئەو کەسانەیەوە کە پەشێو و لاواز بوونی خۆیانیان بەلاوە نابوو جۆرەیەك هیواو ئاوات و گەشبینی دیار بوو. دارە سنۆبەرە باڵا بەرزەکان و ناچارییەتی بابانئول برێك مرۆڤی بێزار دەکرد. زۆر بە وردبینییەوە سەیری ئەو ڤیترین و

دوکانانەم دەکرد کە بە دەنگی بەرز داوایان لە مشتەرییەکانی خۆیانیان دەکرد کە سەردانیان بکەن. کاتێك کە سەیری ئەو ماڵ و منارانەم دەکرد کە بە شوکۆلات دروست کرابوون، دەچوومەوە نێو دەورانی منداڵیمەوە کە زۆر حەزم لە شوکولات و شیرینە مەنی بوو. نەدەبوایا شوکۆلاتەکان منیان لە من جیا بکردابایەوە. دەبوایا لە نێو شوکۆلاتەکاندا دیواری بە حوجرە هەبووبایا، هەمیشە لە بارودۆخی خۆپاراستندا بووم، ئەو بن دەستییەی خۆم کە هیچ کات نەمتوانی بوو لیێ رزگار ببم ئایا ئەگەر ترسەکانی من نەبوو چی بوو؟

کاتێك کە لە سەردەمی جەژنی سەری ساڵی نوێدا سەرچڵی سووری دارەکان بڕێك بەرفی بە خۆیەوە دەگرت، لەگەڵ زەینەبدا قسەمان دەکرد و باسی ئەو خواردنانەمان دەکرد کە لەگەڵ روونیدا ئامادەمان کردبوون، لە ناکاوەوە دەنگی زاڤین هات کە وتی، رێکخراوێکی ژنان خەلاتی خۆی بە زەینەب بەخشیوە. زەینەب کاتێك کە بە پەشێوی بە دوای وشەکاندا دەگەریا وتی" دیتت خەلاتیان پێدام"

لە نێو هەستە گەشەکانی مندا هەستی بۆن کردنم زۆربەهێز بوو، زۆر بە خێرایی بە خۆمدا دەچوومەوە و هەوڵمدەدا چەندین واتە و مانایەکی دیکە لە سەر مانا و واتەی ژیان زیاتر بکەم، دەبوایا بۆ ژیان کردن چەندین هۆکار و سەردەم رەخسابانا، مرۆڤێکی نوێ، کتێبێك کە دەخوێندرایەوە، یا شارێك کە تازە دەدۆزرایەوە.... کاتێك کە لە ژێر نووری مۆمەکاندا دەنگی پێکدادانی پیاڵەکان دەهات و خواردنەکان دەخواردران، روناڵد چاوە گچکەکانی خۆی دادەخست و نیشانیدەدا کە لە هەبوونێکی گەورەتر و بەرفراوانتر لە هەبوونی خۆی ژیان دەکات و بە جموجووڵە سەرنجڕاکێشەکانی خۆی دەستی بە نواندنی کەمان دەکرد. دواتر دەلیلیش بەو چاوە دوور بین و ماندوو بوانەی خۆی دەستی برد بۆ گیتارەکەی، کزە بایەك گیاکانی نێو باخچەکەی دەجووڵاندەوە گڵوپەکانی نێو کۆڵانەکانیش دەکۆژرانەوە و دەگیرسانەوە. دەنگی مۆسیقا، بۆنی شەراب، بیانی بوونم و تەمبوورە پەك کەوتووەکەی کاکم..... خاراپێتیێ خاچۆ دەستی بە حەیران گوتن کرد. من هیچ ئاگام لە دەنگی روناڵد نەبوو و ئەم هەست نەکردنی منیش لە بێ هەستی منەوە سەرچاوەی دەگرت، دواتر من دەستم بە هەوڵدان دەکرد، دەبوایا وازم لە نکۆڵی کردنی ئێش و ئازارەکانم هێنابایا. دەبوایا تێگەیشتبام کە سەرکوت کردن و لە ناو بردنی ترسەکانی خۆم کارێکی هەڵەیە و دەبوایا خۆم لە گرێدراو بوون بە کاریگەری هۆکارە دەرەکییەکانیش رزگار بکردایا و نەدەبوایا خۆم سەرقاڵی هەبوونێکی ساختەی خۆم کردبایا.

کاتێك کە سەرکەوتن و زانا بوون هێزیان دەدا بە من، دەبوایا ئەو کاتانەیش من رێزم لە

هەست و بیروڕای ئەوانی دیکە گرتبایا و وازم لە هەستی پارێزراوبوونی خۆم بهێنابایا. چونکە بۆ ژیانی راستەقینە تەنیا زانا بوون بەس نەبوو بەڵکو شتی گرنگ هەبوون لە نێو ژیاندا بوو.

ئەو ئاوازانەی کە تێکەڵی تاریکی دەبوون بۆ ئەوەی کە هەتا هەتایە لە ناو نەچن خۆیانیان دەپاراست. شت و مەکەکانی نێو ژوورەکەیش وا دەکەوتنە بەر چاوی من کە خەریکن لە بەرامبەر هیچ بوونی خۆیان دەستیان بە پاراستنی خۆیان کردووە. کلاریسا قاچە درێژەکانی خۆی کە وەکو ستوون بوون خستبوو سەر لاپاڵی قەنافەکەوە، دەستە جوانەکانی هەر وەکو ئەوەی کە سەرقاڵی بەستنی شتێك بە ملی سەگەکەیەوە بن، هیچ لە فەرقی جموجوولە مافوریکەکەی خۆیدا نەبوو. ماریانا بە هێمنی بەردەوام بوو لە خواردنەوەی شەرابەکەیدا، سەیر کردنەکانی بۆ من و روونی تۆزێك سەرنجڕاکێش بوون. قژە گۆرژەکان و لووتە خوارەکەی تەڕ ببوو، رەنگ و رووی سوور ببووەوە و کاتێك کە دەیەویست دڵەڕاوکێیەکەی خۆی بە پێکەنینەکی کەم بشارێتەوە بارزانیش بە مەبەستی بێدەنگ بوونی رونالد دەکۆخیا و بە مەبەستی تام و چێژ وەرگرتن شەرابەکەی خۆی نوێ دەکردەوە. ئەرێ یا..

بە پێی هەندێك کەس گەیشتن یا نەگەیشتن بە زەوق و شەوق دەبوایا هەمیشە مرۆڤ لە سەر هۆشی خۆی نەبووبایا و بەردەوام کاری بۆ بێ هۆش کردنی خۆی کردبا. ئیپەك کە زۆر لووت بەرز و خۆی بە گەورە دەزانی، بە مەبەستی جێ کردنەوەی خۆی لە نێو دڵی ئەوانی دیکەدا و گەیشتن بە ئارەزوو و ئاواتەکانی خۆی و بە دەستەوە هێنانی ناوبانگ بە دەنگی بەرز دەستی بە پێکەنین دەکرد. هەورایش بەو هەستە سەرکوت کراوانەی خۆیەوە هەر وەکو راوچییەك بوو کە لە چاوەڕانی نێچیردا بێت. کاتێك کە بیرم لەوە دەکردەوە کە ئایا چەند کەس هەن کە بتوانن لە سەر پێ خۆیان رابوەستن، هەست و زانستی من ئاماژەیان بە رونالد دەکرد. هەوڵ نەدانی رونالد بۆ بە دەستەوە هێنانی ناودەنگ ببوو هۆکاری ئەوەی کە کەسایەتی رونالد زۆر سەرنج راکێش بێت.

کاتێك کە وردە وردە رووناکییەکە جێگای خۆی دەدا بە تاریکی منیش زۆر ماندوو دەبووم و بەبێ ئەوەی کە هیچ شتێك بخوێنمەوە خۆم دەخستە نێو جێگاکەمەوە. بەیانیان بە دەنگی هاواری بۆشایەتی هەڵسام. رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ بۆشایەتی و تەنیاییدا هیچ ئاسان نەبوو. لە بارودۆخێکی بەمجۆرەدا ئەو شوێنەی کە مرۆڤ چاوی لێ دەکرد تەنیا و تەنیا راستی و واقیعیەتە بێ رەحمەکان بوون. من باوەشم بە روونییەوە کرد و وتم" باوەشم پێوە بکە، سەرمامە گەرمم بکەوە و من بە جێ مەهێڵە". روونیش وتی "هەستەکان هەر وەك گیا بیانییەکانی نێو

باخچەی عەقڵن ". ئایا ئەو شتە تاقانەی کە من لێ تێنەگەیشتبووم داهاتوو بوو؟. من زۆر بیری زەینەبم دەکردەوە. من وتەکانی زەینەب وەکو" تا ئەو کاتە کە پەیوەندییەکی راستەقینە نەبێت مرۆڤ ناتوانێت ببێتە مرۆڤێکی راستەقینە" . کاتێك کە دڵۆپەکانی ئاویش لە سەر گەڵا تاجەکاندا دەچۆڕیا، بەرەبەیان وردە وردە کون دەبوو. کە بیرەوەرییەکان و قسەکانی شەوی رابردوو لە نێو عەقڵی مندا دەستیان بە هاتوچۆ دەکرد، من بیرم لەوە دەکردەوە کە پێویست ناکات بۆ گەیشتن بە هەبوون مرۆڤ دەست بە نانەوەی ئاژاوە دوژمەنایەتی کردن لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بکات. زۆربەی ئێمە نەماندەویست کە دان بە هەستی نانەوەی ئاژاوەی خۆماندا بنێین بۆیە ماسکێکان بە سەر کەمانییەکانی خۆماندا دەکێشا، ئایا ئەو شتانەی کە ببوون هۆکاری ئەوەی کە ئێمە نەتوانین خۆمان رووبەرووی راستییەکانی خۆمان بکەینەوە هەر ئەم شتانە نەبوون؟ بە هێمنی پانزۆرەکەم لادا و هەتاویش زۆر بە لاوازی لە سەر رووی روونیدا سێ گۆشەیەکی کێشا. رونی هەر وەکو منداڵێك نووستبوو. بە چرچەکانی سەر لێوی سەرەوەی متمانە و خۆباوەڕ بوونی رونی دیار بوو. چاوەکانی بە شێوەیەکی ناز کردن خۆیانیان دادەخست و دەکردەوە، هەر وەکو ئەوەی کە رونی هەست و ناخی منی خوێندبێتەوە وتی" دەمەوێ ببمە تاقانە بەنازی تۆ". کاتێك کە سەری خۆمانمان دەشت هەر وەکو منداڵ پێکەوە گاڵتەمان دەکرد.

ئەو پارەیە کە بە هۆی وانە وتنەوەم وەکو مامۆستای مێوان لە زانکۆ وەرم دەگرت تێری منی نەدەکرد. زەینەب هەمیشە بە منی دەگوت کە لە ماڵەوە پارەم بۆ داناوی لە کاتی پێویستدا سەرفی بکە، بەڵام کاتێك کە من بیرم لە رۆژە سەختەکانی رابردوو دەکردەوە هەمیشە هەوڵمدەدا کە بە کەم قانع ببم و بەمجۆرە خۆم لە گوناهەکانم پاك بکەمەوە. هاوکات لەگەڵ دەنگی خاراپێتیێ خاچۆدا دەستم بە گریان دەکرد.

لە دوانیوەڕوانەیەکی هاویندا کاتێك کە شنەیەکی فێنك دڵ و ناخی ئێمەی فێنێك دەکردەوە لە نێو ئاتۆلیەکەدا بیرمان لە ئازاد کردنی منداڵەکەی ناخی خۆمانمان دەکردەوە و دەمانەویست رۆڵێکی یەکجار زۆر بدەین بەم منداڵە تا بەمجۆرە رابردووی خۆمانمان لە بیر ببەینەوە، لەم کاتە ساتانەدا رونی لە نێو رەنگەکان و منیش لە نێو کتێبەکاندا نوقم دەبووم و هەست و بیرو بۆچوونی دادگایی کردنی سیستەم لە ناخی مندا بە هێزتر دەبوو. شاخەکانی ئالپ کە لە هەر چوار لای گولەکەدا سەریان هەڵدا بوو بۆ من دەبوون بە شاخەکانی وڵاتی خۆم. بەو هەستەی کە ئەگەر بتوانم لەم شاخانەدا بەسەر بکەوم ئەو کاتە دەتوانم بگەمە ماڵی

خۆمان، جارێکی دیکه دەچوومه نێو قۆناخی منداڵیمەوە و هەرشتێکم لە بیر دەبردەوە، بەڵام ئەم لە بیر بردنەوە درێژخایەن نەبوو. لە کاتی ئاوا بوونی رۆژدا لە ناوبەر هەبوونی من و گوڵە شەرابییەکەدا پردێك دروست دەکرا، بێدەنگی، بۆشایەتی و بێ کۆتایی.....

ئایا کاتێك هەبوو کە تۆ بڵێی هیچ شتێك تێیادا رووی نەدابێت؟ دەنگەکەی ناخم کە وەك کریشتە بوو دەیەویست ئێش و ئازارەکانی دڵە پڕ لە خەمەکەی من رابوەستێنێت. لە نێو شەوە زەنگەکانی ژنێڤدا کاتێك کە دەمویست باوەش بە هەستەکانمەوە بکەم، سەردانی باڵکۆنی لوکاڵێنم دەکرد کە هەر جار دەچووم. ئەو کاتەی کە سەرقاڵی خواردنەوەی قەهوە بووم روونی تەلەفۆنی بۆم کرد، دەنگی زۆر ماندوو دیار بوو. بە مەبەستی ئامادەکارییەکانی ئەو پێشەنگایە کە دەبوایا لە داهاتوودا رێکی بخستبایا زۆر سەرقاڵی کاری ئاتۆلیە بوو. زمانی روونی تۆزێك هەڵسووڕا و وتی" ئەگەر لە نزیك ماڵەوەی، لە سەر رەفەی لای چەپی مێزەکەدا ئەلبوومەکی وێنە هەیە دەتوانی بۆم بێنی؟ چونکە رۆژنامە نووسێك هاتییە و دەیەوێ لەگەڵمدا دیمانەیەك ساز بکات".

من نەمدەویست بیر لە هیچ شتێك نەکەمەوە، سەرم زۆر گران ببوو. بە مەبەستی راحەت و ئاسوودە بوونم سەیری زۆربەی ویترینی دوکانەکانم دەکرد بەڵام هەر هەموویان هەستی ژنانەی منیان لاواز دەکرد. بە مەبەستی دابڕان لەو بیروڕایانەی خۆم کە بە دوای یەکتردا دەکەوتن سەیری ئاسمانم دەکرد و بیرم لەوە دەکردەوە کە ئاڵتو کوموسەکان و سیڕوو ستراتووسەکان (دوو جۆرەی هەوری نێو ئاسمانن. وە) چۆنە دەجووڵانەوە، لەم کاتە ساتانەدا بوو کە دیتم لە بەردەرگای ماڵی خۆماندام.

لە ماڵەوە بۆنی بۆیە و رەنگ دەهات و هەر هەموویشی بۆنی روونی بوو. هەستم بەوە کرد کە ئەم بۆنە کاریگەرییەکی یەکجار زۆری لە سەر حوجرەکانی جەستەی مندا کردووە. هاوکات لەگەڵ مانا و واتایەکی دیکەی فێر بووندا هەمیشە هەوڵم دەدا کە هەستی فێر بوون و راهاتنی خۆم لەگەڵ بارودۆخەکەدا لە دەست نەدەم. ئایا لە نێو دەست و پەنجەی هەستێکی شێتانەدا بووم؟ بە مەبەستی سەرکوت کردنی هەستی لاوازی و بێ متمانەیی خۆم بە شێوەیەکی توندتر پێم لە گەڵای دار و درەختەکان دەکرد. روونی زۆر پیاوێکی خاوەن سیستەم و ریکو پێك بوو لە سەر مێزەکەیدا دانیشتم، بە چاوی بیانییەك سەیری تابلۆ و کتێبەکانم کرد. ئەمە ماڵی کەسێك بوو کە هەمیشە هەوڵی ئەوەی دەدا خەیاڵەکانی خۆی بکاتە وەك رووداوێکی راستەقین لە نێو ماڵی خۆیدا.

هەست و زانا بوونی هاوبەشی زۆربەی ئێمە ئەوە بوو کە ژیان کردن بۆ داهاتوو بە دواوە بخەین، بەڵام ئایا داهاتوو بە مانای بە دەستەوە هێنانی شتی زۆرتر و باشتر نەبوو؟ ئەو بۆنە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کاریگەری لە سەر هەستی سەرنج دانی من دەکرد. وردە وردە دەستم بە گەڕان لە نێو ڕەفەکانی لای مێزەکەی ڕوونیدا کرد. وێنە ڕەش و سپییەکان سەرنجی منیان ڕاکێشا، بینینی دیمەنە جیاوازەکان لە نێو ئەم وێنانەدا غرووری منی بەهێزتر دەکرد، بەشە ئەسپانییەکان، ئێسقانە گەورەکان و قژە درێژەکان وایان لە من دەکرد کە دەست بە پێکەنین بکەم. وێنەکانی کاتی ئاهەنگ و وێنەکانی کاتی شەڕ و پێکدادانیش زۆر شتی جیاوازیان بە بیرم دەهێنایەوە. ڕوونی دەیگوت " هەر هەمووی ئەو لافیتە و تابلۆیانە بە دەستی من ئامادە کراون". چەکمەجە قفڵ کراوەکەی مێزەکە وردە وردە منی بێزار دەکرد، ئەو هەستانە کە هانی منیان دەدا هەستە سەرەتاییەکانی منیان بە بیرم دەهێنایەوە. دەنگێك لە ناخی مندا دەیگوت" هەوڵ بدە دەکرێتەوە، پێویستە بکەیتەوە" هەوڵمدا بە نووك و سەری چەقوو و مەقاس بیکەمەوە، نەمتوانی بە مەقاس بیکەمەوە بۆیە بە چەقوو هەوڵدانی خۆم بەردوام کرد. زۆر پێوە ماندوو نەبووم یەك دوو جار چەقووەکەم سووڕاندەوە و دەرگای چەکمەجەکە کرایەوە. بەستەیەك نامە و چەند کارت پۆستکارت و چەندین وێنە لە نێو ئەم چەکمەجەیەدا بوون. ئەو نامانە کە بە زمانی فەرەنسی نووسرابوون تەنیا مێژوویەکانیانم خویندەوە. ئەو مێژوویانە هەر هەموویان مێژووی نزیك بوون و پەیوەندییان بە منەوە هەبوو. من ئاگام لە پەیوەندییەکانی نێوان ڕوونی و کاتۆی و ماریا هەبوو و هەروەها دەمزانی کە بە هۆی هەڵوێستی سیاسییەوە عاشقی زەریایش بووە. کاتێك کە ڕوونی دەیەویست بە مەبەستی لێبووردن، هەر هەمووی شتەکان بۆ من باس بکات، منیش بە ئەوەندەی شەیتان ڕقم لێ دەبوویەوە، بەڵام دەمەویست خۆشەویستی تاقانەی ڕوونی بم. لێدانی دڵی من توندتر بوو و وازم لە هەستی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ شتی خراپتردا هێنا و وا هەستم کرد کە لە نێو دەست و پەنجەی یەکێکی دیکەدام. ئایا هەر نەخۆشییەك و هەر ڕووداوێکی نەخۆش خۆشی یا ڕووداوێکی خۆشیشی لەگەڵ خۆیدا نەدەهێنا؟ کاتێك کە نامە دەست نووسەکانی ڕەخشانم لە نێو چەکمەجەکەدا بینی و سەیری مێژوویەکانیانم کرد هەر هەمووی جەستەم سارد بوو و دەستی بە لەرزان کرد. ویستم پەنا بۆ ئەو شوێنەی ببەم کە هیچ جۆرە عەشق و سەرچاوەیەکی خۆشەویستی تێدا نەبێت، بەڵام نامەکان هەر هەموویان وەکو ئاوێك بوون کە سەرچاوەکەی دیار بێت. لە نێو وێنەکاندا بە دوای وێنەی ڕەخشاندا گەڕیام، ڕوونی لە پشتی هەر هەمووی وێنەکاندا نامەیەکی کورتی

نووسی بوو. ئەو ژنە پۆڵۆنیاییە بەو لووتە درێژەی خۆی و جل و بەرگە نەتەوەییەکانی خۆیەوە وێنەیەکی پێشکێشی روونی کردبوو و لە پشتییەوە نووسی بوو ئەگەر بتەوێ لە سەر شاخەکانی کوردستاندا بۆت دەمرم. ئەم نووسینە لە بەرانبەر شۆخ و شەنگی نیگاکانی ئەو ژنەدا هەر وەك کاریکاتێر بوون. هیچ لە خەمی گەڕانەوە بۆ ئاتۆلیە نەبووم، چونکە دەبوایا هەر هەمووی نامە و وێنەکانم بە چاوی خۆم سەیر بکردبایا. رەخشان لە ئاهەنگێکی بووك گواستنەوەدا لە سەرەتای مێزدا دانیشتووە و روونیش لە دواوەی بوو. رەخشان بەو چاوە زەبەلاحانەی خۆیەوە ژنێکی زۆر فێڵباز بوو. کاتێك کە دەمویست لە پەیوەندی نێوان وشەکانی پشتی نامەکان تێبگەم، تێگەیشتم کە ئەم وشانە نەتەنیا لە رووی ئەدەبییەوە بەڵکو لە زۆر بواری دیکەدا خاوەن واتا و مانایەکی زۆر بە هێزن، منیش جارجار وا هەستم دەکرد کە هیچ سەری خۆم بەم جۆرە وشانە و بەم جۆرە پەیوەندییانەوە نەئێشینم.

لە نێو ئەم رستانەدا کە نووسرابوون، هەست و شەیدا بوونی ژنێکی ئاکادەمیسیەن بەرچاو دەکەوت بە تایبەتی ترسی نەخۆشەویست بوونی کە لە ترسی پێکهێنانی پێکەوە ژیانێکی راستەقین زۆرتر سامناك و بە ئازار بوو. هەڵخەڵەتاندنی یەکتر و جیابوونەوە بە مانای نەمان بوو. ئەو نووسینانەی ئەم ژنە کە چەپ و راستی لاپەڕەکانییانی پڕ کردبوو و نیشانەی ئەوە بوو کە هەمجنسێکی من چۆنە خۆی لە بەرانبەر پیاوێك ئەوەندە گچکە دەکاتەوە ببووە هۆکاری تووڕە بوون و بێزار بوونی من. ئەم ژنەش یەکێك لەوانە بوو کە لە دوای ساڵەکانی ١٩٨٠دا بە هۆی بارودۆخی سیاسییەوە بە زۆر بە شوو درابوو. (مەبەست ئەو ژنانەیە کە بە زۆر ناچاری پێکهێنانی ژیانی هاوسەری دەکران). رەخشان کە دایك بوو نووسی بووی منداڵم هەیە و ئەوە ١٠ ساڵە لە مێردەکەم جیابوومەتەوە، هیچ کات ژیانی رابردووم بە پێی دڵی من نەبوو، هەمیشە ئێش و ئازارم دەکێشا. بۆیە تکات لێ دەکەم چی دەبێت با ببێت دەنگم ببیسە. مێژووی ئەم نووسینانە هاوکات بوو لەگەڵ مێژووی یەکتر ناسینی من و روونی. وابزانم ئەو کاتانەش روونی ویستبووی کە بە دەرمان کردنی زامەکانی رەخشان، ناوبراو بکاتە مرۆڤێکی ساختە کە هیچ مانا و واتایەك نەدا بە ژیانی خۆی. رەخشان لە نێو نامەکەی خۆیدا تووڕە بوونی خۆیشی لە بەرانبەر من دەربڕی بوو و نووسی بوو" کاتێك کە دەمویست بگەمە تۆ، ئەم ژنە بیانییە لە کوێیەوە هات". تۆ دەڵێی دڵم بە حاڵی ئەم ژنە دەسووتێت، مەبەستت چییە؟ ئایا نازانی بەزەیی هاتنەوەت بە ژنێکی زانا و تێگەیشتی گەورەترین بێ ئیحترامییە، با مێشك و عەقڵی خۆی بەکار هێنابایا ئەو کاتە ئێستا بارودۆخی ئەمە نەدەبوو"...

هەر چەندە خوێندنەوەی ئەو رستانەی کە سەبارەت بە من بوون دەبوو بە هۆکاری بەدگومان بوون و تووڕە بوونی من، بەڵام هاتنی رەخشان بۆ ماڵی روونی و دەربڕینی متمانەی خۆی بۆ روونی ببوو بە هۆی نەمانی متمانەی من بە رووني. من نەمدەتوانی لەوە تێبگەم کە ئایا تا ئێستا هیچ جۆرە پەیوەندییەکیان بە یەکەوە هەبووە یا نا. من زۆر بیری ئەو شوێنەم دەکردەوە کە رەخشان تییادا نووستبوو. رەخشان نووسی بووی " ئەم شەو تا بەیانی گریام و کەم مابوو خۆم بکوژم تەنیا چاوەڕوانی ئەوە بووم کە یەکجار پێم بڵێ خۆشم دەوێی". هاوکات لەگەڵ پەیوەندی کردنەکەی تۆ بە سەر خۆمدا هاتمەوە، بە هیچ شێوەیەك نەمدەتوانی مانا و واتایەك بدەم بەو رستانەی کە نووسیت بوون. لە لایەکی دیکەوە لە سەر ئەو کارتەی کە لە بەیروتەوە بۆی ناردبوو نووسی بوو" ئیتر گەیشتنە ئەو تەمەنەی کە بە دوای شتێکدا گەڕابێت و دۆزیبێتەوە.... بۆیە تەنیا بیر لەوە دەکەمەوە کە بۆ گەیشتن بە تۆ دوا کەوتوومە. دەرنگ مامە، تەنیا درەنگ". یەکێك لە نامەکان هەر وەکو هەڵبەست نووسرا بوو، چونکە شتەکان هەر وەکو ئەوە بوون کە لە شاعیرێکی ناوداردا وەرگیرابن. ناوەڕۆکی ئەم نامەیە بەمجۆرە بوو

" بۆ ئەوەی کە منی نە بینیوە و دەنگی من نابیسێت. لە شاری بەیروت کە بۆنی بەهاراتی لێوە دێت بێ تۆیی بووەتە هۆکاری ناتەواو بوونی جەستەی من، ئاق بوونی ئاق (مەبەست رەش بوونی دەریای رەشە. وە) دەنیز و بارودۆخی گڕ گرتووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و بێ تۆیی تۆ بووەتە هۆکاری سامناك بوونی دووری تۆ. کاتێك کە برینەکانی خۆم لە دڵی خۆمدا دەشارمەوە هەبوونم دەبێت بە هەزار پارچە. ببیسە دەنگم! مەبە کەسێك بۆ کەسانی دیکە، ببە کەسێك بۆ من. کاتێك کە بێدەنگ دەبم بیر لە تۆ دەکەمەوە. باوەر ناکەم کە بە هیچ شێوەیەك ئازاری بیر کردنەوەی تۆ لە بێدەنگیدا کۆتایی پێ بێت. لە بەرەبەیانێکی شەوێکی لاڵدا لەگەڵ کتێبەکانی باوەشمدا خۆم خەستە بەر دەرگای ماڵت بەڵام گۆناکانم هێشتا نافز نەکرابوون و تۆیش کوێر بووی، کەڕ بووی و دیوارێك بووی لە بەرد و منت نەدیت و دەنگی منیشت نەبیست. هیچ شتێك تیری بیر بردنەوە ناکات. نە کتێبەکان و نە وشە زۆر باشەکانی نێو کتێبەکان...

دەچمە نێو بالکۆنەوە و کزە بایەك خۆی بە جەستەمدا دەدا، حەز دەکەم ئەو شتەی کە جەستەی من دەگەزێت نە کزە با بەڵکو جەستە و دەست و باڵی تۆ بێت. هیچ واتا و مانایەکی تەنیا بوون نییە. زۆر حەزم دەکرد لەگەڵ تۆدا لە بەیرووت، رۆما و کوردستان گەڕابام. لەگەڵ تۆدا لەو شوێنانە دەگەڕام کە تێیایاندا دڵی من زۆر ئێش و ئازاری کێشاوە. بە هۆی ئەوەیەوە

کە لە وەرزی بەهاردا نەهاتی زۆر لێت دڵخۆرم، چی دەبێت با بێت وەرە تەنیا بۆ جارێك باوەشم پێدا بکە".

ڕەخشان

لە دوای خوێندنەوەی ئەم نامەیەدا هەر هەمووی لەشی من دەستی بە خۆران کرد، خوێنم بەرەو وشك بوون دەچوو و قوورگم وشك بوو. من مافی ئەوەم نەبوو کە سەبارەت بە ژیانی رابردوو هیچ جۆرە لێپرسینەوەیەك لەگەڵ روونیدا بکەم. بەڵام قسە کردنە درێژخایەنەکانی لەگەڵ ڕەخشاندا کاتێك کە ببوونە هاورێی یەکتر منی زۆر ئازار دەدا. بەڵام کەوتنە نێوان ژن و پیاوێك بۆ کەسێك کە خۆی بە ئازاد بوونی خۆی ناسی بوو، ئەگەر بێ بەرپرسیاریەتی، بێ سەداقەتی و ڕووڕاست نەبوون و تێر نەبوون نەبوو ئەی چی بوو؟ ئاخ بۆ ئێمەی ژن.....

بە هۆی بەرگری کردن لەو مەترسییانەی کە ڕەنگە لە لایەن پیاوەکانەوە بهاتانا، ژنەکان جارێکی دیکە ناچار بوون کە خۆیان بخەنە ژێر باڵی پیاوەکانەوە. بە بێ ئەوەی کە روونی هەست پێ بکات وردە وردە دەستم بە کۆنترۆڵ کردنی ژیانی خۆم و خۆ رزگار کردن لەو هەستانە کرد کە منیان دیلی خۆیان کردبوو. ئایا ئەویش لەو کەسانە بوو کە کاتێك ئازاری کەسانێکی دیکەی دەدا هەستی بە هەبوونی خۆی دەکرد؟ وا هەستم کرد کە من زۆر لە ڕاستی کەسایەتی خۆم دوور کەوتوومەتەوە و زۆر زوویش بە وتەکانی ئەوانی دیکە متمانە دەکەم، بەڵام دەنگی ناخم دەیگوت" وا نییە، وا بیر مەکەوە". دەبوایا بە سەبربوویام و هیچ بەزەییم بە خۆمدا نەهاتبا. بیرم لەوە کردەوە کە بەبێ ئەوەی کەس هەست پێ بکات بارکەم و بڕۆم و دواتر بیرم لە زەینەب دەکردەوە و تۆزێك هێوەر دەبوومەوە. ئێش و ئازارەکانی ناخی من هانی منیان دەدا کە بەهێزتر ببم و بیر لە سەرکەوتن بکەمەوە. دەموچاوی خۆم بە ئاوی سارد شۆرد و سەیری ئاوێنەکەم کرد و وتم " هەر وەکو روونی هەم ڕووڕاست و هەم نادروستی ". لە نێو ئاوێنە دوو ڕووەکەدا ئەو زانابوونەی پیاوانم بینی کە لە نێو دارستانەکاندا بە دەستەوە هێنرا بوو.

ئایا ئەوان شاخ و ئێمەش گرد بووین؟ هاوکات لەگەڵ زاڵبوون بە سەر هەر هەمووی هەستەکاندا تەلەفۆونی زەینبم کرد و وتم" کاتێك کاروباری ناوەند کۆتایی پێ هات بێنەوە بۆ لامان". دەنگی زەینەب هەر وەکو مەرهەم بوو بۆ من. ئەو کاتەی کە زەینەب وتی" باشن تەندروستیتان باشە نە وایە؟" وا هەستم کرد کە چاوەکانی زەینەب لە سەر سەری مندان و هاوکات لەگەڵ دەنگی دەرگادا هەر وەك ئەو خوێندکارەی کە کارنامەی باشی بە دەستەوە هێنابێت هەستێکی یەکجار خۆش سەرتاپای منی داگرت. روونی بوو هاتەوە و وتی" ئەوەندە

ماندوو بوومه که خەریکه دەمزم، کوا بڕیار بوو ئەو ئەلبوومانەم بۆ بینی" کاتێك که وتم" چییه وات لیّ هاتووه هەر وەکو پارێزگاری داگیرکەری؟" روونی راوەستا و وەرەندازێکی قوولّی منی کرد و وتی" تۆ زۆر گۆڕاوی هیچ له تۆ تیّ ناگەم". کاتی ئەوه هاتبوو که وا بیر بکەمەوه نابیّ هەست بکەم -که قوربانم و پێویسته به سەبر بم. ئەو کاتەی که روونی تێگەیشت چەکمەجەی مێزەکەی کراوەتەوه زۆر تێك چوو و وتی" ئەم شتەی که تۆ کردووته لەگەلّ هیچ عەقلّ و ئەخلاقێکدا ناگونجیّ به چ مافێك تۆ ئەم چەکمەجەت کردووەتەوه؟" منیش له وەلاّمی روونیدا وتم" ئەریّ ئەو کەسەی که باسی ئەخلاق دەکات تۆی؟ ئەو مرۆڤەی که خاوەنی خۆی و ئیرادەی خۆی نەبێت نه دەتوانێت هەست به بەرپرسیاریەتی بکات و نه دەبێته خاوەن خۆشەویستییەکی راستەقینه. حەیف، کاتێك که هەولّت دەدا دلّی من به دەستەوه بهێنی هەر ئەو کاتانه هەناسەیشت له ئەوانی دیکه دەبڕی. ئەو کەسه که سادق و رووڕاست نییه هیچ مافی نییه که چاوەڕوانی سەداقەت و رووڕاستی بکات". کاتێك که من به دەنگی بەرز ئەم شتانەم هاوار دەکرد ئەو شتەی که هەستم پیّ دەکرد تەنیا ئەو رەق و کینه بوو که له ژێر عەقلّ و مێشکی خۆمدا هەستم پیّ دەکرد. روونی له سەر قەنافەکەدا دانیشت و سەری خۆی خسته نێو هەر دوو دەستی خۆیەوه و به دەنگێکی نزم و لەرزانەوه وتی" ئەو شتانەی که تۆ هەستیان پیّ دەکەی هیچیان وا نین، من دەمتوانی ئەو کاته چی به ژنێکی پارچه کراو که له هیچ شتێك تیّ ناگات بلێم" ئەریّ ئەوه تۆ نەبووی که دەتگوت" مرۆڤ کاتێك که حەز نەکات، ئارەزوو نەکات هیچ شتێك جێبەجیّ ناکرێت؟" خۆشەویستی، پەسەند کردن، به دوادا گەڕان و ئێش و ئازار کێشانی مرۆڤ بۆ تۆ، شتێکی زۆر باش و ماقوولّ بوو. چییه ئەم هەلّسوکەوتەی تۆ و ئەم هەستانەی تۆ که نه تێر دەبن و نه رادەوەستن" هەر وەکو ئەوەی که یەکێك له دواوه من رابکێشێت ئەوەنده توند خۆم به دواوه کێشا که ترسا و رابوو سەر خۆی و وتی" زۆر پێویستیم به تۆیه چی دەبێت با ببێت له من تێبگه" هەر وەك منداڵێکی گچکه بوو که له دایکی خۆی دەپاڕایەوه" وتی تەلەفۆن بۆ ئەو ژنه دەکەم و له گەلّیدا قسه دەکەم تۆیش ببه شاهێدی قسەکانمان، لەم کاته ساتانەدا دەستی بۆ تەلەفۆنەکەی برد و منیش به دەنگێکی بەرزەوه وتم" ئەم مەسەلەیه هیچ پەیوەندییەکی به منەوه نییه" و بەرەو دەرگا به ریّ کەوتم. وتی" راوەسته شێتایەتی مەکه، پێویسته قسه بکەین" دەستی من بەرزبوویەوه وتی" لێم بده با ئاسووده ببی، بەلاّم دلّم نەهات و دەستی منی نا به سەر چاوەکانییەوه، منیش به خێرایی دەرگام کردەوه و بەرەو خوارەوه به ریّ کەوتم.

تامی دەمم زۆر خۆش نەبوو و نەمدەزانی بۆ کوێ بڕۆم، گوێکانم کاس ببوون و لە هەبوونی جەستەی خۆم بێزار ببووم. مێشك و عەقڵی من بە ئەوەندەی ئەوەی کە نەتوانم بە شێوەیەکی ڕاست بیر بکەمەوە پارچە کرابوون. بە مەبەستی سەرهەڵدان لە بەرانبەر ئەم پارچە بوونەدا دەستم بە ڕاکردن بەرەو گوڵ کرد. هیچ ڕاستییەکم لەو ڕووناکییانە کە کەس نەیدەزانی لە کوێیەوە دێن نەدەدیت. ئەم هەستە ناخۆشانەم هەر وەکو گوڵی نەبوون مەند و قووڵ بوون. کاتێك کە دەمگوت" داخو لە بەرانبەر هەبووندا شتێکی دیکە هەبێت؟" دەنگی ناخی من هەر وەکو ئەوەی کە گاڵتە بە من بکات دەیگوت" نا، نا". ئایا هەبوون کات بوو؟ لە گۆشەیەکی ژوورەوە دانیشتم. قەبووڵ نەکردنی ڕاستییەکان بە مانای کێشانی ئێش و ئازارێکی زۆرتر و نەگەیشتن بە ناوەرۆکی بیروبۆچوونەکان بوو. ئایا بە ئەوەندەی ئەوەی کە نەتوانم بۆ بە دەستەوە هێنانی ئازادی ئێش بکێشم لاواز بووم؟ هەر چۆنە کە نەمدەتوانی پێشی لە بیرورا سەیرو سەمەرەکانی خۆم بگرم هەر بەجۆرەش هیچ هێزی بە ڕێوە چوونیشم نەمابوو. کاتێك کە فێنکایی شەو خۆی بە دارەکانەوە دەدا بەو هەستەی کە ئەم فێنکاییە ببێتە نەسیمێکی باش بۆ من سەیری ئاسمانم دەکرد. مانگ جار جار دەبینرا و جارجاریش لە پشت هەورەکاندا بزر دەبوو و ئەستێرەکانیش زۆر لە من دوور بوون.

نازانم چۆن گەیشتمەماڵەوە و هیچ ئاگام نییە کە چۆن پانزۆورەکانم داخستووە و لە سەر هۆشی خۆمدا چوومە... بەبێ ئەوەی کە وەڵامی تەلەفۆنەکان بدەمەوە و گوێ بە دەرگا لێدانی ڕوونی بدەم، ئەو کاتەی کە ڕوونی دەیگوت" چی دەبێت بۆ جارێکی دیکە دەرگاکە بکەوە" سەری خۆم دەخستە ژێر بالیفەکەوە و لە نێوان پانزۆورەکاندا سەیری باخچە و ئەو ئاگرەی جگەرەکەم دەکرد کە لەگەڵ بۆنی گیاکانی باخچەکەدا تێکەڵ دەبوو و دەمەویست خەم و ئێش و پەژارە کۆ بکەمەوە. کاتێك کە بیرم لە تەنیایی دەکردەوە بە بیرم دەهاتەوە کە بۆ ئەوەی کە پێویستیم بە کەسێکی دیکە نەبێت دەبوایا زۆر خۆم خۆش بویستایە و حەزم لە خۆم بکردایا. لە نێو هەستی بە هێز بوونی مندا ئەوەندە شتی جیاواز هەبوو کە جار جار تووشی بە با چوونی خەیاڵەکانم دەبووم. هاوکات لەگەڵ لە دژ ڕاوەستانی ئەوەی کە خۆشەویستی و عەشق ببێت وەکو چیرۆکێکی گەورە، زۆر ڕقیشم لە مرۆڤەکان دەبوویەوە. هەستی بە بڕیار بوون و خۆبوونی خۆم هەر وەکو ئەوە بوو کە جارێکی دیکە لە دایك ببمەوە. هەر چەندە لەم کاتە ساتانەدا بیری جیاوازیشم هەبوو بەلام هاوکات بیریشم لە متمانە بە خۆ نەکردن دەکردەوە. زۆر لاواز ببووم و لێوەکانیشم وشك ببوونەوە. لە نێو بێدەنگییە سەرسامەکەی ماڵەوە هەر شت لە نێو

بۆشایەتیدا مەلەوانی دەکرد. جار جار گوێکانی من بیریان لە دەنگەکانی رابردوو و دەنگە جیاوازەکان دەکردەوە. لە نێو ئەم بیرکردنەوەی گوێکانی مندا روونی و دەنگی روونی لە سەرەوەی هەر شتێکی دیکەدا بوو. لەم کاتەدا بە مەبەستی هەوڵدان بۆ خاڵی کردنی مێشکی خۆم دەستم کرد بە گوێبیست کردنی مۆسیقا بە دەنگی بەرز. یا خۆم سەرقاڵی کار کردن دەکرد یا شتە گچکەکانم زۆر گەورە دەکرد و بەجۆرەش رق و کینەی ناخی خۆم پەروەردە دەکرد. قۆناخی سەرسوڕمانی و شۆك بوونم تێپەڕاندبوو و سەیری ئەو باڵندانەم دەکرد کە باڵیان دەگرت و بۆ دوورە دەستان دەڕۆشتن. کاتێك کە هەستم بە جووڵانەوەی خۆم دەکرد تۆزێك ئارام دەبووم. ببووم وەکو جەنابی بلووم کە لە نێو کۆڵانەکانی دوبلیندا گا بە پێشەوە و گا بە پاشەوە شتێکم دەدیت و نەمدەدیت. نەخۆشی بینینی هەر شت و بیر نەکردنەوە لە سەر شتەکان وردە وردە رووی لە من کردبوو. بە هیچ شێوەیەك لە هەستە تێکەڵ بووەکانی خۆم رزگارم نەدەبوو. زۆر هەوڵم دەدا لەگەڵ بیر کردنەوەی رابردووی خۆم ناوی ئەو فەیلەسووفەش کە وتوویەتی" بیر کردنەوە لە قۆناخی مەعسوومییەتی منداڵی بە مانای پێگەیشتنی کەسایەتی مرۆڤە" بە بیر بهێنمەوە، بۆیە زوو بە زوو لە خۆم دەمپرسی " چی بوو ناوی؟" کاتێك کە نەمدەتوانی ئەم ناوە بە بیر بهێنمەوە وازم لێ دەهێنا. لە نێو ئەو شارەدا بووم کە ناوەندی کومیسارىای پاراستنی مافەکانی مرۆڤی تێدا بوو. شتێکی زۆر شەرمناك بوو کە ئەگەر مرۆڤ لە نێو بارودۆخێکی زۆر ئاڵۆزدا نەبێت و خۆی بە بێ هیوا و رەشبین لە قەڵەم بدات و دەست بە سکاڵا کردن بکات. بۆیە من بە هیچ شێوەیەك نەمدەویست ببم وەکو ئەو کەسانەی کە تەنیا بیریان لە خۆیان دەکردەوە و هەوڵیان دەدا جێگای ئەو کەسانە بگرنەوە کە مستەحەقی هاوکاری و پشتگیری کردنن. بێجگە لە تەلەفوونی زەینەب وەڵامی تەلەفوونی هیچ کەسێکی دیکەم نەدەدایەوە. کاتێك کە زەینەب باسی ئەو گوڵ و دارانەی دەکرد کە من ناوی ئەوانیشم نەدەزانی، دەیگوت پێویستە بە خێرایی بێ بۆ لامان. بێگومان منیش دەمگوت بە هۆی ئامادەکارییەکانی کردنەوەی پێشەنگا لە لایەن روونییەوە برێك سەرقاڵم. بە هۆی ئەوەیەوە ناکۆکییەکانی نێوان خۆم و روونیم بۆ زەینەب نەدەگێڕایەوە لە خۆم تووڕە دەبووم. هیچ جیاوازییەکی من و ئەو ژنە بێچارانە نە بوو کە سەرقاڵی جیابوونەوەی خۆیان بوون و بەڵام ئەمەیشیان هەر وەکو نهێنییەك دەپاراست و نەیان دەدرەکاند. دەنگی زاڤینیش دەهات کە دەیگوت " با لە یام ها مەلاهدا لە نێو ئەو گوڵانەدا یەکتر ببینین، من زۆر بیری تۆ دەکەم". من لە زاڤین فێر ببووم کە یام ها مەلاە کە وشەیەکی عیبرانییە بە مانای قەراخی گۆلە. کاتێك

کە سەیری ئەو کارتەم کرد کە روونی بۆمی نارد بوو دیتم کە بە مەبەستی بەشداری کردن لە پێشەنگایەکی تێکەڵدا لە ئەسپانیایە، لەم کاتەدا بیرم لەوە کردەوە کە پێویستە خۆم لە قوربان بوون رزگار بکەم و پێویستە فێری ئەوە ببم کە سەری خۆم لە بەرانبەر ئەو شتانە کە دەبنە هۆکاری ئازاردان و بێزار کردنی من بەرز بکەمەوە و خۆڕاگر بم. لەم کات و ساتانەیشدا روونی هەمیشە لە بەر چاوی مندا بوو، هەر چەند وەڵامی تەلەفۆنەکانیشم نەدەدایەوە، بەڵام زۆر حەزم دەکرد کە تەلەفۆنم بۆ بکات. چاوەکانی ژنەکەی پێشووی روونی ئاسمانی منیان تاریك دەکرد و خەونەکانی منیشیان دەپچڕاند. لە نێو ناخی خۆمدا پەنابەر بووم، کاتێك کە تاریکی شەوی نەمدار و تەڕی ژنێڤ دەستی پێدەکرد لە بەرچاوی مندا گڵۆپەکانی قەندیل تێپەڕ دەبوون. دواتر جموجوولەکانی بەربانگی ئێواران، ئەو رۆژوویانەی کە بە زەیتوون و خورما دەکرانەوە، گەشبینی باوکم لەم بەربانگانە و نەعلەکانی دایکم و ساز و تەمبوورەکەی کاکم... هاوکات لەگەڵ دەنگی ناقووسی کڵێسەدا هەر هەموویان بە بیرم دەهاتنەوە.

ئەو کاتەی کە هەر هەمووی شتەکان لەگەڵ ئێش و ئازارەکانی ناخمدا یەکیان دەگرت، وا هەستم دەکرد کە خەریکە بخنکێم، بۆیە بە خێرایی لە ماڵ دەچوومە دەرەوە و کاتێك کە بە تەنیا لە نێو کۆڵانەکاندا پیاسەم دەکرد نەمدەویست هیچ کەسێکی دیکە ببینم. هیچ نەمدەتوانی باری محتاج بوون و خاوەن ئێش و ئازار بوون هەڵبگرم. ملوانەکەی سەگەکەی کلاریسا لە هەر شتێکی دیکە بەنرختر بوو. ماریانا بە شێوەیەکی زۆڵانە سەری خۆی دەجووڵاندەوە و دەیگوت" زۆر بیری لێ مەکەوە" . هەورایش دەیگوت" چ پیاوێك، چ حەز کردنێك، هەی دایکی بفرۆشم". ئیپەکیش بەو لێوە ماکیاژ کراوانەی خۆیەوە جلوەیەکی کرد و بە دەنگێکی بەرز کەنیا، بارزانیش توانی کە هەستەکانی خۆی بشارێتەوە. من تەنیا متمانەم بە هەستە تاوێندراوەکانی رونالد دەکرد. وام دەزانی کە دەنگی رونالد گڕ دەبێت و دەست بۆ کەمانەکەی خۆی دەبات و بۆ من تۆزێك کەمان دەنوێنێت. هەڤاڵەکانیش دەیان گوت" ئازادی زۆر بە نرختر و گرانبەهاترە لە خۆشەویستی و کاتێك کە ئازادی لە ژێر هەڕەشەدا بێت بەنرختر دەبێت و هەر بەجۆرەش کاتێك کە لە خۆشەویستیدا جیا بوونەوە و دابڕان هەبێت ئەو کاتە خۆشەویستی نرخی خۆی نیشاندەدا". هەم دەمویست لە ئێش و ئازار رزگارم بێت هەم حەزم بە ئێش و ئازار دەکرد. ئایا یەکسانییەکی نوێ و خۆشەویستییەکی نوێ منی دەترساند؟ دەتوانم بڵێم کە منی دەترساند چونکە ئەگەری بزر بوونی مرۆڤ لە نێو ئەم خۆشەویستییەدا هەبوو. ئەو ماچانە و ئەو هەڵسوکەوتانەی روونی کە جێگای خۆیانیان لە نێو دڵی مندا کردبووەوە دەبوون

به هۆکاری ئەوەی کە بە بێ روونی بوون کاتژمێرەکانی ژنێڤ یەك لە دوای یەك ئازارم بدەن و ببن بە هۆکاری بێزار بوونی من. کاتێك کە شیان و حیلە و فێڵبازی شوکۆلات فرۆشەکانی سەر کۆڵانەکانم دەدیت زۆرتر تووڕە و بێزار دەبووم.

ئەو کاتژمێرانەی کە لە زانکۆدا وانەم دەگوتەوە برێك منیان ئارامتر دەکرد. لە نێو پۆلەکەدا ببووم وەکو ئەو ئەکتەرانەی کە لە بەرانبەر دووربینەکاندا هیچ ترس و هەیەجانێکیان نەبوو. وا هەڵسوکەوتم دەکرد کە هەر کەس بڵێت چەند زۆر زانە، هیچ شوور و شەوقی جوانیشم نیشاننەدەدا، زۆر بە ئاسانی دەمتوانی ئەم جۆرە هەڵسوکەوتانەی خۆم لە کاتی وانە وتنەوەدا بپارێزم. ببووم تەنیا مامۆستای خۆشەویستی ئەو هاوولاتییانەی ئەمریکای لاتین، باسك و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست. زۆر حەزم دەکرد کە ئەم هاوولاتییانە حەزیان لە منە و من توانیومە سەرنجیان رابکێشم. لە نێوان هەر هەمووی ئەو مرۆڤانەدا کە لە وڵاتی خۆیاندا ئێش و ئازاریان کێشا بوو و هاتبوون بۆ ژنێڤ، زمانێکی هاوبەش هەبوو. کاتێك کە بە زمانی وێژدانی خۆیان بانگی یەکتریان دەکرد بە منیشیان دەگوت کە پێویستە ئێمە هەر هەموومان یەك بگرین. کارلۆسی مکزیکی و رەفیقی پاکستانی کاتێك کە بە قینەوە سەیری یەکتریان دەکرد و وا نیشانیان دەدا کە لە نێوانیاندا خسوومەت و دوژمەنایەتی هەیە من تووڕە دەبووم. کارلۆس جار جار کاتێك کە سەیری منی دەکرد هەر وەکو ئەوەی کە گاڵتە بکات شەپەزللەیەکی کولتووری لە رەفیقی دەدا. بەڵام رەفیق بێدەنگی خۆی دەپاراست و بەجۆرە وەڵامی کارلۆسی دەدایەوە. کاتێك کە کارلۆس گاڵتەی بە ژیانی ئەوانی دیکەی دەکرد خۆی زۆر بە زل و گرنگ دەبینی و رەفیقیش هیچ هەڵسوکەوتێکی ناشیاوی نیشاننەدەدا، بەڵام بە چاو و سەیر کردنەکانی خۆی ئەوەی دەسەلماند کە یەکێکە کە هیچ کەس ناتوانێت دەستی خۆی بۆ بەرز بکاتەوە. کارلۆس کە هەر هەمووی هێز و زانستی خۆی دەخستە گەر بۆ ئەوەی کە بزانێت من سەبارەت بەو چۆن بیر دەکەمەوە، هەڵسوکەوتە ناشیاوەکانی کارلۆس منی بێزار دەکرد، هەر وەکو شەلاتەکانی سەر کۆڵانەکان سینگی خۆی دەکردەوە و ژلەی لە قژەکانی خۆی دەدا. بە هۆی ئەو بۆنە تووژ و نەخۆشانەیەوە کە بە کاری دەهێنان هیچ کەس نەیدەتوانی بەلایدا تێپەڕ ببێت. رەفیق زۆر بە پێچەوانەی کارلۆسەوە هەڵسوکەوتی دەکرد. رەفیق لەوانە بوو کە هەمیشە یەك پانتۆڵ و یەك کراسیان دەکردە بەرخۆیان و ریش و سمبێلە قێژەونەکانی خۆیانیان دەپاراست. بیر کردنەوە لە سەر ئەم تایبەتمەندییانەی ئەم دوو خوێندکارە مرۆڤی بێزار دەکرد. من زۆر ئاگام لە ئاستی دەنگی خۆم و هەڵسوکەوتی خۆم بوو، چونکە نەمدەویست کە هیچ

کەس من ئاگادار بکاتەوە. هیچ شتێك بە ئەوەندەی ئەوەی شەرمناك نەبوو کە تۆ ئۆمیدێك بدەیتە کەسێك و پێ بڵێ " دەی بخۆ ها لەگەڵ ئەم ئۆمێدەدا یاری بکە". من دەبوایا لەگەڵ هەرشتێکی خۆمدا زۆر سادقانە و ڕووڕاستانە ژیانم بکردایا. زۆر بوونی ئاستی زانیارییەکان بە مانای بەرز بوونەوەی ئاستی زانست نەبوو، چونکە خۆ ناسین و خۆ زانین گەورەترین سەرمایە و سەروەت بوو.

کاتێك کە خۆم بۆ فێربوونی ڕۆژانی بێ ڕوونی تەنگاو دەکرد، ئەو شوێنانەی دڵی من کە دەستیان لێ نەکەوتبوو دەبوون بە سەرچاوەی هێز بۆ من. بە باشی دەمزانی کە ڕوونیش زۆر بیر لە من دەکاتەوە. لە ڕێگای میدیاکانەوە ئاگاداری کاروباری پێشەنگا بووم. ئەو وێنەیە کە لە پرۆگرامەکەی " دوێنێ و ئەمڕۆی هونەر"دا هەڵواسرابوو کاریگەرییەکی زۆری لە سەر من کرد. ژنەکەی تەنیشت ڕوونی بە لا چاوەوە سەیری ڕوونی دەکرد. منیش هیچ لە لێکۆڵینەوە کردن سەبارەت بە ژیاننامەی ژانت پارکس خۆم بە دواوە نەخست. ناوبراو سرامیك کار و پارێزەرێکی جوانی مافەکانی مرۆڤ بوو لە بەریتانیا. ڕوونی لەو کەسانە نەبوو کە زوو بە زوو بیەوێ خۆی نیشان بدات و بۆ ئەم مەبەستەش بە خێرایی هەنگاو بنێت، من لەم تایبەتمەندییەی ڕوونی ئاگادار بووم. ژنە لێو گەورە و دەم کراوەکەی تەنیشت ڕوونی زۆر حەزی بەوە دەکرد کە ڕوونی هیچ مەیلی خۆ نیشاندانی نییە. ڕوونی هەمیشە دەیگوت" ئەو ژنانەی کە خاوەن دەم و لێوی گچکەن زۆر جیاواز و تایبەتن". شەش مانگ بۆ من هەر وەك شەش ساڵ بوو. دوو مانگی دوایی هیچ هەواڵێکی ڕوونیم نەدەزانی. جارێکی دیکە دەستم بە خوێندنەوەی ئەو کارتانەی دەکرد کە بۆ منی نارد بوون و گۆ بیستی دەنگەکەیم دەکرد کە لە تەلەسەکرەتەرەکەدا قسەی دەکرد. زەینەب کە هەر چەندە هەر لە سەرەتایەوە دەیزانی چی ڕووی داوە، بەڵام هیچ ئامۆژگارییەکی نەدەدا بە من، چونکە تارادەیەك من بە هیچ شێوەیەك نەمدەویست دنیای تایبەتی خۆم لەگەڵ هەر کەسدا بخەمە بەر باس. بە سەرکوت کردنی هەست و ترسەکانی خۆم دەمەویست جارێکی دیکە هەستی خۆشەویستی لە نێو خۆمدا گەش بکەمەوە.

قوتابخانەکان داخرابوون و ژنێڤ پڕ ببوو لە خەڵکی ئەم لاو ئەولا و ئاهەنگ، شایی و گوللە هەواییەکانی ئێواران وای دەکرد کە مرۆڤ هەست بکات لە سەر پارازەوییەکی دیکە دایە. کاتێك کە هەستم بە خۆشەویستی و عەشقی نێوان ئەوانی دیکە دەکرد چاوەکانم پڕ دەبوون و ڕام دەکرد بۆ ماڵەوە. لە بێ خەیاڵیدا بیرم لەو ڕووناکییە دەکردەوە کە دەکەوتە نێو ژوورەکەمەوە و زۆر بە قووڵی بیرم دەکردەوە. کاتێك کە لە ڕێگاکانی نێوان دۆڵی لومباردییە و

باشووری ولاّتدا پشووم دەدا و سەیری رووباری ئارنوم دەکرد کە بەرەو باشوورەوە دەڕۆیشت، ئەو مێوە و سەوزەواتەی کە لە نێو باخچەکاندا کۆمان دەکردنەوە و دەمانخواردن و دواتر دەستمان بە راموسان دەکرد بە بیرم دەهاتنەوە. ئەو تیشکە خۆرەی ئێواران کە دەکەوتە سەر دەم و چاوی رۆنی و تەمە گەرمەکە و بۆنی دارەکان و دڵە گەشەکانی ئەو کاتەمان بە بیرم دەهاتنەوە. هەر وەکو مستیکێك کە لە سەر هۆشی خۆی چووبایا سەیری ئاسمانم دەکرد و لە خوا دەپارامەوە کە " یاخوا ئەم خۆشەویستییە هیچ کۆتایی نەبێت".

کێ چی دەڵێت با بڵێت، مرۆڤ هەرچەندە کە ئیمانی بە خوا نەبێت، هەر چۆنە کە ئیمان وەکو بنەمایەکی کۆمەڵایەتی دەمێنێتەوە، هەستەکانی مرۆڤیش هەر بەجۆرە دەمێننەوە و بە شێوەیەکی گشتی لە ناو ناچن. کاتێك کە لە پورت بودا تێپەڕدەبووین جەنابی والتر بەیامینمان بە بیر هێنایەوە. لەم کاتە ساتانەدا من بیرم لە ترسی گەشتاپۆ کردەوە کە ئەوەندە زۆر بوو کە تێکەڵی هەر هەمووی باشییەکانیش ببوو. کێ دەیزانی کە جەنابی والتر بنیامین لەم رێگایانەدا بیری لە چی کردووەتەوە و لە کامە ژووری هۆتێلەکاندا کۆتایی بە ژیانی خۆی هێنابوو و گۆڕەکەی لە کوێ بوو؟ کاتێك کە لە ئوتۆبانەکانی پاریس کە چەندین بیرمەند و پیاوی گەورەیان بە خێو کردبوو بزر دەبووین، پیاوێکی چاو گەورەی مەلەز بە دەنگێکی بەرز و بە زمانی فەرەنسی وتی" بە دوام بکەون". دواتر کاتێك کە لە زەنگی شەودا بە دوای هۆتێلدا دەگەڕاین و لە سەر هەر کۆڵانێکدا رووبەڕووی ئەو خانەوادانە دەبووینەوە کە بە ماشینەکانی خۆیانەوە کێبڕکێیان دەکرد، شەفەق دەستی پێکرد بوو و ئاسۆ رووناك ببوو. کاتێك کە من لە ترسی سکپڕ بووندا راچڵەکییام، رۆنی بە دەنگێکی خەوینەوە وتی" ناتەوێ ببی بە دایك؟" ئەو کاتەش من بە تووڕە بوونەوە وەڵامی رۆنیم دابوویەوە و تبووم" نا چونکە هێشتا ئامادە نیم". کاتێك کە وەڵامی ئازمایشەکانم درایەوە و ئازمایشەکانم باش دەرچوو بوون، رۆنی هەر وەکو ئەوەی کە توانی بێت هەستەکانی من بخوێنێتەوە منی خستبوو نێو زیندانی چاوەکانی خۆیەوە. وتم " ئەگەر منداڵێکم هەبێت پێویستە لە تۆ بێت و خوێنی تۆ لە رەگەکانیدا بێت". رۆنی باوەشی بە منەوە کرد و ئەو کاغەزانەی کە وەڵامی ئازمایشەکان بوون فڕێدان. منیش بە دەنگێکی بەرز هاوارمکرد" تۆ شێتی".

لە فلورانسادا پێی هەر لە دەوری کۆشك دەسووڕایەوە، ئەو شینایەتییەی کە لە رۆمادا لە کاتی بە بیر هێنانەوەی ئودەئو بە دی دەکرا، دەنگە پەمبەییەکان گرانییەکی یەکجار زۆریان نیشاندەدا لە لیزیبوونی شاری شەمەندەفەرەکان و لە شاری لۆزان کە دەیگوت لە سەرتا پا لە

قاندرمە (دەرەجە) پێکهاتووە. ئایا هەر وەکو ئەوەی کە رووسەئا دەیگوت شارە گەورەکان دەبوون بە هۆکاری پووچکردنەوەی هەبوون و ئیرادەی مرۆڤ؟ پاریس کە گیانەوەرە شیرینەکەی بەلزاج بوو! هاوکات یەکەمین ئەدرەسی بۆنەکان و جوانکارییەکانی ئەوروپایش بوو. سەیر کردنە شانۆکارییەکانی تینیو ئەوەیان بە راشکاوی ئاشکرا دەکرد کە رقیان لەو کەسانەیە کە راز و نهێنییەکانی خۆیانیان بە توندی دەپارێزن.... ئایا ئەو مەدەنییەتە یا ئەو شارستانییەتە کە رۆڵێکی جیاوازی دەدا بەو شتە نوێیانە و کۆمەڵگەی پڕ دەکرد لە شتی نوێ و شتەکانی دیکەی زۆر فێڵبازانە لە ناو دەبرد دۆست بوو؟ ئاتۆلیەکان، تریبوون و ویترینی دوکانەکان و بەنەکانی پاریسییەکان و پاریسی دەم بە کەن دەبوون بە هۆکاری نوێ کردنەوەی هەستی متمانە بە خۆکردنمان. ئێمەیش دەمانگوت" ئێمەی ئێستا" .... بەنەکانی پاریسییەکانیش بۆ ئەوان خاوەن واتە و مانا بوون. ئەوانەی کە بەنەکان لە گۆشەی چاوەکانیاندا بوو مانای ئەوە بوو کە ئەم کەسانە کەسایەتی مێراقکەرە، ئەگەر بەنەکان لە ناوەڕاستی چەناکەکاندا بووبایا بە مانای هەموسەکسنێول بوو و ئەگەر لەسەر لووتیش بووبایا بە مانای جلوە بوو. ئەو کۆشکانەی ڤیەننا کە پەیوەندییەکانی نێوان کۆلە و خاوەن کۆلەکانیان هەر وەکو نهێنییەك دەپاراست و ئەو شوێنانەی فێر کردن و نواندنی مۆسیقا کە ناوەکانی هایدن، موزارت و بەتهوڤنیان لە خۆیان گرتبوو و بەجۆرە برە راتبێکیان بۆ خۆیان دابین کردبوو هیچ هەستیان بە نرخ و قیمەتی خۆیان نەدەکرد. ئەو دەنگبێژانەی خۆمان کە لە بن دیوارەکان و لە نێو بێستان و باخەکاندا بە دەنگی بەرز دەستیان بە حەیران گوتن دەکرد و ئێمەش بە هیچ شێوەیەك قەدر و قیمەتی ئەوانمان نەدەزانی، کاتێك کە من ئەم دەنگبێژانەی خۆمان لەگەڵ ئەوانی دیکە بەراورد دەکرد ئەو کاتە زۆر دڵم بۆ دەنگبێژەکانی خۆمان دەسووتا. ئایا تا ئەو کاتە کە زانست لە لای ئێمەدا بە پێش نەکەوتووبایا دەمانتوانی ئازاد بین؟

ئەو پێنووسە رەشەی کە لە گۆشەیەکی یەکێك لە ژوورەکانی هۆتێلی سەنسدا کەوتبوو منێکی زۆر گەورەی دەخستە نێو چاومەوە و لەگەڵ روونیدا دەستمان بە پێکەنین دەکرد. کاتێك کە دەنگی پێکەنینی ئێمە لە نێو تاریکی شەودا بەرزتر دەبووەوە دەنگی پچڕا و گیراوی ژنێکمان بیست کە بە زمانی فەرەنسی هاواری دەکرد" فێڵت لە من کرد، دەمەوێ بتکوژم". کاتێك کە ژنێڤ پڕ بوو لە نهێنی، منیش سەرقاڵی بیر کردنەوە لەو هەتاوە بووم کە دەکەوتە نێو گولەوە و رەنگی مەعدەنەکانی نیشاندەدا. هیچ هەواڵی روونیم نەدەزانی. ئێش و ئازار ناخی منیان دەخوارد و بە هۆی بێزار بوون و دڵتەنگ بوونمەوە زەختم بەرز دەبووەوە و

دادەکەوت. بۆ یەك کاتیش بێت روونی لە نێو مێشکمدا دەرنەدەچوو و زۆر بە باشی دەمزانی کە روونیش زۆر بیر لە من دەکاتەوە. بە هیوای ئەوەی کە روونی دەبینم بێدەنگ دەبووم، خۆم فێری نەبوونی روونی دەکرد و بەم بارودۆخەش کەیف خۆش دەبووم و بیرم لەوە دەکردەوە کە داخۆ روونی ئەمجارە بەرەو کوێ بەرێ بکەوێت.

کاتێك کە زەینەب و زاڤین بڕیاریان دابوو لەگەڵ ئەو گرووپەی ئاشتی کە بۆ خۆیان دایانمەزراندبوو سەردانی بەغدا بکەن، منیش وتم " ئەو کاتە منیش دێمە بەغدا بۆ لاتان". بڕیارمان وابوو کە لە دوای چاوپێکەوتنە رەسمییەکانی خۆمان سەردانی هەڵەبجەیش بکەین و چەندین پرۆژە پێشکێش بکەین، ماوەیەکی درێژ بوو کە رژێمی سەدام روخا بوو و حکوومەتی هەرێم دەسەڵاتی خۆی بە سەر بارودۆخەکەدا زاڵ کردبوو. لە بەشێك لە ناوچەکانی دیکەی عێراقدا شەڕ و پێکدادانێکی پارچە پارچە بە دی دەکرا. کاتێك کە زەینەب لە هەولێرەوە تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی بەرنامەی کۆمیسیۆنی ژنانی پەرلەمان بەرنامەیەکی زۆر بەرفراوانە و کاتی دەوێت و بۆ ئامادە کردنی چەند ئاتۆلیە و کۆبوونەوە پێویستە بۆ ماوەی دوو مانگ لەوێ بمێنینەوە، من بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەگەر بێت و لە ژنێڤ دوور بکەومەوە ئەو کاتە مومکینە کە نەتوانم جارێکی دیکە روونی ببینمەوە و چەند هەستی ئازار دەر لە نێو مێشکی مندا دەستیان بە جموجووڵ دەکرد. لەم کاتە ساتانەدا کەفی سەر ئاوی گۆلەکە بۆ من دەبوو بە خەردەڵ، گوللە، ماڵە وێران کراوەکان و دارەبڕاوەکان و ئەو کەسانەی کە لە دواوە مابوون.

پێویستی بە هیچ شتێك نەمابوو، کاتێك کە نیوەشەو بە دەنگی تەلەفوون لە خەو هۆشیار بووم، قوورگم وشك بوو. ئەوەی کە تەلەفوونی بۆم کردبوو روونی بوو. سەرەتا نەمدەزانی چی بڵێم و بێدەنگ بووم و دەلەرزیام و خۆم دا بە سەر مێزەکەدا و بە دەنگێکی نزم وتم" تۆی". روونیش بە دەنگێکی پەشێوەوە وتی" ناچار بووم کە بەم نیوە شەوە تەلەفۆنت بۆ بکەم، زۆر حەزم دەکرد کە ئێستا لە لاتدا بم. کاتێك کە وتی "نازانم چۆن پێت بڵێم " من وا بیرم کردەوە کە دەیەوێ بڕیاری کۆتایی خۆی ئاشکرا بکات. لەم جۆرە کاتانەدا تەنیشتی چەپی من دەستی بە خوران دەکرد و برێکیش هەستم بە سووك بوونی خۆم دەکرد. لە ناکاوەوە دەنگی روونی لە نێو گوێی مندا بەرز بووەوە و وتی" گرووپەکەی ئاشتی لە ناوچەی شەقلاوەقەزای کردووە" من ئیتر هیچ ئاگام لە قسەکانی دیکەی روونی نەبوو. کاتێك کە لە نەخۆشخانەدا بە سەر خۆم هاتمەوە هاوڕێکانم لە سەر سەرمدا بوون. تراژدییا، تەنیایی و ترسی مردن دەبوون بە هۆکاری جیاوازتر بوون و قووڵتر بوونی ژیان. بەو حەزە ساتانیستەی کە هەمان بوو، بیرمان لەوە

دەکردەوە کە مەرگ و مردن هەمیشە لە دەرگای ئەوانی دیکە دەدا، کاتێکیش کە بێ هیوا بوونیشمان دەبوو بە هۆکاری ئەوەی کە بە هیچ شێوەیەك حەزمان لە هیواو و ئاواتی خۆمان نەبێت، بە ئێش و ئازاری ئەوانی دیکەوە راو دەکراین و ئەمە لە کاتێکدایە کە ئەم راو کردنەش جۆرەیەك نەفسییەت و رۆحێکی زۆر قیزەون بوو.

ژیان هەر بەردەوام دەبوو و ئەو رۆژانەی کە چاوەکانی خۆم مێخی بۆشایەتییەك کردبوو، هەر هەمووی شتەکان واتا و مانای خۆیانیان لە دەست دابوو و بۆ من ببوون وەکو شتی بیانی و دوژمن. کاتێك کە خانەوادەی زەینەب وتی" زەینەب بە وڵاتی ئێمە خیانەتی کردووە و ئێمە جەنازەی ئەو کچە قەبووڵ ناکەین" بە وەرگرتنی مۆڵەتی خانەوادەی زاڤین بە رێوەڕەسمێکی شیاو جەنازەی هەردووکیانمان لە قەبرستانێکی دهۆکدا بە خاك سپارد. بە مەبەستی لە دەست نەدانی هیوا و هەستی ئەوەی کە رۆژێك دێت و زەینەب و زاڤین پێکەوە دێنەوە، سەیر و گۆبیستی هیچ جۆرە هەواڵێك سەبارەت بە مردنیانم نەدەکرد. دواتر لە دوای گریان و شین کردن، چەند گوڵێکم بۆ رۆحیان دەخستە نێو رووبارەوە و دەمگوت باش ئاگاتان لە باوکم، دایکم، کاکم، زەینەب و زاڤین بێت. لە خەیاڵی خۆمدا هەر شەو لە سەر شاخەکانی مەتینا و شەنگاڵدا بووم. لە پشتەوەی رووبارە گچکەکانی ئاودا دەستم بە پێکەنین دەکرد بۆ زەینەب. زاڤین و کاکیشم پێکەوە راویان دەکرد. دایکم سەرقاڵی کۆ کردنەوەی قارچك بوو و روونیش چیرۆکی سەردانە نهێنییەکەی تۆریستی ئینگلیزی بۆ کوردستانی دەخوێندەوە و منیش زۆر بە ئارامی نزیکی دەبوومەوە و گوڵێکی زەردم دەخستە لای گوێیەوە.....

داخۆ لە کاتی قەزاکەدا بۆ دوایین جار زەینەب و روونی بیریان لە چ شتێك کردبێتەوە؟ ئایا هەر شت لە ناکاوەوە رووی دابوو! مرۆڤ نامرێت، هەرشت وەکو ئەڵماسی ناب کار دەکات. دواتر من ئەو دوو خوشکەی زاڤین کە لە ئەمریکا دەژیان و تا ئێستا نەمدیتبوون ناسین، بە قژە فرەکان و چاوە نیوە رەشەکانیانەوە هەر وەکو زاڤین بوون، زۆر هێمن و ماقووڵ بوون. لە دەنگە نەرم و نیانەکانیانەوە من هەستم بەوە دەکرد کە داوای لێبووردنم لێ دەکەن. لێوەکانیان دەلەرزییا و دەیانگوت" کچی زەینەب". کاتێك کە چوومە ژوورەکەمەوە، بیانی بوون و بێکەس بوون بە شێوەیەکی زۆر باوەڕ پێ نەکراو کاریگەرییان لە سەر رۆحم کرد. دواتر دەنگی قاچی رەکەل و نانسی بوو بە هۆکاری گەش بوونێکی کاتی لە ناخمدا. لە نێو زەنگی و تەنیایی شەودا ناقووسە رۆحانییەکەی کلێسا جەستەی هەر هەمووی مرۆڤەکانی بە باوەش دەگرت.

کاتێك کە سەیری وێنەکانی سەر دیوارم دەکرد، چاوم بە وشەی ماریام زاڤین کەوت، ئەم وشەیە بە زمانی ئەرمەنی بە مانای دایکی زاڤینە. ئەو کتێبەی زەینەب کە ئامادەی چاپ کردن بوو، کاتێك کە باسی لەو رۆژانەی دەکرد کە زەینەب خەڵاتی پێدەدرا، ئەو کاتە من هەستم دەکرد کە ئەوان من باشتر لە خۆم دەناسن.

من وتم پێویستە وردە وردە برۆم و ماڵێك بۆ خۆم بدۆزمەوە، زۆر بە سەرسوڕمانی وتیان" ئەی خوایا، تۆ ئەمانەتی برای ئێمەی، چۆن ئێمە قەبووڵ بکەین تۆ بڕۆی بۆ شوێنێکی دیکە".

بیر کردنەوەی خۆم لە سەر زەینەب بە گەڕان لە نێو کتێبخانەکەی زەینەبدا تێدەپەڕاند. سەیری مێژووی ئەو کتێبانەم دەکرد کە دەیخوێندنەوە و تۆزێك ئارامتر دەبووم، هەر مێژوویەك شتێکی بە بیری من دەهێنایەوە. زەینەب شوێنە گرنگەکانی نێو کتێبەکانی بە شێوەیەکی زۆر رێکو پێك دەستنیشان کردبوو. لە نێوان لاپەڕەی کتێبەکاندا، لەکەی قەهوە، قژی زەینەب و پارچە وردەکانی سیرە وشك کراوەکانی ماڵی خۆمان هەبوو و کاتێك کە ئەم شتانەم دەدیت، ناخ و رۆحم دەکولان.... زۆر حەزم لە بیستنی دەنگی پای راکەل و نانسی دەکرد. بۆشایەتی و بێدەنگی ماڵەکە بارگرانییەکی زۆر بوو لە سەر من. کاتێك کە سەیری وێنەکانی زەینەبم دەکرد، خەیاڵەکانی خۆم و تەمەکەی ژنێتیم بە بیر دەهاتەوە و وام دەزانی کە زەینەب حەزی لە یەکێکە کە شەروان و تێکۆشەری ئازادییە. سەرم سوڕمابوو کە بۆ چی زەینەب هیچ باسی ئەم مەسەلەیە بۆ من نەکردبوو. ئایا هیچ پەیوەندییەکیان پێکەوە هەبوو؟

خۆشەویستی راستەقینە لە نێوان دوو کەسدا هیچ پێویستی بە ئاشکرا کردن و پڕوپاگەندە کردن نەبوو و باسکردن لەم جۆرە خۆشەویستییانەیش بە مانای ئامادە کاری بۆ کۆتایی هاتنی بوو. ئاخ زەینەب ئەی دەریای خۆشەویستی و شاخی عەشق.. کاتێك کە بە سەبر و رێبازی لێکۆڵەرەکان سەیری ژووری کارکردنی زەینەب و زاڤینم دەکرد هەر هەمووی شتەکانم تێکەڵدەکرد و بیرم لەوە دەکردەوە کە لە ناکاوەوە دێنەوە. جارێکی دیکە دەستم بە خوێندنەوەی ئەو بابەت و بەڵگانەی دەکرد کە سەبارەت بە مێژووی مزیوپۆتامیا و کوردستان بوون و تا ئێستا لە هیچ شوێنێك بڵاونەکرابوونەوە. لە سەر کاسێتێکدا نووسرابوو "تولوودەرە". کاتێك کە گوێیستی کاسێتەکەم کرد، لەگەڵ هاتنی دەنگی تراکتوردا، دەنگێکی ناشیرین و ناماقووڵیش داوای ناسنامەکان دەکات و دواتریش دەنگی زەینەب دەهات کە دەیگوت" ئەمە چ هەڵسووکەوتە، هەر ئەوە ماوە سەیری پشتی مانگاکانیش بکەین". دەنگە ناشیرینە ناماقووڵەکە بەرز دەبێتەوە و بە زەینەب دەڵێ تۆ زۆر قسە دەکەی. هاوکات لەگەڵ

دەنگی باڵندە گچکەکانی مانگی تەباخیشدا دەنگی مردن، خۆ کوشتن، شەڕ و هێرش کردنیش دەهات. لە کاتی هاتنی دەنگی ماشینە سەربازییەکانیشدا بیرم لەوە دەکردەوە کە لەگەڵ زەینەبدا بەو جۆرە ماشینانە لە ناوچە جیاجیاکاندا دەگەڕان و سەرەتا خەڵك لێمان دەترسا، وای دەزانی ئێمەیش سەربازی سوپان، بەڵام دواتر ڕێز و ئیحترامێکی زۆریان لێ دەگرتین.

نازانم خەیاڵم دەکردەوە و ئەمە خەیاڵ بوو؟ یا لاپەڕەکانی ئەو کتێبانە بوو کە دەمخوێندنەوە؟ هەرشت، هەم ڕاستی بوو هەم ساختە؟

هەم خۆم بووم هەم لە خۆم بیانی بووم و ژنێڤیش وەکو ڕووبارێکی خرۆشان. ڕوونە دابەش کراوەکەی نێو ڕووبارەکە، منیش بەشێك بووم لەم ڕوونە دابەش کراوە. ئەو شەمەندەفەرانەی کە بە خێرایی تێپەڕ دەبوون و ئەو وشانەی کە لە نێو مێشکمدا پارچە دەبوون و دواتر یەکیان دەگرتەوە. بیر کردنەوەکان و کاتژمێرە ڕاستەکان.... کاتێك کە داکە دانسیان (جۆرەیەکی ڕەقس و سەما. وە) دەکرد، چ بارودۆخێك بوو؟

زۆر حەزم دەکرد لە بناری شاخەکانی ئەزمەڕدا بێهۆش ببم. ئەو ڕۆژانەی کە بەجۆرە تووشی پەرێشانی و پەشێوی دەبووم، زەینەب دەهاتە بەرچاوم و کاتێك کە بە پێکەنینەکانی خۆیەوە سەری خۆی دە جووڵاندەوە وا هەستم دەکرد کە پێم دەڵێ" نابێ تۆ بەجۆرە لاواز و پەشێو بی"، لەم کاتە ساتانەدا هەستم دەکرد کە دەستە نەرمەکانی زەینەب لە سەر شانی منداڵ و بەو بۆنەی لەڤانتا کە تایبەت بوو بە زەینەب ڕادەچڵەکام و دەمگوت" دەزانم ئاگاداری کە لە ژووری کارکردنەکەتدا دەگەڕام تۆ لێرەی".

کۆتایی وەرزی هاوینە و جەستەی شار لە دوورەوە دیارە. بۆنی ئەو ژنانە دەهات کە لە نێو گەرمایی کەش و هەوادا ڕامووسانیان دەکرد و لە سەر شووشەکەوە سێبەری گۆڵەکانیش دەجووڵایەوە. بە هیچ شێوەیەك نەمدەتوانی لە ئێش و ئازار و گەشبین بوون خۆم ڕزگار بکەم. ئێش و ئازار و گەشبین بوون هەر وەکو دوو ئەسپ بوون کە ڕایان دەکرد. ئێشەکانم لە شاخەکانی ئالپدا بە سەر دەکەوتن و گەش بینییەکەشم لە دەشتی حەراندا بۆ خۆی دەگەڕا. هەر ڕۆژ لەم کاتە ساتانەدا مێشەکانیش هێرشی باخچەکەیان دەکرد. دەنگی شەمەندەفەر و قاڵە قاڵی ئەو منداڵانە کە لە کاتژمێرەکانی نێوەڕۆدا بێ کار دەبوون. ئەو مێشانە کە خۆیان دەخستە نێو گوڵەکانەوە لەگەڵ خەم و ماتەمینی مندا دەجووڵانەوە. چاوەکانم سەیری ڕووناکی سەقفەکەیان دەکرد و لووتم دەسۆڵایەوە. (ئاو لە لووتمدا دەهاتە خوارەوە. وە) من شینایەتییەکەی ئەحمەدئاوابووم کە لە نێو ئەو تەمەیدا کە لە چیاکانی شەمیرا، باڵامبو و

شینورڤەوە بەرز دەبوویەوە سەری خۆم هەڵدا بوو. کاکم لە سەر کانیاوەکەی عەشقدا ئەسپەکەی خۆی تیمار دەکرد و دایکیشم لە دەست گاڵتەکانی پورشەڤدا وەرەز ببوو و باوکم زۆر بە وردبینییەوە گۆییستی دایکمی دەکرد و دەیگوت" شێر شێرە جا چ ژنە چ مێرە". لەگەڵ بەرفیندا دەچووینە سەر دارەکانەوە و سەیری ئەو ژن و مێردانەمان دەکرد کە پێکەوە دەمقاڵەیان بوو. لەم کاتە ساتانەدا تۆزێك هەستم دەکرد کە ئارامتر دەبم بەڵام دواتر بارانی زەرد و بۆنی سێوی گەنی جارێکی دیکە دەستی بە ئازار دانی من دەکرد و بە مەبەستی لە بیر بردنەوەی ئازارەکان سەیری مێشەکانم دەکرد. ئەو پانتاییە کە روونی هێنای بوو سەیری منی دەکرد. بە هۆی ئەوەیەوە کە بەزەییم بە خۆمدا دەهات تووڕە دەبووم. لە ترسی ئەوەی کە روونی بیروڕاو بۆچوونەکانی من بخوێنێتەوە لێ دوور دەکەوتمەوە و نەمدەویست بە هیچ شێوەیەك فرمێسکەکانی من ببینیت. زەینەب بۆ من ببوو وەکو ئەستێرەیەکی دوور و خەیاڵێکی مەحاڵ.

کاتێك کە کاکم دەستی بە پێشمەرگایەتی کرد، لە ماڵەوە مەولوودمان و گۆشت و ئێسقانی ئاژەڵە سەربڕاوەکانیش لە سەر گیا وشکەکانی نێو باخچەکەدا دانران و نایلونیان بە سەردا کێشرا. من سەیری ئەو پیاوانەم دەکرد کە بەو سمبێڵە قێزەونانەی خۆیانەوە دەستیان بەخواردنی گۆشت و پڵاو دەکرد و دواتر دەم و ددانی خۆیانیان بە سەر قۆڵەکانیانەوە خاوێن دەکردەوە و زۆر بە کەیف خۆشییەوە لە گیرفانی خۆیاندا توتنیان دەردەهێنا و دەستیان بە پێچانی جگەرە دەکرد. لەم کاتو ساتانەشدا کچە جوانەکان بە مەبەستی ئەوەی کە بتوانن بۆ کاتێکی کورتیش چاویان بە خۆشەویستەکانیان بکەوێت دەستیان بە پێشبڕکێ بۆ خزمەت کردن دەکرد. پیاوەکانیش بە بێ ئەوەی کە کەس هەستیان پێ بکات، بە لای چاوەوە سەیری خۆشەویستەکانی خۆیانیان دەکرد و هەر وەکو ئەوەی کە بلێ دەیانەوێ هەستەکانی خۆیانیان سەرکوت بکەن دەستیان بە گاڵتە کردن و قسە کردن بە دەنگی بەرز دەکرد.

ئەو شەوە لە قسەکانی باوك و دایکم تێگەیشتم کە کاکم عاشقی زۆزان بووە، لە تووڕە بوونی خۆمدا دەستی خۆم گازم دەکرد. کاتێك کە هەر رۆژ ئێواران کاکم لە بەر دەرگای ماڵی زۆزاندا بە ئەسپەکەی خۆیەوە تێپەڕ دەبوو زۆزانیش لە سەر بانەوە خۆی سەرقاڵی رێکخستنی جێگەو بانەکانی سەر بانی دەکرد. لە بن دارە توەکەدا چاوەکانی خۆم دادەخست و بۆ ئەوەی هەڵۆەکان دەموچاوی زۆزان کون کون بکەن ، یا مەلای چڕتێك ئیفترایەکی بە زۆزانەوە ببەستێت دوعام دەکرد. هەر وەکو

ئەوەی کە خۆشەویستی هەستە خراپەکانی من گۆڕی گرتبێت، مەلای چڕتکێش بە نهێنی ئەو هەستانەی ڕێك دەخستەوە و دەستی بە نووسینی دوعا دەکرد.

ئەو شارانەی کە هەر هەمووی سەرمایەیان لە خۆیان بوو بێدەنگ بوون، مرۆڤەکان چەندە دووربوون... هیچ کەس ئاگای لە دەردی ئەوی دیکە نەبوو. ئەو ڕووبار، دەریا و شاخانە کە بۆ مێژوو شاهێدییان کردبوو.... من بۆ کوێ ڕۆیشتبام با ڕۆیشتبام بەڵام من هەمیشە هەر لە هەڵەبجەدا بووم.

کاتێك کە لە قەراخەکانی گۆڵەکەدا دەستمان بە پیاسە کردن دەکرد من دەمگوت لە خۆشەویستی ڕوونی بە هیچ شێوەیەك وەڕەز نابم. نەبیستن و هەست نەکردنی مرۆڤەکان بە مانای پارچە بوونی هەست و ڕۆحیانە. ئەو هەستەی کە لە نێوان ئارەزوو و حەزکردندا جێگای خۆی کردووەتەوە نە بێزار دەبێت، نە هەڵدەخەڵەتێنرێت و نە نکۆڵیٚ لیٚ دەکرێت. بە دەستە بە هێزەکانییەوە باوەشی بە مندا دەکرد، ڕووباری پڕ لە شەپۆلی هەمەرسون، ئەو فرمێسکانەی کە بە ڕەنگی شەراب بوون و لەگەڵ بۆنەکەیدا پێکەوە هەڵم دەکێشان. لەم کاتە ساتانەدا منیش دەمگوت بەر لەوەی کە خۆم لە دەست بدەم پێویستە بزانم کە چۆنە خۆم بۆ خۆشەویستی پاڵێوراو بکەم. کاتی ئاوابوونی هەتاو و فێنك بوونی هەوای گەرم، کاتو ساتی لە سێدارەدانی یەکێك لە هاوڕیٚ سەرەکییەکانی با پیری ڕوونی شێخ سەعید بوو. بە شەوان کاتێك کە هەناسەمان تێکەڵی یەکتر دەبوو لە نێو دڵی خۆماندا خۆمان دەشاردەوە. ڕوونی زۆر بە شانازییەوە هەمیشە دووبارەی دەکردەوە کە بە ڕەسەن خەڵکی دەڤەری سەرحەدە و باپیریشی لە دژی دەوڵەت و پیاوەکانی دەوڵەت سەری هەڵداوە. مرۆڤە کۆییە کراوەکانی سەردەمی عوسمانییەکان بە مەبەستی پاراستنی بەرەژوەندییەکانی خۆیان لە نێو ژیانی ڕۆژانەدا هەر جۆرە کارێکیان بۆ دەوڵەت دەکرد. کاتێك کە ڕوونی باسی ئەوەی دەکرد کە لە کاتی خۆیدا چۆنە هەندێك لە خەڵکیان هەڵخەڵەتاندووە، ئەو کاتە من بە دەنگی بەرز و بە شێوەیەکی بیٚ ڕێزانە دەمگوت " تۆ ئەم شتانە بۆکیٚ باس دەکەی". ڕوونی بێدەنگ دەبوو و دەنگی هەردووکمانیش لە ژێر ڕووناکییە بیٚ هێزەکەدا تێکەڵ دەبوو. لەم کاتە ساتانەدا هەستی ئەکتەر بوونی من گەش دەبوو و منیش لە سەر قەرەوێڵەکەمدا دەستم بە لاسایی کردنەوەی ئەو کەسانە دەکرد کە لە بنەماڵەی ئاغا، شێخ و مەلاکان بوون. ئەم جۆرە مرۆڤانە لە پەیوەندی دوو کەسیدا خۆیان و سەری خۆیان بۆ مرۆڤ دەنەواند بەڵام لە بەرانبەر کەسی سێیەمدا سەری خۆیانیان بەرز دەکردەوە کە گوایا بێجگە لە ئەوان هیچ کەسێکی دیکە لەم دونیایەدا ژیان ناکات. لە هەر

شوێنێکدا هەمیشە هەر لە سەرەوە دادەنیشن و هەمیشە لە نێو دەرگاکاندا یەکەمجار ئەوان تێدەپەڕین، تا ئەو کاتەی کە ئەوان دەست بە نان خواردنیان نەکردبایا هیچ کەسێکی دیکە دەستی بە نان خواردن نەدەکرد، کاتێکیش کە دەچوونە ژوورەوە دانیشتووەکان هەر هەموویان هەڵدەستان سەر پا و دەیانگوت" میرم، ئاغام، گەورەم، شێخم".

بە بیانووی ئەوەی کە سلالە و بنەماڵەکانیان دابەش نەکەن بە هیچ شێوەیەك ئامادە نەبوون کە لە بیانییەکان کچ بخوازن ، یا کچی خۆیان بە بیانییەکان بدەن، کاتێك کە من دەمگوت ئەم تایبەتمەندییەی ئەوان بە هۆی نەزان بوونی ئەوان بووە ڕوونی تۆزێك پێ ناخۆش دەبوو. ئەمجۆرە مرۆڤانە هەمیشە بە ناوی پادشاکانی عوسمانییەکان خۆیانیان بەرز دەکردوەوە و شانازییان بەم شتانەوە کردووە و هەمیشە ناوەکانی وەك یاووز، ئالپ ئەرسەلان، سەلیم و فاتێحیانیش لە منداڵەکانی خۆیانیان ناوە.

مامی ڕوونی کاتێك کە لە ناوچەی یالۆڤادا سەرقاڵی سەربازی بووە، عاشقی کچێکی کەرکەز بووە، هەر بۆیە مامی ڕوونی جارێکی دیکە هیچ سەردانی ناوچەکەی خۆی نەکردووە. هەر کەس لە چایخانەکاندا کاتێك کە یارییان کردووە و چایان خواردوەتەوە گوتوویانە" هیچ دەنگ و ڕەنگی سلێمان دیار نییە ئەوە چی بە سەردا هاتووە". سەرەتا ئەو کەسەی کە لە کاتی خۆیدا لە قەراخی دەریاکەدا شت و مەکی فرۆشتووە و دواتر بووە بە مەلەوانی پاسەوانی قەراخەکانی ئاو ویستوویەتی دەست بە قسە کردن بکات بەڵام بە هۆی زمانییەوە نەیتوانیوە بە باشی قسە بکات و وتوویەتی" نە شەڕ، نە مردن و نە مرۆڤ و نە گوند و ناوچە هیچ بایەخێکیان بە لای سلێمانەوە نییە چونکە ئێستا هەر هەمووی هەست و نەستی سلێمان تەنیا ئەجلای هاوسەریەتی. سلێمان بە ڕوونی برازای خۆی وتوویەتی" برازا زۆر تۆم خۆشدەوێ بەڵام لە دوورەوە، ژیان کورتە و منیش بۆ مردن لە دایك نەبوومە". دواتر سلێمان خۆی تێکەڵی کاروباری مافیا کردبوو و ویستبوو لە گۆشەیەکدا بۆ خۆی گازینۆیەك بکاتەوە بەڵام مەجالیان پێ نەدابوو. سلێمان ڕووبەڕووی یارییەکی ئەوتۆ ببوتەوە کە بە لە دەستدانی گیانی خۆی کۆتایی پێ هاتووە. ڕوونی ئەمجارە زۆر شەرمی لە سلێمانی مامی دەکرد کە بە مەبەستی بردنی مرۆڤەکان بۆ ئەوروپا پارەیەکی زۆری لێ وەردەگرتن و دواتر لە سەر سنوورەکاندا ئەوانی بەرەڵای نێو شوێنە پڕ لە مایینەکان دەکرد. ڕوونی هەمیشە دەیگوت" مەتارەی ئاو هەمیشە لە نێو ڕێگای ئاودا دەشکێت".

من زۆر سەیری نێو چاوانی روونیم دەکرد و کاتێك کە قەهوەی دەخواردەوە و چاوەکانی دادەخست هەر هەمووی رەفتار و کەسایەتی روونیم لێك دەدایەوە دەکرد، لێکدانەوە و شی کردنەوەی کەسایەتی مرۆڤەکان ببوو پیشەیەکی سەرەکەی من و جارجاریش لەم روویەوە هاوکاری روونیم دەکرد. کاتێك کە دەمگوت، ئەمە رووراستە، ئەمە درۆ کەرە، ئەمە چەپگەرە، ئەمە راستەگەرە، ئەمە خاوەن پەیوەندی نهێنی جنسییە و... ئەم کارەی من دەبوو وەکو یارییەکی پڕ خۆش بۆ هەر دووکمان و ئەو کاتە متمانەمان بەوە دەکرد کە تا ئەو کاتەی کە مرۆڤێك نشتەرگەری جوان بوون نەکات جوان نابێت.

روونی زۆر حەزی لە دایکی و ئەو رۆژانەی کە لە بارودۆخێکی باشدا بوونە و وردە وردە بەرەو بارودۆخێکی خراپ و ئالۆزەوە چوونە و گۆزەرانیان تەڵخ بووە دەکرد. کاتێك کە باسی ئەو رۆژانەی دەکرد کە دایکی بە ناوی پەنیر هەویری دروست کردووە و پەکمەزی تێکەڵی چای کردووە دەنگی روونی گڕ دەبوو و دەیگوت" ئەو وشکەساڵییە کە سێ ساڵ بەردەوام بوو هەر کەسی ماڵوێران کردبوو". کاتێك کە لە شەوانی ساردی زستاندا لە دەور سووبە سوور بووە تەنەکەییەکەدا هەر کەس کۆبووەتەوە و چاوەڕانی ئەوەیان دەکرد کە رێگاکان بکرێنەوە، چیرۆك و داستانە کۆنەکانیشیان یەك لە دوای یەك دەگێڕایەوە. کاتێك کە دەنگی رەشە با لە دەرگاکەوە دەهاتە ژوورەوە ئەو کاتە مامۆستا و ژنەکەی کە خەڵێکی مەغوولا بوونە هاتوونەتە ژوورەوە. ژنی مامۆستا کە ناوی مینا بووە، ژنێکی زۆر جوان و رێك و پێك بووە. هەر کات کە دیتوویەتی کە لە سەر پاڵتۆکاندا ئەو کەسانەی کە مردوونە بە سەر بەفردا کێشاویانن دەستی بە لووتی خۆیەوە گرتووە و دەستی بە گریان کردووە و وتوویەتی" منداڵم بۆچییە، لێرە تەنیا جەنازەمان دەردەچێت". روونی لە درێژەی قسەکانیدا ئاماژەی بەوە دەکرد کە هەر هەمووی پیاوەکانی گوندەکەیان عاشقی مینا بوونە. کاتێك کە راوچییەکان لە راوەوە دەگەڕانەوە و باشترین راوی خۆیانیان بۆ ماڵی مامۆستا بەرێ دەکرد، مامۆستا بۆ خۆی لە جیاتی ئەوەی کە لەم هەڵسوکەوتەی پیاوە راوچییەکان تووڕە ببێت بە پێچەوانەوە زۆر کەیف خۆش بووە و لە ژێر سمبێلەکانی خۆیدا بە پێکەنینەوە وتوویەتی" ئەگەر ماڵ دروست بکەی لە توغلا، کچ دەهێنی لە مۆغوولا". روونیش لە مینایەوە فێری خوێندنەوەی کتێب بوو. لە شەوە درێژەکانی زستاندا کاتێك کە لە سەر نەخشەی جیهاندا ناوی وڵاتان، شارەکان، شاخەکان و رووبار و دۆڵەکانیانی فێر بووە باوکیشی وتوویەتی" روونی کوڕم دەبێتە ئەندازیاری رێگا".

به مەبەستی قووڵترکردنەوەی شوور و هەیەجانەکەمان باسمان لە یەکەم رۆژانی یەکتر ناسینمان دەکرد. کاتێك کە رووبی هاوکاری منی نەدەکرد بۆکۆکردنەوە و پێچانەوەی جانتاکان، خواردنی هەر هەمووی مووزەکان لە لایەن رووبییەوە بە بیرم دەهاتەوە. لەم کاتەدا رووبی زۆر بە گاڵتەجاری دەیگوت" دەی زوو بگرە بگرە تۆزێك بگرە". کاتێك کە لە نێو ماڵەکەدا دەگەڕا و دەیگوت گەڵایەکی دارهەنجیرەکەم کەمە، ئەو کاتە هەستی متمانە بەخۆبوونی رووبی هەرچەندە بۆ ئەوانی دیکە بێزارکەر بوو، بەڵام بۆمن شتێکی زۆر باش بوو. من زۆر دڵ شکاو بووم بەڵام سەرەڕای ئەمەش لە ژێر هەڵسوکەوتی نەرم و شیاوی مندا هەستێکی موتڵەقگەری و دوور کەوتنەوە خۆی بە هێز دەکرد. رووبی زۆر حەزی لە دوور کەوتنەوەی من دەکرد و دەیگوت" ئەو ژنانەی کە دوور دەکەونەوە ئەو ژنانەن کە هیچ کات بێزار نابن". چەندین تایبەتمەندی هاوبەشی من و رووبی هەبوو. جار هەبوو کە بە چەند کاتژمێر لە نێو ژوورەکەماندا دەرنەدەکەوتین و کاتێك کە بیری یەکترمان دەکردەوە بە بیانووی پڕو پووچ دەستمان بە رست دەکرد و هاوارمان دەکرد کە کاتی چای خواردنەوە و مێوە خواردن هاتووە. کاتێك کە سەرسوڕمان بوونی خۆمان لە بەرانبەر ئەو ژن و پیاوانەی کە لە بەر تەلەفزیۆنەکاندا دەنووستن و رامووسانیان دەکرد و بێجگە لە کۆکردنەوەی پارە هیچ ئاواتێکی دیکەیان نەبوو، ئەو کاتە شانازیمان بە خۆمانەوە دەکرد. کاتێکیش کە باسی ئەوەمان دەکرد کە هیچ کەس ناتوانێت ئێمە لە یەکتر بێزار بکات ئەو کاتە ترسەکانی خۆمانمان لە یەکتر دەشاردەوە.

رەشە بای دەریای ئازادی، دڕکی گوڵ....

کاتێك کە دەستمان بە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە دەکرد ژمارەی ئەو کەسانە کە لە دەرگای ئێمەیان دەدا وردە وردە کەم دەبوویەوە. ئەو کەسانە کە لە دەوری ناوەند و رێکخراوەکەدا کۆ ببوونەوە و ئێمەیان دەناسی تەنیا جار جار بە مەبەستی گەیاندنی دەعوەتنامەی جۆراوجۆر دەرگای ماڵی ئێمەیان لێ دەدا. لە رۆژە تایبەتییەکانیشدا رونالد دەهات بۆ لامان و هەمیشە لە چاوەڕوانی ئەوە بوو کە خۆشەویستە نوێەراسیەنەکەی (مەبەست ئەو کەسەیە کە لە نێو کۆمەکانی نوێەرادا جێ دەگرێت. وە) دەگەڕێتەوە. بارزان گەیشت بوو بە مرادی خۆی و دەستی بە کاری هەنارده کردن و هاوردە کردن کردبوو و پارەیەکی یەکجار زۆریشی بە دەستەوە دەهێنا. بارزان هیچ نەگۆڕا بوو و هێشتاکە زۆر بە باشی دەیزانی کە بە پێی تام و چێژی هەر کەس شەربەت دروست بکات. (مەبەست هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ مرۆڤەکانە. وە) بارزان کاتێك کە ئێمەی دەبینی هەر وەکو رابردوو هەڵسوکەوتی دەکرد، بەڵام لە بەرچاوی

بیانییەکاندا وا هەڵسوکەوتی دەکرد کە گوایا شاخە بەرزەکانیش لە لایەن بارزانەوە دروست کراون. کلاریسایش ببوو بە سەرۆکی ناوەندی هەمجنس بازەکان و هاوکات لەگەڵ سەگەکەی خۆیدا وێنەی خۆی لە نێو گۆڤارە ئەیروتیکییەکاندا بلاودەکردەوە.ماریاناش ناوەندێکی هونەری دامەزراندبوو. هەورایش کە هیچ متمانەی بە پیاوەکان نەدەکرد لەگەڵ کارسازێکی توونسیدا ژیانی هاوسەری پێك هێنا بوو لە دەڤەری نیجەدا بە جێ ببوون. شتی هەرە سەرنجراکێش بۆ من تەنیا مەسەلەی هەورا بوو. ئیپەکیش لە دوای ئەوەی کە هەوڵی خۆ کوشتنی دابوو و رزگاری ببوو لە نێو نەخۆشخانەیەکی تایبەتیدا دەرمان دەکرا. کاتێك کە من سەردانی ئەو نەخۆشخانەم کرد کە وەکو گوڵ دروست کرابوو دیتم کە ئیپەك لە بەرانبەر ئاوێنەکەدا لەگەڵ خۆیدا قسە دەکات و لە شتی رەنگاورەنگە گچکەکانیش بۆ خۆی مەلەوانی دروست دەکرد. بە چاوێکی خۆی سەیری منی کرد و لێوە سیلکۆن کراوەکانی خۆی کردەوە و کاتێك کە وتی" ئایا تۆیش دەتوانی ئەم کارە بکەی؟" لە ناکاوەوە هەڵستا و دەستی بە پێکەنین کرد و وتی" تۆ لەم شتانە هیچ تێناگەی بۆیە شتی هەرە باش ئەوەیە کە کتێبەکانی خۆت بە بەنێك پێکەوە ببەستی و بە ملی خۆتەوە بکەی، ئایا ئەو کتێبانەی کە تا ئێستا خوێندوونەتەوە لە جەستەی تۆ گەورەترن؟" لەم کاتە ساتانەدا من هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و سەیری ئاسمانم کرد. ئەو ملەوانانەی کە بە دەستی روونی دروست کرابوون ببوون بە هۆکاری لە خۆ بایی بوونی ئیپەك.

کاتێك کە وەرزش کردن لە سێ رۆژی حەفتەم تێکەڵی ئەو پیاسانەی کرد کە ببوون بە بەشێك لە ژیانی من ئەو کاتە من هەستم کرد کە زۆر باشترم. ئەو ژنە تەمەن ٨٠ ساڵانە کە وەرزشیان دەکرد هەر وەکو ژنە تەمەن ٤٠ ساڵەکان خاوەن هێز و توانایی بوون و هاوکات لەگەڵ ریتم و ئاهەنگی شتەکانی دەوروبەری خۆیان شانازییان بەو شتانەوە دەکرد کە دەیان نووساندن و هەر وەکو پادشاکان خۆیان گەورە دەکرد. من لێرە لەگەڵ تائیسدا یەکترمان ناسی. کاتێك کە ناوبەرمان دەدا پێکەوە دەچوونە گۆشەیەکەوە و سەیری ئەو ژنە لووت بەرز و لە خۆباییانەمان دەکرد. دڵەکان جارجار یەکتر بۆ لای خۆیان رادەکێشن و یەکتر دەناسن. ئەو ژنە کە لە لایەن مێردەکەیەوە تەڵاق درابوو زۆر رەنگ و بۆی سورەیای دەدا. زمانم خۆی نەگرت ، بۆیە هاوارم کرد سورەیا. مێردەکەی سورەیا سەمەد، پیاوێکی زۆر سەیر و سەمەرە، رووراست و دروست بوو. کاتێك کە وتی" لە بنەماڵەی بزورگن" (مەبەست گەورە بوونە. وە) دەیەویست بە جلوەیەکی گچکە و بێ نرخ شانازی کردنی خۆی بەم شتەوە دەربرێت. سەمەد کە سەرقاڵی خوێندنی زانستە سیاسییەکان بوو وا نیشانی دەدا کە هیچ حەزی لە داب و نەرییەکان نییە و رەفتار و کردارێکی

تایبەت بە خۆی هەیە. هەمیشە بە مەبەستی ئەوەی کە بتوانێت هەبوونی خۆی بسەلمێنێت وشەی زانستی بەکار دەهێنا. سەرەتا روونی و سەمەد زۆر بە هێمنی دەستیان بە گفتوگۆ کرد. کاتێك کە سەمەد دەیگوت کۆمەڵگە وەکو جەڵەبێکی ناژەڵانە، ئەو کاتە هەستی پێویست بوونی شۆڕش لە نێو هەر هەمووی ئێمەدا گورتر دەبوو. سەمەد دەیگوت پێویستە مرۆڤە نەزانەکانی نێو کۆمەڵگە لە لایەن رۆشنبیرەکانەوە پەروەردە بکرن. روونیش ئاماژەی بە نەیارانی کۆمەڵگەی سەردەم و مۆدێرن دەکرد و دەیگوت کۆمەڵگەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەربالیستە و کۆمەڵگەی ئەوروپاییش کۆمەڵگەیەکی حەکیمە و لە نێوانیدا تەنیا خوداوەندانی بەرەژوەندییەکان خاوەن کاریگەرن. روونی و سەمەد هەر وەکو گوێزی پێکەیشتی بوون، هەر دووکیان زۆر بە باشی جیاوازی نێوان کۆمەڵگە پێشکەوتووەکان و کۆمەڵگە کەم پێشکەوتووەکانیان دەزانی و کاتێك کە باسیان لە بیروبۆچوونە پسیکاناڵیستەکانی لاجا دەکرد، من و تیسیش سەیری یەکترمان دەکرد و دەمانگوت" ئێمە بۆ بێدەنگین؟" لەم کاتە ساتانەدا کە هەر کەس باسی کۆمەڵگەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و دواکەوتوو بوونی ئەو کۆمەڵگەیەی دەکرد منیش وتم" مارکسیزم چی دیکە ناتوانێت خۆی بە سەر رۆشنبیرەکاندا فەرز بکات و ئەمەیش بووەتە هۆکاری بۆشایەتییەك کە مرۆڤ بەرەو مستیزمەوە دەبات. بۆ ئەوەی کە بتوانین ببین بە خاوەن هەبوونی خۆمان پێویستە هەر کەس بە پێی بیروڕای خۆی حەز لە جیهان بکات".

من زۆر سەری خۆم بەو شتانەوە سەرقاڵ دەکرد کە لە دەرەوەی پیوانە زانستییەکان بوون. لە کتێبێکدا خوێندبووم کە دوژمنەکان ئێمە دەکوژن، گەورە و بەرپرسەکەمان لە بەرانبەر ئێمەدا سەری خۆی دەنوێنێت، مردن ئێمە دەترسێنێت، کاتێك کە من ئەم شتانەم بۆ خۆم وەرگێڕ دەکرد وشەی خەردەڵ سەرتاپای جەستەی منی داگیر دەکرد. بۆیە زۆر بیرم لە پەیوەندی نێوان خەردەڵ و ئەو شتانە دەکردەوە. ئایا سەرەتا دوژمنی گەورە و مەرگ خۆیان دەسەلماند؟ زمان و زمانەکان و زمانە زگماکییەکان... من زمانی زگماکی خۆم لەگەڵ زمانەکانی دیکەدا بەراورد دەکرد و زمانی زگماکی من لە سەر زمانمدا درێژ دەبوو هەر وەکو رووبارێك....
زۆربەی جاران لە کاتی گفتوگۆ سیاسییەکاندا کەس گوێبیستی زمانزانەکانی نەدەکرد و دەستیان بە دەرکردنی بڕیاری جۆراوجۆر دەکرد. بە هیچ شێوەیەك نەماندەتوانی کە لە کۆتاییەکانی حەفتەدا نەچین بۆ خولەکانی فەلسەفە. لە وتە و گفتوگۆکانی زانایانی فەلسەفە کە تا درەنگانی شەو بەردەوام دەبوون شتی زۆر باش فێر دەبووین. چەپڕەوەکان، پۆست، راستڕەوەکان، مارکسیستە ئورتودوکسەکان و لایەنگیرانی، نیچە، ئەلتۆسەر و دەریدا پێکەوە دەستیان بە

قسه کردن له سەر فەلسەفەی خۆیان دەکرد. کاتێك کە ئەوان گفتوگۆیان دەکرد من وام دەزانی کە خەریکە مێشکی من خالّی دەبێت. کاتێك کە کوشتنی هەلەن لە لایەن مێردەکەی ئەلتۆسەرەوە لە نێو ژووری هۆتێلێکدا بە بیرم دەهاتەوە دەکەوتمە نێو بێ واتایی بێ واتا بووندا. سەرەتا پیاوێك زۆر سەیری منی دەکرد و بە هم هم کردنی خۆی وشەکانی لە نێو دەمی خۆیدا دەسووڕاندەوە و وتی لە دوای کۆمۆنی پاریس فەلسەفەی برژوازی نرخێکی زۆر پاشکەوتووی بە دەستەوە هێنا، لە پێناو ئازادی و یەکسانی تێکەلکردنی راستی و هەلّەکان، تێکەلکردنی باشی و خراپییەکان و یەکسان کردنی جوان و خراپەکان بە مانای هێرش کردنە سەر مێژووی ئەوروپایە". جوان جوانە و خراپیش هەر خراپە! ئایا بەمجۆرە نییە خاتوون؟" کاتێك کە ئەم شتانەی وت منیش بەو جۆرەی کە بلّی سەیری ئەو پیاوە پیرە بکە سەیری روونیم کرد، دواتر تۆزێك بە هۆی ئەم جۆرە هەلّسووکەوتەی خۆمەوە شەرمم کرد. شك و گۆمانەکانی نێو مێشکی من هەر کۆتاییان پێ نەدەهات، کاتێك کە فەیلەسوفە بە تەمەنەکە ئێمەی دیت، چاوەکانی کرانەوە و کاتێك کە وتی" تائیس شاجوانی پەرسەکان" تائیس وتی " ئەمە چ جۆرە شانسێکە لەمەو بە دواوە وادیارە بە سالآچووەکان حەزمان لێ دەکەن". بە پێی تائیس روونی و سەمەد ئەو دوو پیاوە بوون کە نەگۆڕ و تایبەتن. کاتێك کە منیش گوتم" من و تۆیش تایبەتین"، برێك راوەستام و وا هەستم کرد کە ئێمە نەمانتوانیوە بە پێ ی پیویست دەستپێشخەر بین. ئەو دوو رۆژەی کە لە نێو زانکۆدا وانەم دەوتەوە منی تێر نەدەکرد. حەزم دەکرد بنووسم بەلآم من هیچ جەسارەتم نەدەکرد کە دەست بە نووسینی بیرەوەرییەکانی رۆژانەی خۆم بکەم. بۆیە بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆن دەست بە نووسین بکەم؟ روونی زۆر بە باشی هەستی بە عاتیفی بوون و خەمبار بوونی من دەکرد. هەر چەندە روونی بۆ خۆیشی عاتیفی بوو، بەلآم هەندێك جار زۆر بە باشی دەیتوانی کە خۆی برێك بێرەحم و تووڕە بکات. ئێمە هەولّمان دەدا کە ببین وەکو ئەو کەسانە کە لە زۆرینەیەکی بێ ئومێددا جیا بوونەوە و هەولّ دەدەن بین وەکو ئەو کەمینانەی کە خاوەن ئومێد و هیوا و ئاواتن. هیچ رێگا چارەیەکی دیکەی ئێمە نەبوو، دەتوانم بلّێم ئەوە تەنیا شتێك بوو کە متمانەمان پێ دەکرد. کاتێك کە بە بێ ئەوەی بیر لە راستییەکانی ژیانی رۆژانە بکەینەوە لە شوێنێکی دووردا دەستمان بە پشوودان دەکرد، زۆر هەستیار و حەساس ببووین و تەنیا خواردنی ئێمەش سەوزەوات بوو.

کاتێك کە تائیس و سەمەد بە سەموونی ماسی پلاڤیان دروست دەکرد، بانگی من و روونیشیان دەکرد. هەر جار بۆ ئەوەی کە شتێك لە سەر ئەو مێزە عەنتیکەی کە بە

شێوەی ئێرانی دروست کرابوو ئەرژێنم زۆر هەستیار دەبووم. کاتێك کە تانیس جگەرەکەی خۆی کە خۆڵەکەی دەکردە نێو تەبلەکەوە و دووکەڵەکەی بەرە و سەقفەکە بە با دەدا سەیری منی دەکرد و دەیگوت" سەری خۆت مەئێشێنە با بڕژێت دواترخاوێنی دەکەمەوە. روونی و سەمەدیش لە گۆشەی خۆرهەلاتی هۆڵەکەدا دانیشت بوون و هەر وەکو دوو منداڵی هار دەستیان بە گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی خۆیان کردبوو. ئەو کاتە کە دەنگی نەی دڵی شەوی دەبڕی و من سەیری وێنەی ئەو ماڵەم کرد کە لە دغوبایەزیتدا گیرابوو ئەو کاتە لە نێو خەیاڵی خۆمدا جارێکی دیکە دەستم بە سەفەر دەکرد. لە ژێر رووناکی مانگە شەودا دەبووین بە مێوانی ئەو ماڵە کە لە بناری چیای ئاغریدا بوو و هاوکات لەگەڵ دەنگەکانی سەردەمی منداڵی خۆمدا رادەچڵەکییام. بەرفین، میکائیل، زوزان و پوورشەڤ.... کاتێك کە گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە روونی وتی" بۆنی لەیلاك دێت لەم ماڵە". من بەم قسەیەی روونی زۆر توورە بووم و لەو شوێنەی کە راوەستابووم دانیشتم و دەستم بە گریان کرد. سەگی ماڵە درواسێکە هەر بەو شێوەی کە تۆ بڵێی هەرەشەی لێ دەکردم دەستی بە حووتە حووت کرد. دەنگی من لە نێو سینگی روونیدا نوقم دەبوو و من هاوارم دەکرد" من دایکم، باوکم، کاکم و زەینەبم دەوێن..."

بە هۆی ئەو قەیرانە تەندروستییەیەوە کە لە نێو رێگادا تووشی ببووم روونی چی دیکە منی ئازار نەدەدا و دەیویست هەر وەکو برا گەورە لەگەڵمدا هەڵسوکەوت بکات. دەنگی روونی زۆر بە باشی کرابوویەوە و بە مەبەستی ئەوەی کە هێز بداتە من باسی ئەو رووداوە نەخۆش و دڵ تەزێنانەی دەکرد کە لە رابردوودا روویان دابوو. کاتێك کە باسی ئەو سەردەمانەی دەکرد کە لە چۆر سەرقاڵی فێربوونی زمان بووە، بێ کەسی و بێ پارە بوونی خۆیشی دەگێڕایەوە و دواتر چاوەکانی سەیری شوێنێکی دووریان دەکرد و دەیگوت" رووداوی دڵتەزێن و تەنگاوی بۆ مرۆڤ هەر وەکو مامۆستان".

لە کۆتایی حەفتەکاندا تۆزێك خۆمان بۆ خۆمان نازمان دەکرد. روونی دەستی بە دروست کردنی کرپ و منیش دەستم بە دروست کردنی هێلکە و روونی کوندر دەکرد. کاتێك کە تانیس و سەمەد دەهاتن بۆ ماڵمان بەبێ شەك لەگەڵ خۆیاندا ڤاسانی وشکیان دەهێنا. ئێمە تا باسمان لە ژنی شاعیری گەورەی کورد نەکردبایا نەماندەتوانی ئارام بین. شاعیری کورد لە کاتی هەڵوەشاندنەوەی یەکیەتی سۆڤییەتی رابردوودا دەستی بە گەڕیان کردبوو و لەم نێوانەدا چاوی بە کچێکی ئەزیدی کە بە تەمەن لە خۆی گچکەتر بوو کەوتووە و لەگەڵیدا ژیانی هاوسەری

پێك هێنابوو. ئێزا كە كچێكی ئەزیدی بوو بەو چاوە گچكە و باڵا جوانەی خۆیەوە هەر وەكو منداڵێكی گچكە بوو. شەوێكیان لە دوای ڕێورەسمی شیعر خوێندنەوە چووین بۆ كافە تەریایەك ئێزا چاوی بە ڤاسانە وشكەكان كەوت زمانی خۆی بە سەر لێوە پڕ گۆشتەكانی خۆیدا سووڕاند و وتی" من حەزم لەم ڤاسە وشكانەیە". كاتێك كە پێماندا و تامی كرد وتی" وای چەندە خۆش تامە، وای چەندە خۆش تامە". بێگومان ئێزا كاتێك كە ئەم شتانەی دەیگوت بە ترس و دڵەڕاوكێشەوە سەیری مێردەكەی خۆی دەكرد. دواتر كاتێك كە پێكەوە چووین بۆ شوێنی ششتنی دەموچاو، ئێزا باوەشی بە منەوە كرد و وتی" كاشكە منیش لەو شارە دەژیام كە تۆ تییادا دەژی، كێشەی زۆرم هەیە، زۆر بێزار دەبم" كاتێك كە ئەم شتانەی دەگوت" خەم و ئێش و ئازار بە دەموچاوییەوە دیار بوو وتی من هێشتا تەمەنم ٢٤ ساڵە، دەمەوێ هەر شەو لەگەڵ مێردەكەمدا ڕامووسان بكەم، بەڵام مێردەكەم هەر شەو پشتی خۆی لە من دەكات، بە هۆی ویستنی ئەو كارەوە هەر شەو ئێش و ئازار دەكێشم. هاوڕێیەكی من بۆنێكی پێدام كە پێی دەڵێن" شەیتان" دەڵێن ئەو بۆنە پیاوەكان هان دەدا و هۆشیاریان دەكاتەوە، كاتێك كە ئەو بۆنەم بەكار دەهێنا مێردەكەم خۆی نزیكی من دەكردەوە، بەڵام دواتر هەستی بەو بۆنە كرد و فڕیی دا. لە وڵاتی ئێمەدا هەژاری یەكجار زۆرە، بۆ یەك دەمڵە ساردەمەنی دەمرین، جەسارەتی ئەوم نییە كە لێ جیا ببمەوە، جارێكیان باسی جیا بوونەوەم كرد، بەڵام چەكی بۆ من ڕاكێشا. بۆیە منیش لە سەری خۆمدا هەر ڕۆژ ٤٠ جار هەڵی دەخەڵەتێنم، با بخوات".

وا بزانم شاعیر ژنەكەی خۆی بە باشی دەناسی كە ئەوەندە مات و مەلوول بوو، شاعیر بە چاوێكی ڕەخنەگرانەوە سەیری ئێزای كرد و ئێزایش بە مەبەستی ئەوەی كە مێردەكەی لێ ڕاحەت بێت دەستی بە خوێندنەوە كرد و وتی" من زۆر حەزم لە خوێندنەوەی بەرهەمە كلاسیكە ڕووسییەكانە و هەر شەو دەخوێنمەوە و دەمەوێ لە داهاتوودا دەست بە كاری وەرگێڕان بكەم. تائیس هیچ سەیری ئێزای نەدەكرد هەر بۆیە ئێزا لە بن گوێ مندا وتی" دیارە لووتی زۆر بەرزە ئەم ژنە خنجە". ئێزا كاتێك كە بە مەبەستی لە بیر كردنەوەی هەڵسوكەوتە ناشیاوەكانی مێردەكەی خۆی، سەیری ئەم لا و،ئەو لای دەكرد و دەیگوت" ئەجنە كە هەر كەس باسی دەكات دەست كردی مرۆڤە" من وا هەستم دەكرد كە ئێزا لە كاتی گفتوگۆكانی سەبارەت بە ئەدەبیاتدا فێری ئەم شتانە بووە.

یەكێك لە گەورە ئەجنەكانی ئێزا نیكولای ستاڤروگن بوو كە لە نێوان باشی و خراپیدا دەهات و دەچوو، ئێزا لە بەرانبەر ڕۆحێكی ڕەشی بەجۆرەدا خاوەن قسەی كراوە و ئاشكرا بوو و دەیگوت"

هاوڕێ پێویسته گیانی بێت و هێز و توانایی بداته مرۆڤ. ئیزا کاتێك که دەیگوت دەمەوێ به شێوەیەکی سەربەخۆ و جیا له مرۆڤەکانی دیکه ژیان بکەم، ڕەق و کینەی خاوەن ماڵەکەی به بیری دەهاتەوە که گوایا ئیزا کچه تەمەن دوانزدە ساڵانەکەی ئەوی له ڕێگا دەرخستووە، ئەم ڕق و کینه بۆ ئیزا هەر وەکو ڕق و کینەکەی ئیزا له بەرانبەر مێردەکەیدا بوو.

له دوای ئەم قسانه که من هیچ چاوەڕوانی ئەوانم نەدەکرد، سەیری یەکترمان کرد و وتمان" زۆر به باشی لەم کتێبه تێگەیشتینه". کاتێك که ئیزا قسەی دەکرد پیاوەکەی بەو جۆرەی که تۆ بڵێی من پیاوم و بەم پێیه هەڵسوکەوت بکه دووجار دەستی به کۆخین کرد، هەر وەکو ئەو مرۆڤانه که ڕووڕاست نەبوون دەستی به نیشاندانی لایەنی نەرم و نیانی ساختەی خۆی کرد. گێرانەوی ڕۆڵی ستاڤرگین له لایەن ئیزایەوە زۆر سەرنجڕاکیش بوو. کاتێك که له نیوە شەوێکی فێنکی ژنێڤدا له نێو کۆڵان و جادەکاندا پیاسەمان دەکرد، ئیزا زۆر به توندی دەستی منی گرت و هوتێلی ئیبیسی نیشانی مندا و وتی" به زمانی ئێمه مانای ئیبیس راموسانه". تائیسیش وتی" لاحەولەوەلا، مریشکی برسی له خەونی خۆیدا دار دەبینێت". منیش به مەبەستی ئەوەی که وەڵام بدەمەوە هۆتێلی عەدەنم نیشاندا و وتم روزا لوکزامبورگ لەم هۆتێلەدا دەستگیر کرا و برا بۆ داری قەنارە. کاتێك که ئیزا وتی" دەزانم پێویسته له نێو مرۆڤدا شانسی خراپیش هەبێت" تائیس دەستی به پێکەنینێکی گاڵتەواری کرد. شاعیر له پێشەوە زۆر به هێمنی به ڕێوەدەچێت و به بیانووی هەڵکردنی جگەرەکەی دەیویست قسەکانی ئێمه ببیستێت. کاتێك که تائیس چاوی به ڤاسانەکان کەوت، ئیزای لێ هاتوو دەستی به قسه کردن کرد و منیش وتم" چەنده خۆش تامن".

کاتژمێر ١٢ و ٢٠ خولەکی نیوە شەوە، ماسکەیەکم به سەر دەموچاوی خۆمدا کێشا و کاتێك که مەرهەمی فوندوتەنم به ڕووی خۆمدا دەماڵی پێکەنینێك به دەم و چاومەوە دیار بوو. ئەو کاتەی که به قەڵەمێکی باریك برێك کلم به چاوەکانمدا دەکێشا، سەیری ئاوێنەکەم کرد و وتم ئەم کاره تەواوە. له ناکاوەوە یەکێك له دەرگای ژوورەکەی منیدا و دەرگاکەم کردەوە و جل و بەرگەکانی منیان ئوتوو کردبوو و بۆم هێنا بوویانەوە. کاتێك که سەیری جلەکانی خۆمم کرد واهەستم کرد زانیم که زۆر ژنانەیه، بۆیه جلێکی دیکەم کرده بەر خۆم سەیری ئاوێنەکەم کرد و دیتم که زۆر چرچه بوویه کەیفم نەما، بێگومان لەم کاتژمێرە به دواوە زۆر له بێ بڕیار و بێ قەرار بوونی خۆم بێزار دەبووم. نەم دەتوانی به هیچ شێوەیەك له ژێر زانستی به هەزاران ساڵەی نێو مێشکمدا خۆم ڕزگار بکەم. نه پیاوانه بوون و نه ژنانه بوون.. ژن بوون به

مانای هەبوونی خۆم بوو. کاتێك کە ئەو سەردەمانە بە بیرم دەهاتنەوە کە وەك ئەو مرۆڤانەی کە محتاج بوون ژیانم دەکرد بە راستی قسەی زۆر خراپم بەخۆم دەگوت و دواتریش دەمگوت " ئێستا کاتی ئەم شتانە نییە هۆشیار بە". جل و بەرگی خۆم دەکردە بەرو بە سەر نووکی پەنجەی قاچەکانمدا بەرەو ژوورەکەم بە ڕێ دەکەوتم و هیچ نەم دەویست بە هۆی نەهاتنییەوە خۆم لە روونی تووڕە بکەم.

زانا بوون و خاوەن زانیاری بوون بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بە مانای هەبوون بوو، بێگومان بەشی قسر یا دەیی مێشکمان بە هیچ شێوەیەك نەیدەتوانی لە بەرانبەر هێرشە جۆراوجۆرەکاندا بێدەنگ بێنێت، بۆیە خۆڕاگری و بەرگری کردن لە خۆ بەشێك لە ژیانی رۆژانە بوو. بیانی بوون هەر وەکو ئەو نەخۆشەی بەر مردن کە چاوەڕوانی دەرمانی دەکرد و وەکو بوونی دۆنەری (جورەیەك لەفەیە کە لە گۆشت دروست دەکرێت. وە) سووتاو بوو.

هاوینێکیان هونەرمەندە کوردەکان بانگهێشتی رادیۆی کوردی ئەریڤان کرابوون، چادرە گەورەکانیش لە ئەحمەدئاوادا هەڵدرابوون، مەڕ و بزنەکانیش سەربڕان، تەنوورەکان پێ کران و ئاگر هەر وەکو ئاگرەکەی نەمروود گوڕی گرت. کاتێك کە دەنگی دەنگبێژەکان بێدەنگی شەوی دەپچڕاند و گۆرانی و حەیرانیان دەگوت، لە دوورەوە ئاگری جگەرە دیار دەبوو کە گەشی دەکرد و دەکوژایەوە. ئەو شەوەی کە لەگەڵ ئەو شنە بایەی کە بوونی شاخەکان و گوڵ و گوڵزارەکانی تێکەڵ کردبوو شەوێکی مەحشەری بوو و بە هیچ شێوەیەك نەمدەویست کۆتایی پێ بێت. زانا بوونی ئێمە لە قابیل و هابیلەوە دەستی پێ دەکرد و جەماوەرەکەش باسیان لە زەردەشت، دۆڵەکانی کەنعان، سەلاحەددینی ئەیوبی، سەفەری خاچپەرستەکان، ئەسکەندەری گەورە، ئاسوورییەکان، پارسەکان، عوسمانییەکان و ئەمەوییەکانیان دەکرد. کاتێك کە گوڕی ئاگر بەرەو ئاسمان بەرز دەبوویەوە باڵندە گچکەکانی شەویش باڵیان دەگرت و دەنگی بەرزی دەنگبێژ و گۆرانی بێژەکانیش شەوی دەور پێچ دەکرد. کاتێك کە سەربازەکانی سەددامان دیت کە وەکو خاڵخاڵییەکان لە نێو تۆز و دووماندا بەرەو ئێمەوە داهاتن ئەو کاتە زمانی خۆمان گاز دەگرت. کاتێك کە قسە خراپە عەرەبییەکان زەوی و ئاسمانیان پڕ کردبوو ئێمەیش ببووین وەکو بەرد. سەربازە زك گەورەکانی سەدام لە دەوری کچە جوانەکاندا دەسووڕانەوە و سمبێلەکانی خۆیانیان خاوێن دەکردەوە. کاتێك کە روقییە و سەلمایان سواری ماشینە سەربازییەکە کردن، حەگاڵەکەی سەریان کەوتە خوارەوە، هیچ کەس ئاگای لە حاڵی ئێمە نەبوو و هاوار ودادی

ئێمەی نەدەبیست. زۆر بە ترسەوە راوەستیبیان و حەگالەکانی روقیە و سەلمامان هەلدەگرت و پێکەوە دەستمان بە دوعا کردن دەکرد، بەلام بە داخەوە کە خوایش دەنگی ئێمەی نەدەبیست. دوای یەك حەفتەی دیکە جەنازەکانی روقیە و سەلمایان خستبوو نێو دارقامیشەکانەوە. دایکم دەیگوت جەستەکانیان سووتا بوون. لە نێو بێدەنگی شەودا نە لە مەرگی خۆم بەلکو لە هەبوونی خۆم دەترسیام. هەولم دەدا کە هەستی تێگەیشتنی خۆم کۆنترۆل بکەم. لە تێپەڕ بوونی وەرزەکان بێزار دەبووم و لە بەر ئەو کەش و هەوا نالەبارەدا رام دەکرد بۆ ژوورەکەی خۆم و دەستم بە خوێندنەوە دەکرد. وا بیرم دەکردەوە کە باوك، دایك و کاکم هاتنە ژنێڤ. ئەوەندە من بە هاتنی باوك و دایك و کاکم باوەرم کردبوو کە چەند جار بە دەنگی بەرز هاوارم دەکرد و لە دەرەجەکاندا دەچوومە خوارەوە، روونیش لە بەرانبەر ئەم هەلسوکەوتەی مندا سەری سوڕ مابوو.

کاتێك کە روونی بە شێوەیەکی رەسمی کۆتایی بە ژیانی هاوسەری خۆی لەگەل ئەو ژنەی کە لە ولاتدا بوو هێنا ئەو کاتە بە رێورەسمێکی زۆر سادە نیکاحمان کرد و من و روونیش بە رەسمی ژیانی هاوسەریمان پێك هێنا. ژنەکەی روونی بۆ ئەوەی کە لە روونی جیا نەبێتەوە زۆر هەولی دەدا و دەیگوت" چی دەبێت با ببێت خۆ من رەنگ و رووی تۆ نابینم بەلام حەزدەکەم ناوی تۆ لە سەرم بێت". ماوەیەك بە هۆی سوور بوونی روونی پەردەی چاوانی من تاریك بوو و لە دل و مێشکە زامدارەکەی روونیشدا ئێش و ئازار دەباری. ئەو کەسانەی کە لە پشتەوەی وێنەکان و جوگرافیا بێ زمانەکەی ولاتی خۆماندا مابوون دەجوولانەوە. کاتێك کە روونی بە کێشانی وێنەکان تێر نەدەبوو و دەستی بە لێدانی ساز و تەمبوور دەکرد بە راستی من زۆر سەرم سوڕ دەما. بیرم لە سازی کاکم دەکردەوە و هاوارم دەکرد" هەی ئەو جانەوەرانەی کە سازەکانتان شکاند...". ئەو سازەی کاکم کە لە داری گێلاس دروست کرابوو لە بەغدایەوە بۆیان هێنابوو. کاکم لە لای تەحسین کە لە ئاکادیمیای مۆسیقادا دەیخوێند خۆی فێری نوتە جۆراوجۆرەکانی مۆسیقا دەکرد. دەنگە نەرمەکەی کاکم و ئەو پەپوولانەی کە لە بەر رووناکییە لاوازەکەی چرا نەوتییەکەدا دەسووڕانەوە... منیش بە قاچەکانی خۆم دەستم بە لێدانی ریتمی هاوسەنگی ریتمی سازەکەی کاکم دەکرد و دایکیشم ئەو نارانەی کە خاوێنی کردبوون تۆزێك خوێ پێوە دەکردن و دەیگوت " دەی بخۆین ئاها دنیا چەند خۆشە". کاتێك کە لە خەودا لەگەل خۆمدا قسەم دەکرد و رادەچلاکییام روونی باوەشی بە منەوە دەکرد و لێوەکانی خۆی لە نێو گەردەنی مندا نوقم دەکرد و فرمێسکەکانی منیش سینگی روونییان تەڕ دەکرد و منیش بۆنی

جەستەی روونیم هەڵدەکێشا. کاتێك کە وەکو ئەو منداڵە گچکانەی نێو سکی دایکیان دەجووڵامەوە رووني دەستەکانی منی ماچ دەکرد و دەیگوت" ئەم دەستانە دەستی نووسەرن بۆیە پێویستە بنووسن".

ئەو کاتەی کە مولکییە و ئەکرم هاتن بۆ ژنێڤ لە رۆژە سەرەتاییەکاندا نەمدەتوانی لە نێو پێستی خۆمدا بگونجێم. دەستمان بە قسە کردن دەکرد هەر رانەدەوەستاین. بەو هەستەوە کە ئێستا زەینەب و زاڤینیش دێن، هیچ هەستمان بە مردنیان نەدەکرد. کاتێك کە بە شێوەیەکی نەخوازراو هەستم بە بێدەنگی و دوور بوون دەکرد، هیچ نەمدەخواست کە جارێکی دیکە بیری هیچ شتێکی دیکە بکەمەوە. ئەو شتەی کە گۆڕا بوو چی بوو؟ هەوڵم دەدا باسی ئەو رۆژانە بکەم کە پێکەوە دەژییاین. کاتێك کە رووني و ئەکرەم باسی دوا پێشهاتە سیاسییەکانیان دەکرد، لەگەڵ مولکییەدا دەچوینە نێو ئاشپەزخانەکەوە. مولکییە بەو قژە رەش و سپییانەی خۆیەوە هەر وەکو ئەکتەری نێو فیلمە رەش و سپییەکان بوو. زۆر بە زەوق و سەلیقەوە کەفی قەهوەکەم دابەشی سەر فنجانەکان دەکرد و دوو فەنجانم زۆرتر پڕ دەکرد و دەمگوت" ئەمانەش بۆ زەینەب و زاڤین". ...

من بە ئاسانی نەمدەتوانی لەگەڵ ئەو دەنگە پروتوز کراوەی ئەکرەمدا رابێم. بەو شێوەی کە بڵێ ئەکرەم ناخی منی دەخوێندەوە دەستی بە پێکەنین دەکرد" هەر چەندە کە مرۆڤ قەبووڵیش نەکات، بەڵام بتەوێ و نەتەوێ مرۆڤ وردە وردە دەبێت وەکو ئەو شوێنەی کە تیادا دەژیت، تۆ هیچ هەستت کردووە کە پیاسە کردن و قسە کردنت گۆڕاوە؟" کاتێك کە ئەکرەم ئەم شتانەی وت. منیش پرسیم کە ئایا زۆر قسە دەکەم؟ ئایا پێگەیشتن بە مانای تێپەڕاندنی سنوورەکان و نووستن بۆ مردن بوو؟

ئەو مرۆڤانەی تایبەتمەندییەکانی سەردەمی جوانییان لە لایەن ئەوانی دیکەوە زوو بە زوو قەبووڵ ناکرێن، لە سەردەمی بە ساڵاچوونیشدا وا هەست دەکەنەوە کە رووبەرووی بەخت رەشی و تانە و تەشەري ئەوانی دیکە دەبینەوە. لە دوورگەی رووسەئاودا بووین. ئاماژەم بە پەیکەرەکە کردوو وتم" نووستنی مامان لەگەڵ سروشتدا ئەو کاتانە بە بیری مرۆڤ دەخاتەوە کە تووڕەیە، کاتێکیش کە وتم بۆ ئازادی و ژینی سەربەستی زۆر ئێش و ئازاری کێشاوە، مولکییە سەیری جموجووڵەکانی نێو گۆلەکەی دەکرد و ئاگای لە من نەبوو و وتی" رووسەئاو ئازادی و سەربەستی بۆ هەرکەس دەخواست بێجگە لە ژنەکەی خۆی". لەم کات و ساتانەیشدا من پرسیم ئایا ئازادی شتێکی بێ دەرفەت و بێ چارەسەری بوو؟

مولکییه و ئەکرەم مانگێك لە لامان مانەوە و هەر ڕۆژ بەیانیان دەستمان بە پیاسە کردن دەکرد. کاتێك کە وتم" لەگەڵ زەینەبدا هەر ڕۆژ دەهاتینە ئێرە و لەوێ قەهوەمان دەخوارد و یاری تەنیسمان دەکرد، لووتی مولکییە دەخورا و مولکییە سەیری ئەو دوو باڵندەیەی دەکرد کە لە سەر سەرماندا دەسووڕانەوە و هاواری بەرز دەکردەوە" زەینەب تۆ لێرەی". ئەمجۆرە بیر کردنەوانەی من تۆزێك ڕادەوەستیان و لە ژێر دار سنۆبەرەکدا دانیشتین و چاوەکانی خۆمانمان دادەخست و بۆنی سنۆبەرەکانیش مەشامی ئێمەی پڕ دەکرد. کاتێك کە تا درەنگانێك لەگەڵ مولکییەدا پێکەوە قسەمان دەکرد وا هەستمان دەکرد کە زەینەبیش لە لامانە، بۆیە هەر شتێکمان دەخوارد بەشی زەینەبیشمان جیا دەکردەوە. جارێکیان ئەکەرم ئێمەی دیت و وتی" چییە وا بزانم بیرتان لە یارییەکانی سەردەمی منداڵیتان کردووەتەوە". مولکییەش وتی " ئەمە خۆ ئامادە کردنە بۆ یاری".

جارێکی دیکە دڵم دەستی بە ڕاڕایی بوون دەکرد و خۆم لە نێو ژوورەکەدا حەبس دەکرد، واقیعیەتی هەبوونی من جارێکی دیکە دەستی بە باڵ گرتن دەکرد. ئەو دەنگەی روونیشم دەبیست کە هاواری دەکرد" ئەم هەڵسوکەوتە هیچ شیاوی تۆ نییە". من بە هیچ شێوەیەك نەمدەتوانی بڵێم روونی دەمەوێ ئەو وشانە کە لە نێو مێشکی مندا شەڕ دەکەن بیاننووسم". ئەو شتانە کە لە نێو مێشکی مندا کۆ ببوونەوە خەریك بوو ڕۆحی منیان دەسووتاند. من لە سەر خۆ دەچووم و روونیش لەم جۆرە هەڵسووکەوتەی من بێزار دەبوو، دەنگی روونی هەر وەك شوکی کارەبا بوو. دەیگوت" تۆ زۆر خۆت دەپارێزی، هیچ ترساندن و لە تۆ خاون دەرکەوتنی من بە کۆتایی نایێت". منیش هاوارم دەکرد کە ئایا متمانە کردنی تۆ بە خۆت هەستی دەسەڵاتداری تۆیە کە جل و بەرگی خۆی گۆڕاوە؟ من وا بیرم دەکردەوە کە روونی هێشتا هەر هەست بەوە دەکات کە من زۆر پێویستیم بە روونی هەیە. روونی دەیەویست ئەو دەنگە بەرزە و بە بڕیارانەی من ئارام بکاتەوە. نە حەزی دەکرد کە دوا بکەوم و نە حەزیشی دەکرد کە زۆر بە پێش بکەوم. کاتێك کە من بیرم لەم هەڵوێستەی روونی دەکردەوە وام دەزانی کە ماڵی هەستی من بە دڕك دەور پێچ کراوە. بێدەنگ دەبووین و بە مەبەستی ئەوەی کە سەرنجی من بۆ لای خۆی ڕابکێشێت درەنگ دەهاتەوە ماڵەوە. نە هەستم بەو جلە نوێیانەی دەکرد کە کڕی بوون و نە بایەخێکم بەو بۆنەی دەدا کە هێنای بوو، تەنیا بە چاوە ماندوو بووەکانی خۆم سەیری هەڵسووکەوتەکی روونیم دەکرد. شەو بە هۆی بێزار بوونی لە بەر رووناکی گڵۆپەکە هۆشیار دەبوو و بڕێکیش دەمی خۆی خراپ دەکرد. ئەو هەڵسوکەوتانەی دەکرد کە تا ئێستا

بە هیچ شێوەیەك نەیکردبوون. گۆرەویەکانی خۆی دەردەهێنا و لە نێو یەکتری دەکردن و لە سەر ئاوێزانەکەدا هەڵی دەواستین. لەو کاناڵە تەلەفزیۆنییەی کە چەند رۆژێك بوو دەستی بە وەشان کردبوو گۆرانییەکانی وڵاتی ئێمە بڵاودەکرانەوە. کاتێك کە بیرم دەکردەوە کە هیچ مەسەلەیەك نییە، من بۆ پێویستە ئەوەندە دوور بم هاوکات ترسێکی زۆریشم لە بەرانبەر لە دەست دانی روونی هەبوو. بەمەبەستی ئەوەی کە بە روونی بڵێم ئاگات لە منە چەند جار دەستم بە کۆخین دەکرد و بە سەر پەنجەی قاچەکانمدا خۆم دەگەیاندە بەر دەرگای هۆڵەکە. کاتێك کە روونی هەستی بە سیبەری منی دەکرد زۆر بە هێمنی دەستی بە خۆرخۆر دەکرد و منیش دەمزانی کە دەیەوێ ناز بکات بۆ من. منیش لە سەر سەریدا خۆم دەچەماندەوە و دەموچاوی هەر وەك منداڵێکی ساوا دەکرایەوە و ئەبرۆکانیشی دەستیان بە لەرزاندنەوە دەکرد. منیش لە سەر ناوچاوانیدا دەستم بە کێشانی خەت دەکرد و چاوەکانی خۆی دەکردەوە و بەو سەیر کردنە قووڵانەی خۆی دەیەویست دەست بە ختلەدانی من بکات. کاتێك کە سەیری ئەو لەشە خۆش بۆنە و بە هێزەم دەکرد تۆزی کافەبارەکان بە سەر قژەکانییەوە بوو و لەم کاتانەیشدا من بیرم لەو ژنانە دەکردەوە کە لە نێو بارەکاندا چاویان بۆ هەڵداوە. کێشە راستەقینەکانی مرۆڤ کاتێك کە مرۆڤ دەست بە تەحقیق لەگەڵ هەستەکانی خۆیدا دەکات سەر هەڵدەدەنەوە. لەم کاتە ساتانەدا رووبارێکی زۆر باریك لە نێو ناخی مندا دەستی بە جموجووڵ دەکرد، منیش وام دەزانی کە لە نێو دەستە پڕ میهرو پڕ لە شەفەقەتەکانی زەینەبدام. روونیش چەند ماچێکی گچکەی لە سەر لووتمدا دەباراند و دەیگوت" تۆ ژنێکی زۆر غەریب و سەرسوڕهێنەری".

کاتێك کە کاکم باسی گەورە و بەرزبوونی شاخەکانی موری دەکرد چەکەکەی خۆی خاوێن دەکردەوە، مانگی رەمەزان بوو و باوکیشم سەرقاڵی روون کردنی چفتەکەی خۆی بوو و دایکیشم مریشکی دەبرژاند. ستایشی زوزانیان دەکرد و کاکیشم زۆر خۆی جدی دەکرد، منیش کاتێك کە هاوکاری دایکم دەکرد و پەڕەکانی مریشکەکەم کۆ دەکردەوە جوێنم بۆ زوزان بە رێ دەکرد. لە ناکاوەوە ئیسقانەکانم دەستیان بە ئێش و ژان دەکرد و روونیش سەرقاڵی ماساژ کردنی دەستە بێهۆشەکانی من بوو.

باران زۆر بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر خۆی لە جامەکان دەدا. لە وەرزی بەهاراندا بۆکۆ کردنەوەی کەرەنگ رووەمان دەکردە زۆزان و شوێنە بەرزەکان و ئەو کچانەش کە نیشان کرابوون دەستیان بە گۆرانی گوتن دەکرد. کاتێك کە ئێمە گۆبیستی چیرۆکەکانی خۆشەویستی ئەوانمان

دەکرد ئەو کاتە بۆ خۆمان دەستمان بە گێڕاندنەوەی چیرۆکی ئەجننە و پەرییەکان دەکرد. هەتاو جار جار خۆی لە پشتی هەورەکاندا حەشار دەدایەوە و منیش لە هەڵ کێشانی کەرەنگە گەورەکان وەرەز دەبووم و دەستم بە گاڵتە کردن لەگەڵ باوکمدا دەکرد و دەمگوت" بابو کەنگرە لە کوێ تەواو دەبێت؟" زۆر خۆش بوو کە مرۆڤ وەك کچێك لە کۆکردنەوەی کەنگرەکاندا ناوبانگ دەربکات، چونکە کاتێك کە لەگەڵ بازرگانێکی گەورەدا ژیانی هاوسەری پێك بهێنێت و لە نێو شاردا نیشتەجێ ببێت ئەو کاتە دەستێکی لە نێو ڕووندایە و دەستی دیکەی لە نێو هەنگویندایە. باوکێکی بە ساڵا چوو لە وەرزی بەهاردا بە سندووقێکی پڕ لە کەرەنگ دەرگای کچەکەی لێداوە. کاتێك کە کچ سندووقی کەرەنگەکانی بینیوە، لێوەکانی خۆی چرچ کردووە و پرسیویەتی" ئەمە چییە؟" باوکە پیرەکەیش سەری خۆی جووڵاندوەتەوە و وتوویەتی" کەنگرە کچی من کەنگرە". کچەکەیش بە دەنگی باریکی خۆی وتوویەتی" کەنگرە لە کوێ تەواو دەبێت؟" باوکیشی تووڕە بووە وتوویەتی" ئەی کچی من تۆ چەندە زوو هەر شتێت لە بیر کردووە لە بیرت نییە ئەو کاتەی کە بە سندووق کەرەنگت کۆ دەکردەوە".

ئەو خۆ حەبس کردنە بێ سوودانەی من و ڕاڕایی بوونە پڕو پووچەکانم دەبوون بە هۆکاری نۆقم بوونم لە نێو وردەکارییە بێ سوودەکاندا. هاوکات گفتوگۆ پڕ لە ڕەش بینییەکانی منیش بارگرانییان لە سەر مندا دەکرد. لە شەوێکی وەرزی هاویندا لە نێو پارکی ئینگلیزەکاندا بووم. دارەکان دەجووڵانەوە و بۆنی چیمەنی تەڕ و گوڵەکان تێکەڵ دەبوو. هاوار و دەنگی زۆر بە هیوا و گریان و پێکەنینی منداڵانەم دەبیست. من بیرم لە بەرزایی و پانتایی ئەو دارە بە دڕکانە دەکردەوە. سەرم ئاسوودە دەبوو و کاتێکیش کە ئەو ژن و پیاوەم دیت کە ماشینێکی منداڵانەیان پێ بوو، چاوەکانم ڕێك کەوتنە نێو چاوانی ڕوونییەوە. بەو پێیەی کە بڵێم " بیر ناکەینەوە" دەستم بە پێکەنین دەکرد. ئەو کاتەی کە دەگەڕاینەوە بۆ ماڵ بێدەنگ دەبووین. هەر دووکمان دەبووین وەکو ئەو بۆمبانەی کە بۆ تەقاندنەوە ئامادە بوون. من لە سەر ڕوونیدا هاوارم دەکرد " تۆ زۆر خۆ پەرستی و تەنیا بیر لە خۆت دەکەیەوە". ڕوونیش زۆر بە ئارامی دەیگوت" ئەی تۆ، ئایا تۆیش هیچ خۆپەرست نیت؟" سەرەڕای ئەو هەموو گوشار و سوور بوونەی ڕوونی، بەڵام من ئامادە نەبووم کە لەگەڵ ڕوونیدا سەردانی وڵاتانی باکوور بکەم. هەر چەندە تەنیایی ناخی منی دەخوارد، بەڵام حەزم دەکرد تەنیا بم. چاوەکانم دادەخست و وا هەستم دەکرد کە سەقفەکە بە سەر سەرمدا دەڕووخا. هەر هەمووی ئەو هەستانە کە سەرکوتم کردبوون دەستیان بە جموجووڵ دەکردەوە و مێشکی منیش لە ژێر ئاودا بوو....

کاتێك کە لە کردنەوە و داخستنی پانژۆرە قورسەکاندا تەنگاو دەبووم روونی لە ژێر سمبێلەوە پێم دەکەنییا و دەیگوت" خوایا چی هەیە لە کردنەوە و داخستنی پانژۆردا". ئەو کاتەی کە روونی خۆی لە سەر قەرەوێڵەکەدا درێژ دەکرد و وا نیشانیدەدا کە نووستووە بە راستی من ئەشکەنجەیەکی زۆر تەڵخم دەکێشا. سەرەڕای هەر هەموو کێشە و گرفتەکانی خۆم زۆر بە وردبینییەوە سەرنجی هەڵسوکەوت و وتەکانی روونیم دەدا. بە مەبەستی ئەوەی کە هەبوونی خۆم بسەلمێنێم، لە بەرانبەر بیروڕاکانی روونیدا بیروبۆچوونەکانی خۆم دەردەبڕی و دەمگوت دەمەوێ بە تەنیا بژینمەوە. بەم شێوەیەیش نەمدەتوانی بە روونی ئەوە بسەلمێنم کە نانوم ،بەلکو سەرقاڵی خەیاڵی پڕوپووچم. کاتێك کە وا هەستم دەکرد زۆر شتم لە بیر کردووە، لە ناکاوەوە خۆم لە ژێر کاریگەری زۆر شتی بیرکراو و بێ نرخدا دەدیت، زۆر بە ماندوو بوونەوە پێشوازی بەرەبەیانیانم دەکرد. روونی هیچ واتا و مانایەکی بەم بارودۆخەی من نەدەدا و تەنیا تووشی ڕاڕایی بوون دەبوو. گاڵتە کردنەکان و قسە خۆشەکانی روونیش نەیاندەتوانی رزگارم بکەن. کاتێك کە هیچ بایەخێکم بەو جەستە وشك بووە و قژە رژاوەکانی خۆم نەدەدا هەر دەمویست بنوم ئەو کاتە سەیر کردنە بیانییەکان چاوەکانی منیان دەترساند. کاتێك کە بە خۆم دەمکوت " خێرە بەو هەمموو زانا بوونەوە ئەوەندە لاوازی؟" دەنگێك لە ناو ناخمدا پێ دەمگوتم" زانا بوونی تۆ زانا بوونێکی داگیر کەرە".

دەور دەبوو بە دەوری گریان. ئەو هەوایە کە لە پەنجەرە کراوەکەدا ژوورەکەی پڕ کردبوو جەستەی منی کردبوو بە یەك پارچە سەهۆڵ، بە لەرزەوە هەڵسام. زۆر خۆشحاڵ بووم کە روونی لەماڵەوە نەبوو، چونکە هیچ نەمدەویست بەمجۆرە من ببینێت. ئەو کاتەی کە لە نێو خۆمدا بە دوای تاوانبارێکدا دەگەڕام، هەر شت بە لامەوە بیانی بوو، ئەو مۆدێرن بوونەش کە بۆنی پیر بوون و تەنیایی بوونی لێوە دەهات....

کاتێك کە لە کەش و هەوا بارانی و تەماوییەکەدا دەمزانی کە بۆمبە چینراوە کاتژمێرییەکەی ناخم بەرەو تەقاندنەوە دەڕوات، لە ماڵ دەر دەچووم. من بە هیچ شێوەیەك نەمدەتوانی خۆم فێری ئەو پەیوەندییانە بکەم کە تەنیا لە چوارچێوەی وشەی بفەرمووداا بوون و لە لایەکی دیکەشەوە ئەو ژیانە میکانیکییە زۆر لە سەر من بارگرانی دەکرد. کاتێك کە لەگەڵ ئەم جۆرە هەستانەدا شەرم دەکرد ئەو کاتە بۆ هەر کەس عەیب و عارێکم دەدۆزییەوە و هێور دەبوومەوە و هاوکات لە ناخمدا لە خۆم دەپرسی" ئایا ئەمە من بۆ خۆمم؟"

ناخم بە گشتی ڕەش ببوو و وازم لە وەرزش کردن و پیاسە کردن هێنابوو. کاتێك کە تائیس بە حەزەرەوە وتی" پێویستە سەردانی دکتۆرێکی ڕەوانکاو بکەی" تووڕە بووم. هەر چەندە نەمدەویست کە سڵاولە مرۆڤەکانیش بکەم، بەڵام ناچار بووم کە بەیانییان دەست بە پیاسە کردن بکەم، چوونکە ئەم پیاسە کردنە دەرمانی دەردی من بوو. ماڵەکان، جادەکان، دارەکان، گوڵەکان و خەتەکانی نێو جادەکان هەر وەك ئەوەی کە مرۆڤ بن سەیری منیان دەکرد. هەر ڕۆژ ئەو کاتانە لە نێو ئەو ماڵە دیوارە بەرزەی کە بە سیر داپۆشرابوو کەبانوو و منداڵێك بە چاکەتێکی مەلەز و قژی زەرد دەردەکەوتن، بەو جۆرەی کە تۆ بڵێی لەگەڵ کەبانووکەدا یەکترمان دەناسی سەیری یەکترمان دەکرد. هەر لەم شوێنەدا ئەو ژنە باڵابەرزە قەڵەوەم هەر ڕۆژ دەدیت. لێوە گەورەکانی دەجووڵاندەوە و خۆی لەگەڵ خۆیدا قسەی دەکرد. ئەو کەسانەی کە بە منیان دەگوت" بونژۆر" منیش بە وشەی" ڕۆژ باش" وەڵامی ئەوانم دەدایەوە.

دراوسێکمان هەبوو کە خەڵکی ئەڵمان و ناوی کلاوس بوو، ئەو عەلاقەیەی کە نیشانی سەگەکەی دەیدا منی بێزار دەکرد. جار جار زۆر حەزم دەکرد کە ئەو ماڵە خۆشە و ئەو شکڵ و شەمایە بەربلاو بکەم. من هەمیشە هەستم دەکرد کە ئەو سەگە بیرەوەرییە ناخۆشەکانی من بە بیرم دەهێنێتەوە و کاتێکیش کە منی دەدیت لە بەر دیوارەکەدا دەستی بە حووتە حووت دەکرد و لە ناکاوەوە چاوە قووڵەکانی کلاوسیش دەکەوتنە نێو چاوانی منەوە.

ئەنتونی کە خزمی زاڤین بوو کەسێك نەبوو کە مرۆڤ بتوانێت لەگەڵیدا ئاسوودە بێت. هەر کات کە چاوی بە من دەکەوت دەیگوت" حەیف بۆ زاڤین" و لێوەکانی خۆی گەورە دەکرد. ئەنتونی لەو کەسانە بوو کە بە میراسی باوکی خۆی ژیانیان دەکرد. کاتێك کە لەگەڵ ئەو کچەیدا بوو کە لە خۆی زۆر باڵابەرزتر بوو، باڵای ئەنتونی لە بن شانی ئەو کچەدا تێپەڕ نەدەبوو. ڕوونی هیچ حەزی لە ئەنتونی نەدەکرد و پێی دەگوت" داری بێ سوود". ئەنتونیش بە مەبەستی تۆڵە کردنەوە لە ڕوونی زۆر بە شیاوی و نەرم و نیانییەوە لەگەڵ مندا هەڵسوکەوتی دەکرد. لە کاتی سەیراندا لەگەڵ ڕوونیدا دەمقاڵەیان بوو و وتی" هەی ڕۆشنبیرە بەد فێعلەکان، مەگەر ئەوە ئێوە نەبوون کە ئێمەتان قەتڵ و عام کرد" کاتێك کە ئەنتونی ئەم شتانەی دەگوت ئەو کاتە جوێندان بە زمانی کوردی و ئەرمەنی دەستی پێ دەکرد.

جارجار ئەوەندە بیرم دەکردەوە کە لە قەراخەکانی گۆلەکە زۆر دوور دەکەوتمەوە و لە ترسی ئەوەی کە مەبادا مرۆڤە سەرخۆش و گیرودەکانی ماددە بێهۆش کەرەکان ڕێم لێ بگرن دەستم

بە را کردن دەکرد. لە سپییەکان و ئەو شەپۆلانەی کە خۆیانیان بە بەردەکانەوە دەدا ئەوەیان بە بیری من دەهێنایەوە کە من بێگانەم.

جارێکیان بەیانی کاتێك کە خەریکی نان خواردن بووین وتم" لە ماوەیەکی دیکەدا دەگەڕێمەوە بۆ ولاتی خۆم". روونیش بە سەر سورمانییەوە وتی" ماوەیەك لەوێ دەمێنیتەوە و دێتەوە". کاتێك کە روونی ئەمەی وت، منیش بە دەنگی بەرز وتم" لەم بارەیەوە تەنیا خۆم بڕیار دەدەم".

لە کاتی فڕیندا بە سەر ئاسمانی دیجلەوە کاتێك کە چاوم بە باخچەکان و جەڵەبی ئاژەڵان و ئەو دیمەنە سەرسوڕهێنەرانە کەوت، کەوتمە نێو چەندین خەیاڵی تێکەڵ کراوەوە. هەوای گەرم و بێدەنگی هەر وەکو خەیاڵێکی زۆر گەورە خۆی بە سەر شاردا زاڵدەکرد. من وا بیرم دەکردەوە کە لەم شارەدا من ژیان ناکەم. کاتێك کە لە نێو ئەو گەرمایییەدا کە شەیتانی دەکوشت دەنگی ئەو کەسانەم بە بیر دەهاتەوە کە هاواریان دەکرد "ئاوا سۆسیٚ"، من وام دەزانی کە چاوی زەینەب لە نێو چاوانمدایە و سەریشم لە نێو دەستە پڕ لە خۆشەویستییەکانی زەینەبدایە. کاتێك کە دەگەیشتینە بەر بەردە کۆنە بۆزاڵتەکان، چاومان بە تۆزێك ئاو دەکەوت و بۆنی ئەم ئێمەی کەیف خۆش دەکرد، لەم کاتو ساتانەیشدا سێبەری دارەکان دەستی بە جووڵانەوە دەکرد و لە نێو دەمی مندا تامێکی نەخۆش هەبوو، زۆر ماندوو ببووم. کریستاڵەکانی خەم و ماتەمینیماڵی چاوەکانی منیان پڕ کردبوو. دەنگی ناخی من دەیگوت" چییە جەسارەتی ئەوەت نییە کە رووبەڕووی شتی نوێ ببیتەوە؟" ئایا ئەوەی کە زۆر گۆڕا بوو ئێمە بووین یا شارەکان؟ ویستم بنوم و بە مەبەستی سزا دانی خۆیشم نە شتێکم خوارد و نە شتێکیشم خواردەوە.

بەیانی زوو کاتێك کە گەیشتمە دەروازەی سنووری خابوور دڵم تێك چوو و سەرم دەسووڕایەوە. باڵندە مردووەکانی قەراخی رووبار، بارانی زەرد، سێوی گەنی و بۆنی خەردەڵ... پشتم بە دیوارێکەوە دا و دەستم بە کۆخین و هەڵرژاندنەوە کرد. زۆر سەرم لە بەرانبەر هەڵسوکەوتی سەربازە تورکەکاندا سوڕ مابوو، چەند دەستماڵێکیان پێ دام و چایان بۆم هێنا. کاتێك کە سەیری پاسپۆرتەکەی منیان دەکرد وتیان" مێوانی حکوومەتی فیدراڵی؟" کاتێك کە لە دەروازەی سنوور خەریکی جێبەجێ کردنی کارە پێویستەکان بووم وردە وردە هەوا تاریك دەبوو، لە خوارەوە ئاڵای زەرد، سوور و سەوز و لە سەرەوەش ئاڵای سوور و سپی بەژن و باڵای خۆیانیان هەڵدابوو بەرەو ئاسمانەوە. ئەو گرووپە کە لەگەڵ سەربازە کوردەکاندا دەستیان بە وێنە گرتن کردبوو گرووپی نووسەرە پەنابەرەکان بوو کە بە مەبەستی بەشداری کردن لە فیستیڤاڵ

دەعوەتی دهۆك کرابوون. ئەو نووسەرانە کاتێك کە باوەشیان بە سەربازە کوردەکانەوە دەکرد و دەستیان بە پێکەنین دەکرد  هەر وەك ئەو کەسانە بوون کە ئەوەندەیان خواردبێتەوە کە سەرخۆش بووبن. کاتێك کە بەرپرسانی رەسمی پێشوازییان لێ کردین و بە ماشینی ئاخر مۆدێلی رەسمی دەستمان بە رۆیشتن کرد، لە شوێنێکدا لە لای شەربەت فرۆشێکدا راوەستاین و ئەو شەربەت فرۆشە زۆر بە شەفەقەتەوە سەیری منی کرد و لیوانێك شەربەتی بۆ من هێنا. ئەو شۆفێرە تورکمانە کە منی لە زاخۆوە بردە دهۆك زۆر پەشێو بوو. بە هۆی ئەوەیەوە کە ساڵێك لە ئەستەنبوڵ کاری کردبوو زۆر شانازی بە خۆیەوە دەکرد. باسی ئەوەی دەکرد کە شەڕ تەنیا ماڵوێرانی و ماڵ خراپییە و پێکەوە ژیان لە هەر شتێکی دیکە باشترە. من لە لایەکەوە هەستم دەکرد کە لە ئارامیدام و لە لایەکی دیکەوە زۆر دەترسام. رێگا و بانەکان زۆر تەسك و باریك بوون و هیچ جۆرە هێما و ئیشارەتێکی هاتوچۆیش تیایاندا نەبوو. کۆمپانییاکانی بیناسازی، شانتییەکان، رافینەکانی نەوت، ئەو ماڵانەی کە بە بلۆك ساز کرابوون و ماڵە لووکس و ڤیلاکان... شۆفێر منی بردە هۆتێل ژیان کە ببوو وەکو گەراجێکی نێونەتەوەیی. لە ژێر رووناکی مانگە شەودا سەیری ئەو شاخە بەرزانەم دەکرد کە وەك خەیاڵ بوون بۆ من و هەناسەیەکی راحەت و قووڵم هەڵکێشا و هەستەکانی شانازی کردن و سەرخۆش بوونی من دەستیان بە سەرهەڵدانەوە کرد. هوتێل زۆر قەرەباڵغ بوو، لە نێو ئەو دوومانەیدا کە هۆڵەکانی هۆتێلەکەی داپۆشی بوو، بە چەندین زمانی جۆراوجۆر قسە دەکرا. لە نێو ئەو گرووپە گەورەیەدا بێجگە لە من ژنێکی دیکە هەبوو. ئەویش رۆژنامەوانێکی باسك بوو. بەو هەستانەیەوە کە هیچ بۆمان گرنگ نەبوون دەستمان بە پرسیار کردن لە یەکتر کرد. ئەو کەسانەی کە پێکەوە دەمان یەکتریان زۆر بە باشی دەناسی. من پشتم بە کورسییەکەوە دا و ئەو چاییەی کە لە کاتی منداڵیمدا قاچاخ بوو دەمخواردەوە و تامێکی زۆر خۆشی هەبوو و حزوور و ئارامییەکی باشی پێ دام. نووسەرە پەنابەرەکان باسی ئەلف و بێی عەرەبی و لاتینییان دەکرد. ئەو نووسەرانە کە لە ماچ کردنی سەربازە کوردەکان تێر نە ببوون لە کاتی قسە کردنی خۆیانیشدا هەر باسی سەربازەکانیان دەکرد. دەبوایا بەیانی لەگەڵ عارف ئیسماعیل لە یەکیەتی نووسەرانی دهۆك یەکترمان بناسیبایا و چووبام بۆ زیارەتی مەزاری زەینەب و زاڤین. ئەو شتەی کە مانای دەیدا بە شارەکان دۆستایەتی لە نێوان مرۆڤەکان بوو.

ئاخ زەینەب... ئاخ زاڤین....

شەو نەمتوانی بنوم، هەر چەندە فێنك کەرەوەکە کاری دەکرد و ژوورەکە فێنك بوو، بەڵام پێشووەکان نەیان هێشت بنوم. لە نێو تاریکیدا پەردەکەم بە لاوە دەدا و سەیری دەرەوەم دەکرد. بانە بەتونییەکان و ئانتێنەکانی تەلەفزیۆنەکان، گەڵای دارەکانیش هیچ نە دەجووڵایەوە. کاتێك کە لە خەو هەڵستام هەتاو لە نێو ژوورەکەمدا پیاسەی دەکرد. ڕەنگ و تیشکی هەتاو لە مزیوپۆتامیادا شتێکی زۆر جیاواز بوو. لە کاتی نانخواردنی بەیانیدا قەیماخی شیر و هەنگوینم خوارد. کاتێك کە دەرکەوتم نەمدەزانی بەرەو کامە لاوە بڕۆم. کۆڵانەکان و ماڵەکانیش زۆر پیر بوون. لە ئەورازەکەوە دابەزیم و شار لە نێو هەوری تۆزدا دەستی دەجووڵاندەوە. عارف ئیسماعیل لە بەر دەرگای یەکیەتی نووسەرانی دهۆك چاوەڕوانی منی دەکرد. بە سمبێڵە پانەکان و تێڕوانینە وشکەکانی خۆیەوە هەر وەك کرێکارە کۆنەکانی یووگوسلاڤیا بوو. کاتێك کە بە دەنگێکی پڕ لە ڕێزەوە وتی" هەر چەندە یەکەمین جارە کە دەتان بینم، بەڵام زۆر باش دەتان ناسم" پەردەکەی دەستی لا داو زەینەب و زاڤین دەکەنییان.

کاتێك کە لەو گەرماییەدا گەیشتینە قەبرستانەکە، ئەو هەوا نمدارە هەر وەکو ئەوی بوو کە دەیەویست دەستی مرۆڤ بگرێت. قەبرستانی ئەسری کە قەبرستانێکی چۆڵە و سەیری بەنداوەکەی دهۆك دەکات. لەو قەبرەیدا کە کۆڵایان بوو بۆنێکی زۆر پیس دەهات. کاتێك کە پاپازەکە بەو جل و بەرگە ڕەشەکانی خۆیەوە لە بەردەمماندا تێپەڕ دەبوو ئەنجیلەکەی دەستی بە سەر سینگییەوە دادەنا و منیش زۆر بە ورد بینییەوە سەیری ڕۆژی لە دایك بوون و ڕۆژی گیان لە دەست دانی مردووەکانم دەکرد. ئارتین، ژاك، کیرکور، توماس، پاول، پەتەر، ئاسکا، ڕوزا، سۆسان،... زەینەب و زاڤین، قەبری زەینەب و زاڤین لە تەنیشتی یەکتردا بوو. دار چنارەکان هەر وەکو پەردەیەکی حەریری دەجووڵانەوە. لە سەر کێلەکەی زەینەبدا بە تورکی، عەرەبی و لاتینی نووسرابوو " بۆ ڕۆحی بەرزی پارێزەری نموونەی مافەکانی مرۆڤ زەینەبی ئایوالیك ئەلفاتێحە". هەر هەمان ڕستە و وشانە بە زمانی ئەرمەنی و کوردیش لە سەر کێلەکەی زاڤینیشدا نووسرا بوون. بەو شتەی کە ئیسماعیل لەگەڵ خۆیدا هێنای بوو ئاوی گوڵەکانی سەر قەبرەکانم دا. ناخم پر ببوو لە هێزێکی سەرنج ڕاکێش، نەمتوانی بگرم، دەستم بە سەر بەردی قەبرەکەدا کێشا و ماچم کرد و وتم" لەو ڕیگایەدا کە بۆ منتان کردەوە بەردەوام دەبم ئێوە بە ئاسانی بنوون". لە لایەن بۆن و بێدەنگی بەنداوەکەوە دەور پێچ کرام. کاتێك کە بەو ماشینەی کە عارف ئیسماعیل بۆ من ئامادەی کردبوو بەرێ کەوتم و هەموو جستەم پڕ ببوو لە تۆز. شۆفێرە بە تەمەنەکە پارچەیەکی تەڕی دانابوو سەر ناوچاوانی خۆی

و كاتێك كە وتی" برازا زۆرمان بە دەستی شەڕەوە كێشا" زۆر بە خێرایی لێدەخۆری و منیش دەستم بە پێكەنین كردو وتم" خالۆ هێدی باژۆ". (خالە تۆزێك لە سەر خۆ لێبخۆرە. وە). كرێكارەكانی نێو رێگا و بانەكان، ئەو بالاّخانە و بینایانە كە یەك لە دوای یەك بەرز دەكرانەوە و ئەو بەنزین فرۆشانە كە كۆتاییان پێ نەدەهات.... لە ژێر ئەو گەرماییەدا لە بەر دەرگای كانتینەرەكاندا چایان دەم دەكرد. كاتێك كە گەیشتینە ئاكرێ شوفێرەكە وتی برسیمە. لە كاتی منداڵیمدا دووجار سەردانی ئاكرێم كردبوو. جارێكیان بۆ دەعوەت و بووك گواستنەوە و ئەو جارەكەی دیكەیشیان بۆ پەرسە و سەرساخی هاتبووم. وام دەزانی كە ئاكرێ هیچ نەگۆڕاوە، هاوكات لەگەڵ دەنگی مۆسیقای كوردی، عەرەبی و توركیدا باڵندەكانیش باڵیان دەگرت و دەفڕیان. لە ژێر گەرما پلە بەرزەكەی نیوەڕۆدا بە سالاّ چووەكان یا تەسبیحیان دەكێشا یا هەوڵیان دەدا لە گۆشەیەكی فێنكدا خۆیان فێنك بكەنەوە و مێشی رەشیان راو دەكرد. شەربەت فرۆشە چاو سوور بووەكە بە دەنگی بەرز هاواری بۆ شەربەتەكانی خۆی دەكرد و دەنگی بە سەر هەر هەمووی دەنگەكانی دیكەدا زاڵ دەبوو " ئاوا سۆسێ بۆ قودرەتێ". كاتێك كە شۆفێرەكە وەك نهێنییەك دەستی بە پێكەنین كرد هیچ سەیری منی نەدەكرد و دەنگی جیڕە جیڕی ئەو پەنكەیە كە بە سەقفەكەوە هەڵواسرا بوو هەر وەكو گۆرانییەكی كۆن بوو. بێجگە لە قاورمە هیچ شتێكی دیكە نەبوو. شۆفێر دەستی بۆ نانەكە برد و لەگەڵ ئەو گۆشتەی كە لە نێو قاپە مەلامینەكاندا بۆمانیان هێنابوو زۆر بە زەوقەوە دەستی بە نان خواردن كرد. بە شەرمەوە وتم" بێ زەحمەت ئەگەر هەتان بێت بۆ من نان و پەنیر بهێنە". شۆفێر سەری سوڕما و وتی" بەڵێ بەڵێ" و سەری خۆی جوولاّندەوە و كاتێكیش كە شۆكری خوای دەكرد دەستی بە خواردنەوەی چایەكەی كرد.

بڕیار بوو شەو لە سلێمانییە لە ماڵی ئەو نووسەرەدا بمێنمەوە كە عارف ئیسماعیلی دەیناسی. زۆر بە ورد بینییەوە چاودێری باری ئاسایشی دەكرا و هەر ناوچەیەك لە ئاسایش و ئەمنیەتی خۆی بەرپرسیار بوو. كاتێك كە ناسنامەكەی منیان كۆنترۆڵ دەكرد ئەو كاتە من دەمزانی كە لە كامە ناوچەدامە. لە نێو ناوچاوانی ئەو كەسانەی كە بە عەرەبی، كەلدانی و توركمانی قسەیان دەكرد هیچ جۆرە تووڕە بوونێك دیار نەبوو. كاتێك كە هەتاو بەرەو ئاوابوون دەڕۆیشت و گوڕی ئاگری رافینەكانی نەوت بەرەو ئاسمان بەرز دەبوویەوە شۆفێر بە هێمنی پشتی خۆی بە كورسییەكەیەوە دا وتی" كەركووك، كەركووك". كەركووكیش هەر وەكو بەغدا لە رووی ئەمنییەوە ئارام نەبوو و هەر كات مومكن بوو تەقینەوە روو بدات. بەبێ ئەوەی كە

لا بدەین بۆ کەرکووك راستەوخۆ ڕێگای سلێمانیمان بەردەوام کرد. کاتێك کە لە رستۆرانتێکی زۆر پێشکەوتوودا نانمان خوارد و تۆزێك پشوومان دا، هەر وەکو بێگانەیەك هیچ نەمدەتوانی لە هەڵسوکەوتی رەخنەکارانەی خۆم رزگارم بێت. سەردەمی منداڵیم و ئێستام پێکەوە شەڕیان دەکرد. ئەوکاتە بە بیرم دەهاتەوە کە لە دیاربەکر جگەرمان دەخوارد. خزمەکەمان دکتۆر بوو و باسی پەتای کولێرای دەکرد. کاتێك کە گەیشتینە بەر دەرگا بەردینەکە گرووپێکی قەرەباڵغ سلۆغانی دەگوتەوە و دەستەکانی خۆیانیان بەرز دەکردەوە و نیشانەکانی سەرکەوتنیان یەك لە دوای یەك نیشاندەدا. دواتر کاتێك کە ویستمان بڕۆین و مۆتە بخۆین دایکم زۆر بە توندی دەستی بە چارشەفەکەی خۆیەوە گرتبوو و بەو دەستی دیکەیشەوە دەمی خۆی دەگرت. تەنیا وشەیەك کە بۆ ماوەیەکی درێژ لە نێو مێشکمدا مایەوە ئەوە بوو کە دایکم وتی" ئەی بە لەعنەت بی". ژنەکانی ئێستا تەنیا و سەربەخۆن. ژنەکانی وڵاتی من زۆر حەزیان لە تۆقە و شت و مەکی ژنانە دەکرد و سەرکۆڵمەکانیان وەکو سێو و چاوەکانیشیان هەر وەکو مەکیك گەورە دەبوون و بە هیچ شێوەیەك سەیری پیاوەکانیان نەدەکرد. جارێکیان زەینەب بە تەلەفون پێی وتبووم کە لێرەکانە خۆکوشتنی ژنان زۆر زۆرە، بەڵام میدیاکان هیچ باسی لێوە ناکەن. ئەو کاتە من هەستم کرد کە لە هەر شوێنێکدا هەر هەمان گۆڕانی بەردەوامە و دەست دەشکێت و لە نێو گەچدا دەمێنێتەوە.

کاتێك کە گەیشتینە سلێمانی بانگی شەویان دەدا. پەیکەری ئەو ژنە کە لە بەر دەرگای شاردا هەڵواسرا و زەنجیرەکانی بڕی بوو هەر وەکو ئەوە بوو کە هاواری لە ئێش و ئازاری هەزاران ساڵەی دەکرد. پردی ژێرین و پردی سەرەوە دروست کرابوون، ئاتۆلیە و ناوەندی زۆر گەورە کرابوونەوە، کاتێك کە گەیشتمە هۆتێل ئاشتی تەلەفوونی نەسیمە حەسەنم کرد و بە دەنگێکی باریك وتی تۆزێکی دیکە دێمە لات. هۆڵی هۆتێلەکە تۆزێك چۆڵ و ئارام بوو و کاتێك کە بە دوای شوێنێکی ئارامدا دەگەڕام، یەکێك لە کارمەندەکانی هۆتێل هات بە هانامەوە و هاوکاری کردم. کارسازەکان پێکەوە باسی تەندەرەکانیان دەکرد، ڕۆژنامەنووسە بیانییەکانیش لە نێو ژووره شووشەییەکاندا کاریان دەکرد. ئەو کاتە بێجگە لە من هیچ ژنێکی دیکە لەوێ نەبوو. کاتێك کە دەستم بە خواردنەوەی قەهوەکەم کرد هەر وەکو دزەکان دەستم بە خوێندنەوەی نووسینەکانی ڕۆژنامەنووسەکان کرد. لەم کاتە ساتانەدا نەسیمەش هاتە لام. نەسیمە نە زۆر باڵابەرز و نە زۆر باڵا کورت بوو. بەو پێکەنینە خۆشانەی خۆیەوە هەر وەکو شەپۆلێك بوو بە هۆی ئەوەیەوە کە من چاوەڕوانی ئەوم کردبوو داوای لێبووردنی لە من کرد.

کاتێك کە من وەرەندازی چاوەکانی نەسیمەم دەکرد نەسیمە وتی" تۆ لێرە بێگانە نیت، ئەمە وڵاتی تۆیە" کاتێك کە وتی ئێستا هەستت چۆنە؟ درێژەی بە قسەکانیدا و وتی لە ماڵەوە زۆرتر قسە دەکەین. رابووین و ئەو شەوە گەرمەم زۆر بە باشی دەناسی، بەڵام چەند بۆنێکی جیاوازی هەبوو کە تێنەدەگەیشتم بۆنی چین. ئایا ئەوەی کە زۆر گۆڕا بوو من بووم یا جوگرافیاکەی من بوو؟ کاتێك کە نەسیمە حەسەن وتی" ماشینەکەی من ئەوەتە لەوێ" دەیەویست وا بنوێنێ کە ژنێکی زۆر جیاوازە و وتی لە نێو کۆڵانی فیرعەونەکاندا دادەنیشم و دواتر دەستی بە پێ کەنین کرد و وتی ئەمە ناوی ڕەسمی نییە تەنیا ئەو ناوەیە کە سەرۆك وەزیرەکەمان لێ کردوویەتی. لە لای ڕاستی جادەکەوە پارکی ئازادی کە تازە دروست کرابوو و لە لای چەپیشەوە ڤێلاکان بەرز کرابوونەوە. دەنگە ژنانە بێزار کەرەکەی هێمای ئەو هەستانە بوو کە سەرکوتی کردبوون. فێر بوون و زانا بوون بە مانای هەبوون نەبوو. باسی ئەوەی دەکرد کە لەگەڵ خانەوادەکەی خۆیدا دەژیت و جارجار بەم هۆیەوە بێزار دەبێت. هەر چەندە تەمەنی ٤٣ ساڵ بوو بەڵام هێشتا زۆر جوان بوو. بەناز گەورە بوونی سەردەمی منداڵی نەسیمە بۆ من وەکو پڕوپاگەندەیەکی ئازار دەر بوو. زۆری نەخایاند کە لە نێو کاتژمێرەکانی شەودا وەکو ئەکتەرێك کە ڕۆڵی سەرەکی گرتبێت دەستی بە گێڕاندنەوەی چیرۆکی ژیانی خۆی کرد و کاتێك کە گوتی" بێجگە لە بەغدا، شام و تاران سەردانی هیچ شوێنێکی دیکەی نەکردووە، ڕاڕایی بوونی من دەبوو وەکو وردەکارییە گچکە بێزار کەرەکان. " خوێندکاریش بین، فەیلەسوفیش بین، تێکۆشەر و شۆڕشگێڕیش بین، هەر بە دوای هەستی نرخی خۆماندا دەگەڕاین". کاتێك کە نەسیمە باسی ئەم شتانەی دەکرد جگەرە لە دوای جگەرەی هەڵ دەکرد و لە جێگاکەی خۆیدا دەجووڵایەوە. گاه لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی دەکرد و گاه پەردەکەی لا دەدا و گاه لە نێو کتێبخانەکەی خۆیدا بە دوای کتێبێکدا دەگەڕا. کاتێك کە من وەرەندازی ئەو جەستە خڕەی نەسیمەم دەکرد کە هەر هەمووی هەستەکانی خۆی سەرکوت کردبوو، لە لای شانییەوە سەیری منی دەکرد و وتی" من چوار ساڵ پێشمەرگایەتیم کردووە و فیزیکم خوێندووە". کاتێك کە باسمان لە هەڵهاتن، ترس و مردنەکان و مرۆڤە مردووەکان دەکرد نزیکی یەکتر دەبووینەوە. لە ناکاوەوە دایکیشی بەو جلە سپیانەی کە لە بەری بوون هاتە لامان و گۆچانەکەی دەستی دا بە زەوییا و بە دەنگێکی پڕ لە ترس و لەرز وتی" بنوون دەی بنوون، ئێستا سەربازەکانی سەددام دێن" کاتێك کە دایکی ئەم شتانەی وت، ئێمەش هەر وەکو منداڵ وتمان باشە بە سەر چاو. دواتر نەسیمە وتی" دایکم هەر شەو چاوەڕوانی سەربازەکانی سەددامە، لە بەر چاوی

دایکیشمدا من بەدبەختێکی لاوازم کە نەمتوانیوە ژیانی هاوسەری پێك بهێنم". نەسیمە دەیگوت" لێرە خۆکوشتن و خۆ سووتاندنی ژنەکان لە لایەن میدیاکانەوە هیچ باسی لێوە ناکرێت و شتی خراپتریش ئەوەیە کە ئەو ژنانەی کە زانان و خاوەن خوێندەوارین زۆربەی جاران لە لایەن پیاوەکانەوە وەکو ژنی سێیەم یا چوارەم مار دەبردرن". کاتێك کە منیش وتم" ئەرێ تۆ باسی کێ بۆ کێ دەکەی" دەستی بە پێکەنین کرد. نەسیمە لەگەڵ سیاسەتمەدارێکدا کە ژن و منداڵی هەبووە پەیوەندی خۆشەویستی ژیاوە، ژنی ئەو سیاسەتمەدارە یەکێك لە خزمەکانی نەسیمە بووە کە خوێندەواری نەبوو. نەسیمە وتی" کاتێك کە بڕیاری جیا بوونەوەمان دا هۆزەکەی هەر هەمووی لە دژی من دەستیان بە قسە کردن کرد و من بووم بە ژنی خراپ، بۆیە زۆر سووکایەتیم پێکرا و گۆشەگیر بووم، جارجار دایکم مەرگەمووش دەخاتە نێو ژوورەکەمەوە و دەڵێ بخو با رزگارمان بێت لە دەستەوە" کاتێك کە نەسیمە باسی ئەم شتانەی دەکرد زوو بە زوو دەنگی گڕ دەبوو و سەیری کتێبخانەکەی دەکرد و دەیگوت" زۆر حەزم لە فروغی فەرەحزادە". بۆنی ئەو چاییە کە لە نێو سەماوەردا دەکوڵا تێکەڵی ئێش و ئازارەکانی نێو شێعرەکانی فەرەحزاد دەبوو.

کاتێك کە بە مەبەستی سەردانی هەڵەبجە سواری پاسەکە بووم زۆر گەرم بوو و لە هەناسە کێشاندا تەنگاو دەبووم. نەسیمە بە شوفێرەکە وتی" بیگانە نییە، بەڵام چاوت لێبێت". لە نێو رێگادا پیرە ژنێك و کچەکەی لە لای مندا دانیشتن، کاتێك کە هەستم کرد زۆر بە چاوی مەراقەوە سەیری من دەکەن ئەو کاتە منیش بە مەبەستی سەلماندنی خۆم دەستم بە ناوی شاخ، دۆڵ و کێو وگوندەکان کرد. کاتێك کە باسی چیرۆکی ئەنفالم دەکرد شۆفێرەکە هەر وەکو ئەوەی کە قسەکانی منی بە دڵ بێت سەری خۆی دەجووڵاندەوە و پیرە ژنەکەیش بە توندی دەستی کچەکەی خۆی دەگرت. لە ناکاوەوە چاوم بە دەم وچاوی ژنێکی جوان کەوت کە جل و بەرگێکی رەشی کردبوو بەر خۆی و هەر وەکو راهیبەکان بوو. لە سەرو چاوی پیرە ژنەکەوە ئێش و ئازار دیار و زۆر مەغروور بوو و کاتێك کە لە جموجووڵی لێوەکانیدا هەستم بەوە کرد کە سەرقاڵی دوعا کردنە وتی" کچەکەم نەخۆشە، ئەجننەکان ناهێڵێن تۆزێك ئارام بێت، شێخ دەڵی ئەوانەی کە لە ئێمە باشترن عاشقی کچی تۆن". ژنە جوانەکە سەیری شوێنێکی دووری دەکرد و منیش وتم" وادیارە مێردەکەت لە سەربازییدایە". زەردەخەکەنێکی گچکە لێوە نەرم و سپیاو کراوەکانی داگرت و وتی" ئێوە ژنە شارییەکان ناتوانن بە بێ مێرد بن بەڵام ئێمە ژنە گوندییەکان دەتوانین". پیرە ژنەکە وتی" بێدەنگبە عەیبە".

کاتێك کە مینومنتە روخاوەکەی هەڵەبجەم دیت وشك بووم. هیچ شتێك نەگۆڕا بوو. کاتێك کە پیرە ژنەکە وتی" خواحافێز" و کاتێك کە کچەکەیشی بەو گەرماییەدا سەرپۆشەکەی سەری خۆی توندتر دەکردەوە وتی" تۆ لە گەرمایی قیامەت ناترسی؟" من نەمدەویست کە شوفێر لەگەڵ مندا بێت.

دووکانە کچکە و هەژارەکان، ڕێگاوبانە بێ خاوەنەکان، ماڵە ڕەنگ شین و سەوزەکانی نێو باخچەکان هەر وەکو سەردەمی منداڵی من بوون. لە بەر دەرگای ناوچەکەدا پەیکەری باوك وکورەکەی لە نێو تۆزدا بوو، برێك لە دەوری ئەو پەیکەرەدا سووڕامەوە و دواتر چووم بۆ ناو گۆڕستانەکە. کۆڵانەکان بێ سەروبەر بوون و کچە باڵابەرزە سەر داپۆشراوەکان بەو سەیر کردنانەی خۆیانەوە هەر سەیری منیان دەکرد، کاتێك کە سڵاوم لێ کردن وەڵامیان نەدامەوە.

من کە ساڵانی تەمەنی خۆم بە کابووس و قەیران و ئێش و ئازارەوە تێپەڕ کردبوو، هیچ لە فەرقی ئەوەدا نەبووم، هەتاو لە سەر سەرم بوو، دەنگ و ریتمی باڵندە گەورە و گچکەکانیش گا بەرز دەبوویەوە و گا نەدەما. ئەو هەزاران کێلە کە سەیری منیان دەکرد هەر هەموویان دەبوون بە باوك، دایك و کاکم بۆ من. من دەمزانی گوندەکەمان لەگەڵ خاکدا یەکسان کراوە. کاتێك کە دەچووم بۆ باڵاخانەی قائیم مقام کە وەکو مزگەوت بوو، چاوە مەراق کەرەکان هەر سەیری منیان دەکرد. لەو پێشوازییە لە رادەبدەرەدا بێزار بووم. قائیم مقام کابرایەکی جوان و ژوورەکەی زۆر بێ سەرو بەر و پڕ لە تۆز بوو. وێنەی پیاوە مێژوویيەکان زۆر بە جوانی لە سەر دیوارەکاندا هەڵواسرا بوون. دواتر قائێم مقام وتی" من ئاگادار بووم کە ئێوە سەردانی هەڵەبجە دەکەن، زۆر بە خێر هاتن و پێویستی ئێمە بە مرۆڤی وەکو ئێوە هەیە". کاتێك کە ئەم شتانەی دەیگوت، جارجاریش گوێ لە دەنگ و باسەکان دەدا و بێژەرەکەیش دەیگوت" لە بەغدادا کامیۆنێکی مینرێژکراوە تەقێندراوەتەوە و بە سەدان کەس بریندار بوونە".

یەکەم شەو نەمتوانی لە میوانخانەی قائیم مقامدا بنووم، لە ژوورە گچکەکەدا قەرەوێڵەیەکی کۆن و کومودێکی دوو دەرگا هەبوو. ئەو پشوو و مێشانەی کە بە تەلی بەر پەنجەرەکەوە چەسپا بوون هیچ منیان بێزار نەدەکرد و جیزە جیزیان وەکو مۆسیقا بوو بۆ من. بە درێژایی شەو سەیری کووچە و کۆڵان و ماڵەکانم دەکرد، کارەبا زوو بە زوو دەبڕا. کاتێك کە بیرم لە سەردەمی منداڵیم کردەوە هەر هەمووی جەستەم دەستی بە تاولەرز کرد و وام دەزانی کە ئەگەر بڕۆمە دەرەوە چاوم بە بەرفین و میکائیل دەکەوێت. لە هەر شوێنێکی جەستەمدا عەرەق دەهاتە خوارەوە. کاتێك کە پشووەکانیش بە جەستەی منیانەوە دەدا زۆر کەیف خۆش دەبووم.

هەڵەبجە بریندار بوو... زۆربەی دانیشتوانی بیّ کار بوون. گوزەرانی خۆیان بەو ئەرزاق و پارەیە دەکرد کە لەلایەن حکوومەتەوە پێیان دەدرا. لە نێو بازاردا زۆر کەم چاوم بە ژنەکان دەکەوت. لە رۆژە سەرەتاییەکاندا کاتێك کە بە تەنیا لە نێو بازاڕدا دەسووڕامەوە دەستم بە گەڕان بە دوای ئەو کەسانەوە کرد کە دەمناسین. مرۆڤەکان بە حەزەرەوە خۆیان نزیکی من دەکردەوە. فرۆشیارەکان بە منیان دەگوت" خاتوو، گەورەم". لە نێو کۆڵانە تەسك و پڕ لە تۆزەکاندا ژنەکان سەرقاڵی شوشتنی شت و مەك بوون. خەریکی هەڵواسینی جل و بەرگ بوون و لە بەر سێبەرەکاندا هەندێك ژنی دیکەیش شتی وردەیان دەدووری و تووکیان دەخوارد و تفیان دەکرد. لە کاتی ئاوابوونی رۆژدا کاتێك کە تەنوورەکان هەڵدەکران، مانگاکان دەستیان بە بۆڕە بۆڕ دەکرد و کوترەکانیش لە سەر بان و باڵکۆنەکاندا خۆیانیان نیشاندەدا. ئەو ئانتێنانەی کە لە سەر بانەکاندا دەدرەخشانەوە و رەنگ و شەوقی تەلەفزیونەکان کە لە نێو ماڵەکاندا دەهات.... کاتێك کە سەیری ئەو کەسانەم دەکرد کە لە چواردەوری سینییەکەدا چوارمەشقییان دەکرد ، میکائیل، بەرفین، زەلیّ و پوورشەڤم دەبینی.

قائیم مقام دەستی بە قسە کردن دەکرد، چاوەکانی خۆی هەڵدەدا و دەیگوت لە خزمەتدام. رۆژێك بەیانی زوو بەرەو گۆڕستانەکەوە دەستم بە را کردن کرد و بسمار چوو بە پێمەوە و لەو شوێنەی کە بووم لە سەر هۆشی خۆم چووم. من لە نێو گوندەکەی خۆماندا بووم و یەکێك هەوڵی دەدا دەرگای بەنداوەکە بکاتەوە و ئەوی دیکەیش هەوڵی دەدا کە ئەو دەرگایە دابخات. ئەوانە کە دەیانەویست دەرگای بەنداو بکەنەوە هەر هەموویان جل و بەرگی رەشیان لە بەر بوو، ئەوانی دیکەش هەر هەموویان جل و بەرگی سپییان لە بەر کردبوو. دەنگەکانی سەردەمی منداڵیم دەکەوتنە گوێمەوە. کاتێك کە هەڵسام دیتم کە پێڵاوەکانی من پڕ بوونە لە مووری. دواتر لە نێو گۆڕستانەکەدا ناوی دایك و باوکی خۆم دۆزییەوە و وتم" بە هۆی ئەوەیەوە کە درەنگ هاتوومە بۆ لاتان من عەفوو بکەن و دەستم بە گریان کرد". کاتێك کە گەڕامەوە بۆ میوانخانەکە هەستم کرد کە تۆزێك بارگرانی جەستەم سووك بووە. لە سەر قەرەوێڵەکەدا خۆم درێژ کرد و دەرگای بەنداوی زانستی من کرابووەوە،و بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبیّ تۆزێك ئاو بدەم بەو شوێنە وشکانە. گەرمایی و تۆز باخچەی مێشکی من بوون و من وا هەستم کرد کە پێویستە دووبارە باخچەکەی خۆم سەر لە نوێیەوە ئاوەدان بکەمەوە. لە قرتاس چییەکی هەژاردا دەفتەرێکی زۆر گەورەم کڕی و وەکو شێتەکان دەستم بە نووسین کرد. "لە نێو کەش و هەوای ساماشی قژ هەتاوییدا دەهاتین، ناخمان پڕ بووە لە رووباری بێدەنگی. ئێمە وەکو ئەو

شەیتانەکلانە بوون کە لە نێو بەردەکاندا نۆقم ببوون. هیچ کات نە شار و نە ماڵێکمان نەبوو کە بتوانین تێدا ئێش و ئازارەکانی خۆمان بنووسین. ئاخ مزوپۆتامیا ئەی سەرچاوی ئێش و ئازارەکان! تەمەنی من بە بیر کردنەوە لە سەر تۆ تێپەڕ بوو. ئەو ئێش و ئازارانەی ئێمە کە سەهۆڵیان گرتووە چاوەڕوانی دەرمانن. ئوسریس لەو پەڕی هەتاوەوە چاوەکانی خۆی هەڵدەدا و دەیگوت کات بۆ ئێمە وەکو عەشقێکی باشی ناخمانە و چاوەڕوانی هەواڵێکین کە باڵندەکانی ئیسیس بۆمان بهێنن."

لە کاتی منداڵیماندا هیچ شوکولاتمان نەخواردبوو و هەمیشە سەرقاڵی خواردنی شەکری چایی بووین. ڕۆژی بینینمان زۆرتر لە ڕۆژی جەژنان خۆش دەویست. (مەبەست ئەو ڕۆژەیە کە کوڕ و کچ یەکتر دەبینن. وە). کاتێك کە ترسەکان جارێکی دیکە سەرتاپای ئێمەیان دادەگرت" کەچی پاز دە سەرباز هاتن" دواتر تێگەیشتین کە ئێمە لە وڵاتی خۆمانیشدا وەکو گەشتیارین.

وازم لێ بێنن دەمەوێ قسە بکەم.... بەرد، زەوی، باڵندە و ڕووبارەکان باش لە من تێدەگەن. کاتێك کە ئێش و ئازار شەوقی چاوانی ئێمە دەبرد ئەو کاتە شارستانییەت لەکوێ بوو؟ ئێوە نەتاندەزانی شارەکانی مردن لە کوێن! چونکە نەتان بینی بوو نەتان دەزانی. کاتێك کە ئێمە دەستمان بە شین و ڕۆ ڕۆ دەکرد و ئاگرمان تێ بەر دەبوو ئێوە تەنیا ئاوتان بە سەر ئاگری ناخی ئێمەوە دەکرد. دەمانەوێ ببین بە ڕووبار و تێکەڵی دەریا ببین تا بگەین بە خۆمان. دەمانەوێ بسووتێن! هەتاو ئوسریسی زنجیر کردبوو، ئایا هیچ شەڕێك هەبوو کە کۆتایی پێ نەدەهات وەکو ئەو ئاگرەی کە هیچ نەدەکوژایەوە.

ئاخ مزوپۆتامیا ئەی ئەو ڕێگایەی کە بۆ لای خوا درێژ کراوی، بەڵام بە داخەوە خوا ئێمە نابینی...

سەری ئێمە وەکو ماسی قەڵغان بوو، ئەو چوار دەرگایەمان کە بە هیچ شێوەیەك مۆر نەدەکران. ئێستا کاتی گەورە بوونی خۆشەویستییەك بوو. دێوە پیسە قێزەونەکان هەمیشە دەیانەویست ئەو خۆشەویستییەی کە تازە گەش بووە لە ناو برن. کاتێك کە بۆڵە بۆڵی فرعەونە قاتڵەکانی منداڵانم دەبیست چەندە ڕقم هەڵدەستا! هەر شەو لە خەودا دەمان دیتن ئەو کەسانە کە بۆ ئێمە سووتی مەرگیان دەکێشا. نە ڕوخساریان دیار بوو نە دەنگیان...

کاتێك کە ئەسمەر بوونی دایکەکانمان لە نێو سووری قەرەجەکاندا بزر دەبوو، وامان دەزانی کە هەمیشە لە کۆتایی هەر تاریکییەکدا ڕووناکییەکی بێ پایان هەیە. ئەی ئەو خۆشەویستەی کە لە دوورە دەستانی، وەرە با پێکەوە ڕووی خۆمان تیکەڵی ئاوابوونی ڕۆژ بکەین. ئەگەر بورانخانەکانیش نەمێنن، ئەو ئەسپانە کە بۆنی شاخیان پێوەیە و بە سەر شانیانەوە کۆتر هەیە

هەر دێنەوە و لە نێو کەش و هەوای مزوپۆتامیادا جار بزر دەبن و جار دیار دەبن. دواتر کاتێك کە لە نێو ماڵەکانی بن سووردا دەستماڵیان دەجووڵاندەوە ئەو کاتە ئێمەیش دەست بە هەڵپەڕکێ دەکەین. مانگە چوار روویەکەیش وەکو هەر جار بە شەوق و زەوقەوە سەیری ئێمە دەکات. ئایا ئەو هەڵەنانە هیچ لە ئاوە پیرۆزەکەی ولاتی ئێمەیان نەخواردەوە و هەتاوی ولاتی ئێمەیان نەبینیوە؟ هەر چەندە درەنگیش بووبێت، بەڵام ئیتر ئێمەیش دەتوانین هەتاو ببینین. ئاخ مزوپۆتامیا! هەر چەندە کە لەنکەی گیانیش بێت بەڵام بۆ ئێمە هەر ئەو تاجەی سەری بووکی کە رووناکیت لە نێو خۆتدا حەشار داوەتەوە...."

سەر لە نوێیەوە دەستم بە ژیان کرد، بە هاوکاری قائیم مقام لە نێو ماڵێکی یەك نهۆم و خاوەن باخچەیەکی گچکەدا جیگیر بووم. بان و بۆیەی دیوارەکانی ماڵەکە سەر لە نوێیەوە نوێ کرانەوە. دراوسێکان هەمیشە دەیان گوت ئامادەنە هاوکاریم بکەن و ئەو خواردنانەی کە لە ماڵەوە ئامادەیان دەکردن بۆمیان دەناردن. لە نێو تەنەکەکاندا چەندین گول، دۆشاوی تەماتە کە بۆ خۆیان دروستیان کردبوو لەگەڵ دۆشاوی هەنارو چایان دەهێنا. رووناهی، فاتمە، ئاسیە، ئاسو و بەلقیس.... فاتمە هیچ کەسێکی نەبوو و بە ساڵا چووبوو. ئاسۆ تازە بووك و ئاسیەش لەگەڵ ٩ منداڵی خۆیدا بۆ هەر کێشە و گرفتێك مەیدانی دەخوێند. رووناهیش کچێکی زیرەك و لێهاتوو بوو کە مەکتەبی دەخوێند. بەلقیسیش لەوانە بوو کە شەڕی هەر کەسی دەکرد و دانیشتوانی گەڕەك دەیانگوت لە ماڵ ماوەتەوە. من بۆ ئەوان باسی بەرفین، بیشەنگ، سولاڤی گوندەکەی خۆمان و زەینەبم دەکرد.

ئەو رۆحانەی کە لە نێو مرۆڤدا بزر دەبوون، هەر وەکو کتێبە بزر بووەکان بوون... سەرەڕای ئەوەی کە خوێندەوارییان نەبوو هاوکات، بن دەست بوون، سووك بوونیش ببوو وەکو بەشێکی سروشتی لە ژیانی رۆژانەیان.

بەیانیان بە دەنگی ئاسییە کە دوعای خرابی بۆ منداڵەکانی دەکرد لە خەو هەڵدەستام. بۆ نانی بە قەیاغ دەگریان، کاتێك کە سەرقاڵی کۆکردنەوەی ئەو مێوانە دەبووم کە لە نێو باخچەکەدا دەرژیان، فاتمە بە هۆی ئەوەیەوە کە منیان بێزار کردبێت خۆی لە ئاسیە و منداڵەکانی ئاسیە تووڕە دەکرد. من زۆر شەرمم دەکرد و ژنەکانیش هاوکات لەگەڵ دەنگی مۆسیقای عەرابێسك (مەبەست مۆسیقای نارەسەنە) دەستیان بە خاوێن کردنەوەی ماڵ و کۆڵانەکان دەکرد. کاتێك کە بە هۆی کاری وەرگێڕانەوە ماندوو ببووم و خۆم لە سەر قەنەفەکە درێژ دەکرد، وشەکان یەك لە دوای یەك خۆیان دەخستە بەرچاوی منەوە و منیش لەگەڵ ئەواندا

دەستم بە یاری دەکرد. وشەکان هەر وەکو رۆح بوون، ماوەیەك دواتر ئەو بارانەی کە بۆنی خەردەلّی لێوە دەهات دەستی بە کوتانی دەرگای من کرد، ئەمجارە بارانەکە زۆر جیاواز بوو. ئەو شتانەی کە دەمویست بیان بینم دەم بینین، کاتێك کە هەستم بەوە دەکرد کە بیری دایك، باوك و زەینەبم کردووە نوقمی نێو شەپۆلە گچکەکان دەبووم.

سەردانی گۆڕستان هەر ئێوارە ببوو وەکو جۆرەیەك لە عیبادەت بۆ من. فاتمە کە لە بەر دەرگای ماڵەکەی دانیشتبوو و خەریکی تەسبیحەکانی بوو" دەیگوت بە تەنیا روو لەو چۆڵ و بیابانانە دەکەی من زۆر دەترسم". کاتێك کە خواردنم بۆی دەبرد هەر وەکو منداڵ کەیف خۆش دەبوو.

ئەو پیاسانەی کە لەگەڵ رووناهیدا دەمانکردن دەبوون وەکو مەراسیم بۆمان. منداڵەکان بە دوایاندا دەکەوتن و ئەو جوانانەی کە سواری ئەسپەکان دەبوون و ئەو ماشینانەی کە بە لاماندا تێپەڕ دەبوون ئێمەیان نوقمی تۆز دەکرد و من لەو کەسانەی کە بە دووربین سەیری شوێنە دوورەکانیان دەکرد زۆر تووڕە دەبووم. بە هۆی ئەو بایەخدانەی من بە رووناهی، جار جار دەنگی رووناهی گڕتر و بە هێزتر دەبوو. رووناهی تۆزێك بە خاوی بە رێوە دەچوو. جارێکیان بەیانی ئاسیە هاتە لام. چاوی برێك ماسی بوو، کاتێك کە پێم وت " بۆ چاوت وای لێ هاتووە" وتی " من بێگونا و بێ چارەم" من وام زانی کە مێردەکەی لێ داوە. ئاسیە وتی" کاشکە لێدان بووبایا" چۆنە تۆ تا ئێستا ئەمەت نەبیستووە؟ جار جار هەر چەند درەنگیش بووبایا لە هندییە قسە بەرەکە (بەلقیس) شتەکان و رووداوەکانم پێ دەگەیشت. رووناهیش شتە باشەکانی بۆ من دەگێڕایەوە. ئاسیە وتی" ئەو ژنە رۆژنامەنووسە کە لە ئەورووپاوە هاتووە کەمی ماوە مێردەکەی من لە من بستێنێت، چاوی هیچ شتێك نابینێت و لەگەڵیدا دەگەڕێت". منیش وتم" تۆزێك هێمن و ئارام بە" ئاسیە دەیگوت" چۆنە ئارامم بێت ئەم ئێشە وەکو ئێشەکانی دیکە نییە". کاتێك کە ئەم شتانەم بیست بیرم لە قەیرانەکەی رەخشان کردەوە، خەم و ماتەمینی ئەو کاتەی من تەنیا و تەنیا نەزانا بوونی من بوو. کاتێك کە ئاسیە وتی" نازانم چی بڵێم ئەم ژنە دراوسێمانە نازانم بۆ چی بەمجۆرەن، بڵێم هارن یا بڵێم بێ ئەخلاقن؟" هەر دووکمان دەستمان بە پێکەنین کرد. ئاسیە دەیگوت" ئێمە خاوەن عەشیرەتین ناتوانین لە یەکتر جیا بینەوە". بۆیە دەستی بە دوعا کردن و گرتنەوەی فاڵ دەکرد تاکو بەمجۆرە پیاوەکەی واز لەو ژنە رۆژنامەنووسە بهێنێت.

رۆژێکیان لەگەڵ سیبەلدا هاتن بۆ ماڵی من، جەستەی زۆر لاواز ببوو و شەوقی چاوەکانی نەمابوو، کاتێك کە سیبەل چاوی بە من کەوت وتی" رۆژ باش، مەرحەبا،

هەلوو". بەو چاوانەی خۆی کە پڕ بوون لە ڕاڕایی و ترس بە بێ ئەوەی کە هەناسە بدات دەستی بە قسە کردن کرد. باسی ئەوەی کرد کە سێ مانگە سەرقاڵی لێکۆڵینەوە لە سەر پرۆژەیەکە کە یەکێك لە ناوەندەکانی ژنانیش پشتگیری لێ دەکات، بۆیە زۆر ماندووە و هاوکات خەڵکیش زۆر هاوکاری دەکەن و بە باشی پێشوازی لێ دەکەن. کاتێك کە قەهوە و شوکۆلاتەم بۆیان برد، ئاسیە بەو هەڵسوکەوتانەی خۆی کە تۆ بڵێی دەیەوێ لێت بپارێتەوە دەستی بە کۆکردنەوەی فنجانەکان دەکرد و ئاوی دەهێنا. من هیچ لە دژی ئەوە نەبووم کە هاوکاریم بکەن چونکە ڕەتکردنەوەی هاوکاری کردنی ئەوان عەیب بوو. سیبەل بە قسە کردنی خۆی مێشکی منی پڕ کرد، کاتێك کە هەر ڕستەیەکی بە وشەی من دەستی پێ دەکرد و بە وشەی من کۆتایی پێ دەها دەیگوت" ئەرێ وادیارە من زۆر قسە دەکەم" و دواتر دەستی بە پێکەنین دەکرد. ئەو شەوە سیبەل باسی هەر هەمووی بە سەرهاتەکانی ژیانی خۆی کرد. دەیگوت" باوکی تورکمانێکی ئیغدرلی و دایکیشی کوردێکی ئاغری و لە گەڕەکی ڤارشولەرەکانی ئەستەنبووڵدا و لە نێو زبڵخانەکاندا گەورە بووە و لە نێو قوتابخانە شەوانە ڕۆژییەکاندا مەکتەبی خوێندووە و کاتێك کە باسی ئەوەی دەکرد کە لە لایەن بەڕێوەبەری قۆتابخانەکەوە ڕووبەڕووی دەستدرێژ بووەتەوە دەیگوت" هەر چەندە ئەم ناوچانە زۆر هەژار و کەم داهات بن، بەڵام مرۆڤەکانی ئەم ناوچانە بە هیچ شێوەیەك ئامادە نین کە دڵ ئەخلاقی خۆیان پیس بکەن". سیبەل خاوەن کەسایەتییەك بوو کە دەیەویست هەر کەس بە تایبەتی ئەو کەسانەی کە هیچ لە ئازادی و سنوورەکانی ئازادی تێ ناگەن، لە مێشکی خۆیان دوور، زۆر بە ئاسانی خۆیان ڕادەستی هەستەکان دەکەن، ئەو کەسەی کە دەیبینێ زۆر بە ئاسانی عاشقی ببێت، لەگەڵیاندا هەڵسوکەوت بکات و لە ماوەیەکی زۆر کورتدا کاریگەرییان لە سەر بکات. کاتێك کە ئاسیە سیبەلی ناسی ئەو کاتە زۆرتر قەدر و قیمەتی منی دەزانی و ڕێزی لە من دەگرت و باوەشی بە منەوە دەکرد و دەیگوت" تۆ ژنێکی وەکو حکوومەت". بێدەنگ بوون و سەبری من سیبەلی بێزار کردبوو. ژماردنی کەمانییەکانی ئاسیە لە لایەن منەوە وردە وردە گۆڕا و بوو بە ڕێز گرتن لە ئاسیە و خۆش ویستنی ئاسیە. دواتر کاتێك کە ئاسیە دەستی بە قسە کردن کرد و سیبەلیش گۆییستی ئاسیەی کرد، ئەو کاتە هەڵسوکەوتی سیبەلیش لە بەرابەر ئاسیەدا گۆڕا و وردە وردە ئەویش فێری ڕێز گرتن لە ئاسیە بوو. دواتر سیبەل بە دەنگێکی

نەرم وتی" شتی زۆر هەیە کە پێویستە بنووسرێن و جێبەجێ بکرێن، من چ جۆرە چیرۆك و داستانم بیستووە".

محەمەد جێگری قائیم مقام و رووناهی پێکەوە لە ماڵەکاندا دەگەڕان، تا درەنگانی شەو هەر سەرقاڵی قسە کردن دەبوون، سەرەتا خەڵك بە شك و گۆمانەوە گۆییستی ئەوانی دەکرد، شتی هەرە زۆریش پێکەوە دانیشتنی ژن ومێرد لە یەك شوێندا بوو. بەڵام ژن و مێردەکان لە لایەکی دیکەوە زۆر بە ئاسانی دەستی یەکتریان دەگرت و بۆ خۆیان خەیاڵیان دەکردەوە. لە سەردەمی منداڵیمەوە تا ئێستا هیچ شتێك نەگۆڕا بوو. لە دوای چەند چاوپێکەوتنێك هەر لە هەمان ژووردا دەستمان بە قسە کردن دەکرد. ئەوەندە چای رەشمان دەخواردەوە کە زمانمان پێ سڕ دەبوو و خەڵکەکەیش زۆر گۆشاری دەخستە سەرمان بۆ ئەوەی کە ئەو خواردنانەی کە هێناویانن بیانخۆین. لە شوێنی سەدرییەکاندا چەند مۆبل و قەنافەیەکی ئەرزان دانرابوون، ویترینە گچکەکان و قاعیدەکانی تەلەفزیونەکان ئەو شتانە بوون کە لە نێو هەر دووکانێکدا بە دی دەکران. ئەو کەسانە کە لە رووی ئابوورییەوە بڕێك بارودۆخیان باش بوو لە ماڵەوە سارد کەرەوە و مەکینەی کارەبایان (موەلیدە. وە) هەبوو. مێزەکان رازێندرانەوە و خواردنەکانیش ئامادە بوون، هەر کەس لە سەر زەویی لە سەر فەرشێکی بێ رەنگدا لە دەور سفرەکە کۆ بووەوە و منداڵەکانیش دەستیان بە جێبەجێ کردنی مەشق و تەکلیفەکانی قوتابخانەیان دەکرد. ئەو ژنانەی کە لە کاتی ئەنفالدا مێردەکانی خۆیانیان لە دەست دابوو بارودۆخیان هیچ باش نەبوو. جل و بەرگی رەش و روخساری خەمبار و مەلوولیان هیمای ئەوە بوو کە خاوەن ئێش و ئازارن. هیچ خۆیان تێکەڵی قسە کردنەکان نەدەکرد و لەو لاوە دەستیان بە کۆ کردنەوەی شت و مکەکان دەکرد. رابیعە کە باسی پیاو خاسی مێردەکەی خۆی دەکرد کە بە دەستی موخابراتدا کوژرا بوو، ژنێکی زۆر جیاواز و سەرنجڕاکێش بوو. هێزی خۆی و ئاسوودە بوونی خۆی لە بەتەمەن بوونی خۆی وەردەگرت. لە تەبلکی تووتنەکەی خۆیدا دەستی بە پێچانەوەی جگەرە دەکردو لەگەڵ پیاوەکانیشدا زۆر بە لێهاتوویی قسەی دەکرد و دەیگوت" ئاخ با چاڵەکانی ئەم دەورە زمانیان هەبایا ئەو کاتە بزانیبایا کە باسی چیتان بۆ دەکەن". حاجی یووسف دەیەویست کچەکەی خۆی بداتە خزمێکی خۆی، بەڵام پیاوەکە ٣٠ ساڵ لە کچەکە بەتەمەنترە و کچ هێشتاکە منداڵێکی تەمەن ١٥ ساڵانە. کاتێك کە کچەکە وتی" من دەمەوێ لەگەڵ هاوتەمەنێکی خۆمدا ژیانی هاوسەری پێك بهێنم" باوکیشی وتی" ئەوە تۆی لە سەر قسەی مندا قسە دەکەی ها" چەند هاوارێکی ناشیرینی کرد و دواتر شەیتان سمبێلەکانی هەڵکێشا و

گوللەیەکی نا بە سەری کچەکەی خۆیەوە. لەم کات و ساتانەیشدا نازدار کە نەیاندەهێشت بچێتە قۆتابخانە خەریك بوو شێت ببێت. بە هۆی ئەوەیەوە کە لە دژی خانەوادەکەی خۆی راوەستا بوو کە ویستبووی نازدار بداتە کوڕ مامەکەی خۆی، شەو و رۆژ لە ماڵەوە سووکایەتییان بە نازدار دەکرد و براکانی پێیان دەگوت" تۆ دەتەوێ ئابروو و حەسیەتی ئێمە ببەی، لەمەو بە دواوە حەوسارت دەکەین و لە نێو بازاڕدا لەگەڵ خۆماندا دەتگەڕێنین و کامە پیاوت بە دڵ بێت ئەو کاتە مێردی پێ دەکەی". براکانی بەجۆرە سووکایەتی و گاڵتەیان بە نازدار دەکرد. رێژەیەکی یەکجار زۆری دانیشتووان کاریان نەدەکرد و بەو پارە و ئەرزاقانەی کە لە لایەن حکوومەتەوە پێیان دەدرا گوزەرانی خۆیانیان دەکرد. هیچ کێشەیەکی ئەوان وەکو کێشەی خواردنی تەندروست و باش نەبوو. چاق و قەڵە و بوون هێمای دەوڵەمەند و خاوەن هێز بوو. کاتێك بیستم ئەو پیاوانەی کە لە بەر دووکانەکاندا تەسبیحێك بە دەستی خۆیانەوە دەگرن و پیاسە دەکەن، هەر باسی پارە و ژن دەکەن ئەو کاتە من زۆر بێ هیوا بووم. سیبەل دەیگوت" ئەوان بە چاوی ئەوە سەیری ژنانی ولاتانی رۆژئاوایی دەکەن کە زۆر بە ئاسانی هەڵدەخەڵەتێندرێن و عاشقی مرۆڤ دەبن و ئەم پیاوانە بە چاوی رووسپی (لێرەدا مەبەست لە رووسپی لەشفرۆشە. وە) سەیرمان دەکەن.

کاتێك کە من داوام لە قائیم مقام کرد کە مۆڵەت بدات تا ژنەکەی هاوکاریم بکات، دەنگی قائیم مقام گڕ بوو و وتی" لە ماڵەوە کار و ئەرکی زۆرە". کاتێك کە من وتم دەمەوێ لە ژێر ناوی پرۆژەی جۆراوجۆردا ژن و کچەکانی کۆمەڵگە پەروەردە بکەم، قائیم مقام دەستی بە پێکەنین کرد. بەڵام کاتێك کە سوور بوونی منی لەم بارەیەوە دیت ئەو کاتە تۆزێك هاتە سەر خۆ و وتی" چیت دەیەوێ ئامادە و لە خزمەتدام". کاتێك کە لەگەڵ قائیم مقامدا قسەمان دەکرد، جار جار سەیری ئەو خەڵکەم دەکرد کە بە مەبەستی وەرگرتنی هاوکاری لە بەر دەرگای رێکخراوێکدا کۆ ببوونەوە، لەم کات ساتانە ئەو پەنابەرانە بە بیرم دەهاتنەوە کە لە ئەورووپادا بە هەزار ترس و شەرم دەچوون و سەردانی ناوەندەکانی هاوکاری کۆمەڵایەتییان دەکرد و هاوکارییان وەردەگرت. روخساری ئەو کەسانەی کە هاوکارییەکانیان پێشکەشێدەکرد پڕ بوو لە چرچ و بە چاوێکی سووك سەیری پەنابەرەکانیان دەکرد و پەنابەرەکانیش لە سرا و نۆبەکانی خۆیاندا ئێش و ئازارو بێزار بوونی خۆیانیان بە قسە وتن بە یەکتر دەردەبڕی. جارێکیان پەنابەرەکان شەڕی کارمەندەکانی رێکخراوێکی مەدەنییان کردبوو کە هاوکاری پێشکێشی پەنابەران دەکرد. ئینجی زیاتر لە ٣٠ ساڵ بوو بە شێوەیەکی خۆبەش و خەیر کردن

لە نێو ڕێکخراوە مەدەنییەکاندا کاری دەکرد. کاتێك کە جگەرە لە دوای جگەرەی پێ دەکرد و ئەوانەی لە لایدا بوون لە نێو دووکەڵدا نوقم دەبوون، موچیاری پەنابەرەکانی دەکرد و دەیگوت" ئێوە ئەوانە ناناسن، من باشیان دەناسم، پێویستە ئێوە هەوڵ بدەن کە زمانی ئەم وڵاتانە باشتر و زووتر فێر بن و لە ڕووی کولتوورییشەوە خۆتان زووتر فێری کولتووری ئێرەکانە بکەن، ئەو کاتە دەزانن کە ئەو کەسانە کە ئێستا لە دژی ئێوەن و زۆر بە ساردی سەیرتان دەکەن دەبن بە مرۆڤی هۆمۆنیست و زۆر خێریان پێتان دەگات".

چەند مانگ چاوەڕوانی ئەوەمان کرد کە بنکەیەکی تەندروستی زۆر کۆن ڕستۆرە بکرێتەوە، هیچ ئاسان نەبوو، ژنەکان بە باشی بەشداری خول و دەورەکانی ڕاهێنانیان نەدەکرد، کاتێك کە کۆ دەبوونەوە لە هەر دەرفەتێکی گچکەدا دەستیان بە قسە کردن سەبارەت بە مێرد،ماڵی خەسوو و ئەو کاتانەیان دەکرد کە کەسێك چووە خواستنیان. ئەو پیاوانەیش کە خاوەن خوێندەواری بوون هیچ جۆرە دەسەڵاتێکیان نەبوو، کاتێك کە لە تەنیشتی باوکییاندا بوون حەزیان لە ژن و منداڵەکانی خۆیان نەدەکرد و بە هیچ شێوەیەکیش ناوی ژنەکانیان نەدەبرد و هەمیشە دەیانگوت " ئەوانەی نێو ماڵ یا عەیاڵ". کاتێك کە لەگەڵ مندا قسەیان دەکرد نەیاندەتوانی سەیری من بکەن، و دەیان گوت" لە سایەی خول و دەورەکانی ئێوەدا هیچ گۆییستی ئێمە ناکەن، بۆیە گلەییمان لە تۆ هەیە". منیش بە دەنگێکی بەرز دەمگوت" ئەگەر ناتوانن پێشی لە جەنایەتەکانی داب و نەریتەکان بگرن ئەو کاتە مانای ئێوە چییە؟" زۆر زوو دەنگم بەرز دەبووەوە بۆیە هەوڵم دەدا کە برێك ئارام و لە سەر خۆ بم. کۆمەڵگەی جەماعەت هەر وەکو شاخێك بوو لە پۆلا! کاتێك کە بیرم لەوە دەکردەوە کە من بێگانەی خەڵکی ئەو ناوچەم کە تیادا لە دایك ببووم، دەمزانی کە چۆنە بە سەر نائومێدی ناخی خۆمدا زاڵ ببم.

دوای ماوەیەك توانیمان کە ڕێکخراوەکەی خۆمان برێك چالاکتر بکەین، ئەو کەشتییە گچکەی خەیاڵی خۆمان کە لە ڕەشەبای شاخەکان پڕ ببوو و دەستی بە ڕێپێوانێکی ئاوارتە کردبوو، زۆر خۆش دەویست. هاوکات لەگەڵ دوو مامۆستا، پزیشکی ڕەوانکاو، پارێزەر و دوکتۆرەکانماندا گرووپێکی زۆر چالاکمان دامەزراندبوو، بێجگە لە کار و چالاکییەکانمان، یەك ڕۆژمان لە نێو حەفتەدا بۆ گەشتوگوزار و ئاهەنگ گێڕان دەست نیشان کردبوو. هاوکات لەگەڵ هاتنی پزیشکی ڕەوانکاو نەرگیز، پارێزەر فاتمە و دوکتۆر شوکریە کار و چالاکییەکانی ئێمەش بەرفراوانتر بوون. نێرگز خەڵکی جەزیرەی بۆتان بوو و لە ئانکارادا زانکۆی تەواو کردبوو، دوای چەند ساڵێك کار کردن لە ناوەندێکی تایبەتیدا، بە دڵی خۆی بڕیاری دابوو کە بێت و لەگەڵ

ئێمەدا کار بکات. نەرگێز زۆر حەزی لە کارەکەی بوو و هەر هەمووی دەنگی ژنەکانیشی لە لای خۆیەوە تۆمار دەکرد. هەر چۆنە هیچ گرنگییەکی بە قەڵەو بوونی خۆی نەدەدا هەر بەمجۆرەیش هیچ دەردێکی بۆ سەلماندنی خۆی بە سەر ئەوانی دیکە و سەرنج راکێشانی خەڵکیشی نەبوو. زۆر بێدەنگ و ئارام بوو، چرچەکانی سەر دەموچاوی وایان نیشاندەدا کە گوایا گاڵتە بە مرۆڤ دەکات.

فاتمە لە بەغدادا زانکۆی تەواو کردبوو و لە رووی زانیاری پیشەییەوە زۆر کەسایەتێکی دەوڵەمەند بوو و من جار جار لە تێگەیشتن لە فاتمە تەنگاو دەبووم. تۆزێك کەمانی و کەماسی بەو رۆحەی فاتمەوە کە لە نێو یاسا و خاڵە یاساییەکاندا نوقم ببوو دیار بوو. هیچ کات شرۆڤەی زۆری نەدەکرد و بەشداری لە قسە کردنەکانی ئێمەیشی نەدەکرد و لە نێو ژوورەکەی خۆیدا هەر سەرقاڵی قورئان خوێندنەوە بوو. کاتێك کە جار جار بانگمان دەکرد و دەمانگوت" برێك شتمان ئامادە کردووە ناخۆی؟" ئەو کاتە دەنگە نەرمەکەی فاتمەمان دەبیست. نە سەبارەت بە ژیانی تایبەتی خۆی و نە سەبارەت بە کارکردنی خۆی باسی هیچ شتێکی بۆ ئێمە نەدەکرد. مێردەکەی لە سلێمانیدا بەرپرسێکی پایە بەرز بوو. شوکوریە بە پێچەوانەی فاتمە، لە شام زانکۆی تەواو کردبوو و لە مێردەکەی جیا ببووەوە و زۆر چالاك و خۆش رەفتار بوو. بە هۆی ئەوەیەوە کە ئەوەی قەبووڵ نەکردبوو کە مێردەکەی لەگەڵ ژنێکی دیکەدا پەیوەندی هەبێت، لە مێردەکەی جیا ببووتەوە و زۆریش کەیف خۆش بوو. هەمیشە خەیاڵی عەشقێکی گەورەتری لە سەری خۆیدا دروست دەکرد. کاتێك کە دەیگوت" هەر رۆژێك دێت و دەگەمە ئەو مرۆڤە جوانەی کە دڵم داوای دەکات" شیعر و چواربەیتییەکانی مەلایێ جزیریشی دەخوێندەوە" محنەتی عەشق زۆرە، عەشق بێگومان بەڵایە، تەمەن باش تێپەڕ دەبێت لەگەڵیدا، عەشق بە مانای ژیان کردن لەگەڵ دەرد و دەرماندایە،" شوکریە کاتێك کە مێکیاژی دەکرد بە لای چاوەوە سەیری منی دەکرد و بە شێوەیەکی گاڵتەجاری پرسیاری دەکرد" ئەرێ بۆ چی خۆمان بۆیە دەکەین؟ و دەستی بە پێکەنین دەکرد و دەیگوت" تۆیش عاشقێکی لێهاتووی من تۆ دەناسم".

شوکریە و نێرگزلە نێو ئەو بینایانەدا کە تازە دروست کرابوون دادەنیشتن، مافی منیش هەبوو کە لە نێو یەکێك لە شوقەکانی ئەم لۆژمانانەدا دابنیشم، بەڵام من لەگەڵ ماڵە گچکەکەی خۆمدا را هاتبووم. جارجار بە شەوان سەردانی یەکترمان دەکرد و پێکەوە خواردنمان ئامادە دەکرد. نێرگز کاتێك کە وتی دەمەوێ چیرۆك و تراژدیای ئەنفال بنووسم و لەگەڵ ئێمەدا قسەی دەکرد لە سەر هۆشی خۆی چوو. و دواتر بەو قسە کردنە کتێبیانەی خۆیەوە دەستی بە

قسه کردن دەکرد و دەیگوت لە کوێ قسەکانماندا بووین و بەجۆرەیش دەیوەیست ئامادە بوونی بەشداری کردنی خۆی لە قسەکانی ئێمە دەربڕێت.

کاتێك کە لە بەرەبەیانییانی ڕۆژە بێزار کەرەکانی زستاندا لە خەوم هەڵدەستام لە لووتی خۆمدا هەستم بە ساردی ژوورەکەم دەکرد، پەتووەکەم بە خۆمدا دەدا و بە هۆی ئەوەیەوە کە وردە وردە هەستم بە بیانی بوونی خۆم نەدەکرد زۆر لە خۆم ڕازی و گەش بین بووم. کاتێك کە سۆبەکە گڕی دەگرت و بۆنی بەرف ژوورەکەی دادەگرت و چاییدان و کترییەکە لە سەر سۆبەکەدا دەستیان بە چیزچیز دەکرد، لەگەڵ ئەو دەنگانەی کە لە ڕادیۆکەدا بەرز دەبوونەوە، ئەو وەرگێڕانە کە پشتر کردبووم ئەو کتێبانەی کە سەیری منیان دەکرد، هاوکات لەگەڵ ڕوتینیاتی ڕۆژانەدا دەمویست شتی زۆر بخەمە نێو دەوری خۆمەوە. وردە وردە فێری خوێندنەوە بە ئەلف و بی عەرەبی ببووم و زۆر حەزم لە خوێندنەوەی ڕۆمانەکانی خۆشەویستی دەکرد. کاتێك کە من دەستم بە کاری خۆم دەکرد نێرگزیش خۆی درێژ دەکرد و دەستی بە خوێندنەوەی ئەلف و بێ لاتینی دەکرد، نەیدەویست لە سەر ئەلف و بێ زۆر کاربکات چونکە دڵی حەزی لە قسە کردن بوو. جار جار من نێرگزم ئاگادار دەکردەوە و دەمگوت" پێویستە کار بکەین و بێدەنگ بین". هەرچەندە لە ڕووی تەمەنەوە لە من گەورەتر بوو، بەڵام هەمیشە بە خۆشکی گەورە بانگی منی دەکرد. جارجار دەبوو وەکو منداڵ و دەستی بە پرسینی شتی زۆر سەرنج ڕاکێش دەکرد. لە ڕاستیدا زۆر ژیر و لێ هاتوو بوو. دەستی بە پێکەنین دەکرد و دەیگوت" خۆشکی من ئەگەر بە ڕاستی دەست بە شێتایەتی نەکەم دەتەقمەوە". کاتێك کە منیش شتێکم بکردایا یا بگوتایا دەمزانی کە ڕێزم لێ دەگرن. نێرگز دەیگوت" ئەگەر مێرد بکەم ئەو کاتە پێویستە خزمەتی مێرد بکەم تا حورمەتم لێ بگرێت". منیش دەمگوت " حورمەتیان بکەوێتە سەریان! پیاوەکان زۆر بێ خەیاڵن منیش دەمویست منداڵێکم هەبێت".

دواتر نێرگز دەیگوت ئاخ تووشی چ ڕۆژگارێك بووینە، دەڵێن لە ئەورووپادا بانکی ئەسپرم هەیە و ئەو کەسانەی کە حەزیان لە منداڵە دەتوانن بە بێ ئەوەی کە ژیانی هاوسەری پێك بهێنن ببن بە خاوەن منداڵ، بەڵام ئەگەر لێرەکانە کەسێك شتێکی بەجۆرە بکات ڕاستەوخۆ سزای مردنە. بە مەبەستی ئەوەی کە نیشانبدات کە حەزی لە بەردەوام کردنی قسە کردنە، دەستی بە دەم کردنی چای دەکرد و دەوروبەری سۆبەکەی خاوێن دەکردەوە. جارجار ئاماژەی بەوە دەکرد کە دەیەوێ قسە و باسەکانی نێو گەڕەك و کۆڵانەکان بگێڕێتەوە و دەیگوت" ئەو پیاوانە کە بە مەبەستی نوێژ خوێندن بەیانیان زوو لە ماڵەوە دەردەچن، دەچن بۆ لای بێوە

ژنەکان و باسی ئەوەی دەکرد کە چۆنە ئەسمایان بە هۆی ئەوەیەوە کە مێردی بردووە نێو ماڵی خۆیەوە کوشتوویانە.

لە رۆژەکانی زستاندا کۆبوونەوەمان لە دەرەوەی سۆبەکە و قسە خۆشەکان و قۆڵپە قۆڵپی سەماوەر و چایە دەمکراوەکە و لەگەڵ نانە گەرمەکەی نێو تەنووردا تامێکی زۆر جیاوازیان هەبوو و هەر شت ئەوەندە خۆش بوو کە تام و چێژی رۆحی خۆمانمان دەزانی. هەر رۆژێك چیرۆکێکیان دەگێڕایەوە و باسیان لە قارەمانەکانی چیرۆکەکان دەکرد. هەوڵمان دەدا کە چیرۆکەکان بە رێبازی شانۆیی بگێڕینەوە. روونی، تاتیس، ئەکرەم و مولکییە سی دی جۆراوجۆریان بۆ من بە رێ دەکرد. لە رۆژی نمایش کردنی فیلم یا رۆژی ئاهەنگ گێڕاندا، هەر کەس باشترین و نوێترین جلی خۆی دەکردە بەرو ماکیاژێکی زۆر باشی دەکرد و قۆڵی خۆی هەڵدەدایەوە، سەرەتا لە کاتی سەیر کردنی فیلمە ئینگلیزی، فەرەنسی و تورکییەکاندا برێك تەنگاو بووین، دواتر پەیمانێکمان لەگەڵ کۆمپانیایەك کە لە ئەستەنبوڵ کاری دووبلاژ کردنی دەکرد مۆر کرد. بێگومان ئەوەی کە ئەم کارەی بۆ ئێمە کرد تەنیا ئەکرەم و مولکییە بوون. دواتر کاتێك کە سەیری فیلمە دووبلاژ کراوەکانمان دەکرد هەر کەس بێدەنگ دەبوو و بە وردبینییەوە سەیری فیلمەکەی دەکرد. جارجار زۆربەی ژنەکان لە لەختەکانی راموسان لە نێو فیلمەکاندا بێزار دەبوون و نارازی بوونی خۆیانیان دەردەبری. زۆر بە هێمنی لە سەر جێگاکانی خۆیاندا دەجووڵانەوە و دەستیان بە پێچ پێچ دەکرد و چاوەکانیان دادەخست. جارجاریش کە نەیاندەتوانی پێشی لە پێکەنینەکانی خۆیانیان بگرن ئەو کاتە دەستەکانیان دەدا بە بەردەمی خۆیانەوە و دەیانەویست باوەڕ بەوە بکەن کە ئەمجۆرە فیلمانە یا ئەو جۆرە لەختانە بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت واقیعیەتیان هەبێت. زۆر کەیفیان بە فیلمی" سۆرۆ و یووڵ"دەهات. بە رۆژانێکی درێژ هەر باسی زینێ و ئەسپە مردووەکەی زینێ کە لە فیلمەکەی یووڵدا پیشاندرابوو دەکرد. کاتێك کە بۆ بەریڤانی نێو فیلمەکەی سۆرۆشدا دەگریان، سەیری ژنە قەڵەوەکەی نێو ڤاگۆنەکەیانیش دەکرد و تۆفیان لێ دەکرد. هاوکات زۆر حەزیان لە فیلمەکانی ساڵانی ٨٠کانی تورکیا دەکرد. لە سەیر کردنی فیلمی سەلڤی" تورکان شوورای هیچ وەرەز نەدەبوون. وشەی " خۆشەویستی رەنج کێشانە" کەوتبوو سەر زمانی هەر کەس. دواتر دەستمان بە خوێندنەوەی مەم و زینی ئەحمەدێ خانی کرد. هەر رۆژ یەك کاتژمێرمان تەنیا بۆ خوێندنەوە تەرخان دەکرد. رەمەئو و ژۆلیایەتی ئێمەش لەیلاو مەجنوون بوون. ئەوان زۆر بە باشی دەیانزانی کە ئەحمەدێ خانی، پاکی، ڕووڕاستی، بێ تاوانی و یەکسانی و ماف و

ئازادییەکانی لە نێو مەم و زیندا کۆکردووەتەوە، هاوکات دڵبەرە لێو هەنار و روو مەهتابییەکانی خانیّ و بەکۆیان زۆر بە باشی دەناسی. دوو رووەکانیش ببوون وەکو بەکۆ فەسادو. (بەکۆی خرابکار).

لە کۆتایی حەفتەدا زۆر بە خێرایی سۆیەکەم هەڵدەکرد و برێك لە نێو کومپیوتە رەکەی خۆمدا دەگەڕام و دواتر دەستم بە کاری وەرگێڕان دەکرد، ئەوەندە خۆم سەرقاڵی بیر کردنەوە لە سەر وەرگێڕان دەکرد کە لە بیرم دەچوو گلۆپەکان پیّ بکەم. جارێکیان رۆژی جومعە لە نێو بازاڕی گوندییەکاند سەرقاڵی کڕینی سەوزە بووم و لە ناکاوەوە چاوم بەو خاچەی کەوت کە لە ملی کابرایەکی نارفرۆشدا بوو. کابراکە دەستی بە پێکەنین کرد و وتی" خوای هەمووومان یەکە بەڵام ئێمە بۆ خۆمان جیاوازین". هەر جار کە دەچووم بۆ ئەو بازاڕە، ئەو کابرایەم دەدیت و هەر وەکو ئەوە بوو کە سالانێکی درێژە دەیناسم. سەردەمێك مێشکی منی سەرقاڵی خۆی کرد. هیچ حەزی لە قسە کردن نەدەکرد و هیچ کاتیش نەیدەویست کە وەڵامی باشی پرسیارەکان بداتەوە. چاوەکانی مۆری زانا بوون و تێگەیشتنی بوون. کاتێك کە ناوی گوندەکەی منی هێنا ئەو کاتە منیش هاوارم کرد " تۆ برای میکائیلی؟" دواتر وتی" لەگەڵ میکائیلدا لە نێو یەکێك لە ئوردوگاکانی ئێراندا چووینە جەزائیر بۆ لای مامان. دواتر میکائیل لەگەڵ کچێکی ئەسفەهانیدا ژیانی هاوسەری پێکهێنا و لەویّ دەستی بە کاری کشتوکاڵ کرد و منیش گەڕامەوە". کاتێك کە ئەم قسانەی دەکرد پێکەوە وشەی بەرفینمان بەکار هێنا و بەرفینیش لە نێو ئەو پەنابەرانە ببوو کە لە گراوەکانی ئیتالیادا نوقم ببوون و گیانی خۆیانیان لە دەست دابوو . کاتێك کە من نارە ترەکاوەکانی یووسفم دەخوارد، بالغ بوونی بەرفین و نوقم بوونی و لە نێو لم بزر بوونی جەستەی بەرفین لە قەراخەکانی گراوەکانی ئیتالیادا بە بیرم دەهاتەوە.

نامەی زۆر درێژم بۆ رووونی دەنووسی. کاتێك کە دەمنووسی کە گریان و کابووسە بیّ کات و وەختەکانم نەماون، دەنگی گڕ دەبوو و ماتەمینی پێوە دیار دەبوو.جارجار دەیگوت" تۆ ماوەیەکی دیکە بێزار دەبی و دەگەڕییەوە". بەڵام کاتێك کە رووونی هەستی بە سوور بوونی من دەکرد ئەو کاتە لە دەنگەکەی تێدەگەیشتم کە دەیەویّ دەسەڵاتی خۆی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بە سەر مندا بسەپێنێت. کاتێك کە رووونی دەیگوت" هەر وەکو شێتەکان سەرقاڵی وێنەکێشانم و زۆر بیّ خورد و خەوم" منیش وتم " تۆ هێشتاکە هەر بۆ من تایبەتی".

لە سەرەتای وەرزی هاویندا رووونی، تائیس و سەمەد هاتن بۆ سەردانی من. تائیس ئەو کاتە سکپڕ بوو. کاتێك کە لە ژێر سەێبەری دار هەڵووچەکەی باخچەکەدا نانی بەیانیمان

دەخوارد، رِوونی نانە باریك و نەرمەکەی سەر ساجی زۆر بە سەرسوڕمانییەوە لوول دەکرد و سەیری منی دەکرد. تائیسیش دەیگوت" لەم ماڵەدا بە تەنیا دەژی، دەردی تۆ چییە کە دەتەویّ بەجۆرە ژیان بکەی؟" تائیس خۆی لە من تووڕە دەکرد. ئێوارە دەستمان بە رۆیشتن بۆ سەوزاییەکان کرد، پشوو و مێشەکان لە سەر سازلیکەکانی نێو دەرە گچکەکان هەر وەکو پەڵە هەور بوون و تائیس زۆر لێیان دەترسا و سەمەدیش بە پێکەنینەوە دەیگوت " خاتوون لە نێو کۆشکدا گەورە بووە". رِوونی هەر دوا دەکەوت هەوڵی دەدا ئەو ئیسقانەی کە قووتی دابوو جارێکی دیکە دەری بهێنێتەوە.

دۆڵێکی گچکە و ئەو ئەسپانەی کە جارجار دیار دەبوون و جارجاریش بزر دەبوون......

بە مەبەستی ئەوەی کە جارێکی دیکە بگەرِێمەوە بۆ ژنێڤ تائیس بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ گۆشاری دەخستە سەر من و دەیگوت" هەر ساڵ دوو یا سێ مانگ لێرە بمێنەوە بۆ تۆ زۆر باشتر و بە بەرهەمترە".تائیسیش هەر وەکو رِوونی نەدەویست کە سوور بوونی من لە سەر بریارەکانی خۆم قەبووڵ بکات. دەیەویست بەجۆرە تووڕە بوون و دایك بوونی خۆی بۆ من گەورەتر بکات. هەر چەندە کە هیچ نەمدەهێشت کە تائیس هەست پێ بکات بەڵام لەو هەڵسووکەوتەی تائیس کە دەیەویست عەقڵم پێ بدات بێزار دەبووم و گاڵتەم بە تائیس دەکرد.

من دەمگوت" ئەریّ ئەمانە بۆ لە ژنێڤ بەجۆرە هەڵسوکەوتیان نەدەکرد بۆ لێرە بەجۆرەن؟"

دواتر وردە وردە دەستمان بە کۆکردنەوەی هەڵووچە پێگەیشتووەکان لە دارەکە دەکرد. هەڵەبجە ببوو وەکو پردێکی ئاسنی لە نێوان من و تائیسدا...

تائیس هیچ ئاگای لە وڵات و زمانە تۆریستییەکە خۆی نەمابوو و هیچ هەستیشی بە هۆمانیزمی ئەورووپا نەدەکرد و لە ژنێڤ لەگەڵ سەمەددا بە فارسی قسەی دەکرد و لە هەڵەبجەیش بە فەرەنسی قسەی دەکرد.

شەو کاتێك کە دەنگی پێکەنینی سەمەد و تائیسمانی بیست مانگەشەو شەوقی دابوو نێو ژوورەکەمانەوە، کاتێك کە رِوونی جگەرەی دەکێشا و سەیری باخچەکەمان دەکرد بێدەنگ دەبووین و من بە رِوونیم وت" برێك قەڵەو بوویی" رِوونیش بە دەنگێکی نزم وتی لە سایەی تۆدا ئەوەندە قەڵەو بوومە. رِوونی کاتێك کە خۆی لە سەر قەرەوێڵەکە درێژ کرد وتی" ئەریّ ئەم ماڵەی تۆ دڵۆپیان دەکات؟" منیش وتم" گوایا رستۆرە و تەعمیرمان کردووەتەوە". کاتێك کە وەکو هەر جار قاچی خۆم دەخستە سەر قاچی و سەری خۆم دەخستە سەر سینگە رووتەکەی بۆ یەکەمین جار بووم بە شاهێدی ئەوەی کە رِوونی دەست بە گریان بکات. لە لایەکەوە زۆر

بەزەییم پێ دەهاتەوە و لە لایەکی دیکەشەوە کەیف خۆش دەبووم. روونی وتی" من رێز لە بڕیاری گەڕانەوەی تۆ بۆ هەڵەبجە دەگرم و زۆر دەمەویست لێرە لەگەڵ تۆدا ژیان بە سەر بەرم..." کاتێك کە روونی ئەمشتانەی دەیگوت دەنگی زۆر گڕ ببوو. بە مەبەستی ئارام کردنەوەی روونی دەستەکانم بە دەوری جەستەیدا دەگەڕان و لە نێو رووناکی مانگە شەودا چاوە پڕ لە فرمێسکەکانی سمبێلەکانی تەڕ دەکرد و بە دەنگێکی ناشکرا و فەسێح دەیگوت" ئەرێ تۆ واز لە من دێنی دەمەوێ تۆزێك ئاسوودە بم؟". بە مەبەستی ئەوەی کە روونی لەم بارودۆخە رزگار بکەم دەستم بە باس کردنی ژنانی گەڕەك و هاوڕێکانی نێو رێکخراوەکەی خۆمم بۆ دەکرد. لەم کاتە ساتانەدا دەنگی ئەو کەسانەمان دەبیست کە لە مزگەفتدا دەگەڕانەوە، دەنگی دوور و پەرێشان، ئەو دەنگانەی کە پڕ بوون لە نهێنی....

کاتێك کە لە بەغدا، لە تورکیا و قەندیل و لوبناندا شەڕ و پێکدادانەکان بەردەوام دەبوون رۆژەکانی ژنێڤ بە بیرم دەهاتنەوە. رابردوو بێجگە لە نێو ناخی مندا لە هیچ شوێنێکی دیکەدا فەرامۆش نەدەکرایەوە، بۆیە هەبوونی من بەردەوام دەبوو و منیش دەبووم بە خۆم....

کاتێك کە رۆحم تووشی راڕایی بوون دەبوو من وا بیرم دەکردەوە کە هۆکاری ئەمە نەبوونی حزوور و ئاسوودەییە. هاوکات لەگەڵ چاوە پڕ لە فرمێسکەکانی روونی و دەنگە گڕ بوەکەیدا دەکەوتمە نێو خەیاڵەوە. بەیانییە بە بۆنەکانی قەراخی گۆلی ژنێڤ و ئەو کۆترانەی کە لە بەر پەنجەرەی ماڵەکەمان کۆ دەبوونەوە، ئێمەش بە مەبەستی ئەوەی کە باڵندەکان بەر پەنجەرەکە پیس نەکەن شتێکی گچکەمان دانا بوو بەر پەنجەرەکە.... لە نێو ئەو کاتژمێرانەی کۆتایی حەفتەدا بووم کە سەری خۆم هەڵدەگرت و دەگەڕام. دەنگی نێو مێشکم و کەش و هەوایەکی ناسەقامگیر و ئەو بێدەنگییەی ئەورووپا کە مرۆڤی بێزار دەکرد، تەنیایی..... ئەو گیانلەبەرانەی کە لە هەڵگرتنی نهێنییەکان وەرەز ببوون، سەگەکان و ئەو موزانەی کە بۆنی کەفیان لێوە دەهات.....

ناوم لەو وێنانەی نێو بۆیە سادە و شینەکەی ژوورەکەی خۆم دەکرد و سەیری نەخشەی شار و وڵاتەکانم دەکرد و بیرم لەوە دەکردەوە کە پێویستە جل و پێڵاوەکانی روونی لە پشتی دەرگاکەدا بن. خۆشحاڵییەکی کاتی سەرتاپای جەستەی منی دادەگرت و منیش لە گوڕ و بەهێز بوونەوەی هەستەکانم خۆم زۆر خۆشحاڵ دەبووم. لە ناکاوەوە دەنگی روونی دەهات کە دەیگوت" تۆ دیجلە و منیش فورات و شەت ئەلعەرەب".

پائیز لە هەڵەبجە وەکو مرۆڤێکی بەتەمەنە، رەز و باخەکان هەر چەندە وەکو رابردوو شۆخ و شەنگ نەبن، بەڵام رۆحەکان نەیانتوانی بوو کە ئاسوودەییان لێ بزر بکەن. سۆیەکان هەڵدەکران

و دەنگی باران لە سەر بانە خاکییەکانەوە بەرز دەبوویەوە. بۆنی ئەو تریێ ترشانە کە دەکۆلا ئێمەی دەور پێچ دەکرد، ئەو دەنگانەی کە لە نێو بۆن و تامی ئەو هەنجیرانەی کە هەنگوینیان لێوە دەباری بزر دەبوون، لە نێو ئەو چوارچێوە ئامادە کراوەدا، دەبوون بە هۆکاری دیتنی زەینەب و زاڤین.

دوای تێپەڕ بوونی پێنج ساڵ لە دامەزراندنی ڕێکخراوەکە، ڕێکخراوەکەمان بە راستی بە هێز ببوو. بێجگە لە ماڵی پاراستنی ژنان، دەستمان بە دامەزراندنی ئاتۆلیەیەکیش کرد. هەرکەس سەردانی ئێمەی دەکرد، کاتێك کە ژنەکان لە ئەوروپا یا لە تورکیا ئێمەیان بۆ بەشداریکردن لە فەستیڤاڵ و ئاهەنگە جۆراجۆرەکان دەعوەت دەکرد، ئێمەش دواتر بە پێی بەرنامە و ئامادەکارییەکانی خۆمان، دەستمان بە فیستیڤاڵ و مەراسیمی جۆراوجۆر دەکرد و ئەوانیشمان دەعوەت دەکرد. زۆربەی جارانیش لە لایەن ئەو کەسانەوە کە لە بواری سینەما و شانۆدا خاوەن شارەزایی بوون دەستخۆشیمان لێ دەکرا و خەلاتیان دەکردین و ئێمەیش هیچ لەم جۆرە خەلات کردنانە تێر نەدەبووین. کاتێك کە بە مەبەستی ئەوەی کە لە دژی قسەی قائیم مقام دەرنەکەوم ناچار بووم کە منیش باربکەم و بچمە نێو شوقەکاندا دابنیشم. کە چوومە نێو شوقەکانەوە قائیم مقام پیێ وتم" ئیتر پێویستە پاسەوان و شۆفێری تایبەتیت هەبێت".

بەیانیان زۆر بە کەیف خۆشی لە خەو هەڵدەستام بەلام بۆشایەتییەکەی نێو دڵم هەر هاواری بۆ روونی دەکرد. کاتێك کە بەبێ ئەوەی راستی و واقیعیەتەکان روخساری خۆیانیان بگۆڕن لە سەر خۆیانیان دادەنیشتن من بیرم لە رۆژانی رابردوو و روونی دەکردەوە. من لە نێو دەنگی روونیدا ئاستی حەز کردنی روونی لە خۆمم هەڵدەسەنگاند و نەمدەگوت کە من زۆر بیرت لێ دەکەمەوە. کاتێکیش کە روونی دەیگوت" ئیتر چی هەیە و دەنگوباست چۆنە" هەر وەکو ئەوە بوو کە بلێیت دەرگای دڵت دامەخە.

ئەو کاتەی کە روونی وردە وردە لەگەڵ جوانەکاندا تێکەڵ بوو وردە وردە تۆزێك زۆرتر دەمایەوە و بە ناحەزی دەگەڕایەوە بۆ ژنێڤ. جوانەکانی هەڵەبجە زۆر ببوون هۆکاری راکێشانی سەرنجی روونی و روونیش زۆر پیێ ناخۆش بوو کە تا ئێستا نەهاتووە و لێرە لەگەڵ ئەو جوانانەدا نەژیاوە. روونی وتی" کاتێك کە ئێمە باس لە باشی هەندێك کەسان دەکەین لە راستیدا دەسەلات جێبەجێ دەکەین، ئایا ئەو حاکمیەتەی کە ئێمە بە سەرقاڵ بوونی خۆمان بە هۆنەرەوە بە دەستی دەهێنین دەبێتە هۆکاری خاوەنداریەتی کردن لە ئەوانی دیکەیش؟" منیش

دەمگوت" دەزانم تۆیش دەتەوێ لێرە بمێنییەوە، دواتر تۆ بیری ژنێڤ دەکەیەوە" من بەجۆرە تۆزێك گاڵتەم لەگەڵ روونیدا دەکرد.

کاتژمێر ٨ و ٣٠ خولەك بوو، وردە وردە لە نێو ناپۆرای خەڵکدا خۆم گەیاندە نێو هۆڵەکەوە و کاتێك کە چاوم بەو وێنەیە کەوت کە سەرانسەری دیواری هۆڵەکەی داپۆشی بوو سەرم سوڕما، قارەمانە مێژووییەکانی دۆڵی مزوپۆتامیا و لەو شوێنەی کە شاخەکان و هەر دوو رووبار یەکیان دەگرتەوە، دوو چاوی ناسراو دەستیان بە پێکەنین دەکرد. کاتێك کە سەیری پشتەوەم کرد روونیم دیت کە بە دڵێکی پڕ لە خۆشەویستییەوە دەستی خۆی بۆ من دەجووڵاندەوە.

**٣ مایسی ٢٠٠٥ و ٢ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٧:دیاربەکر**

دەلیلا یەکێکە لە هاووڵاتییانی هەڵەبجەی شەهید کە لە کاتی کیمیا باراندا، دایک، باوک وبراکەی لەدەست دەدات و دواترلەگەڵ جەماوەر و خزمەکانیدا روودەکەنە سەر سنوورەکان و لەویش کاتێک کە بە ئاستەنگی و گۆشاری سەربازانی ولاتانی دەراوسێ رووبەروو دەبنەوە، ژنێکی کوردی باکووری کوردستان بە ناوی زەینەب دێت و دەلیلا لەگەڵ خۆیدا دەبات و دەلیلا گەورە دەکات. دەلیلا دوای کۆتایی هاتنی قۆناخی خوێندن لە ئەستەنبووڵەوە بەرەو ئەورووپا کۆچ دەکات و لەویش لەگەڵ کوردێکی دەرسیمی باکووری کوردستان ژیاني هاوسەری پێک دەهێنێت و ماوەیەک لە دوای گیان لە دەستدانی زەینەب، دەگەڕێتەوە بۆ هەڵەبجە و دەست بە خزمەت کردني هاووڵاتییان و نیشتمانەکەی.








وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی گشتی
رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی
MUKIRYANI ESTABLISHMENT
FOR RESEARCH & PUBLICATION
www.mukiryani.com

٢٠١١

چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری